# پێشەکی

لە بەهاری ساڵی 1985دا، ئەو کاتەی لە گەرووی سەوزی بە خوڕە و هاژەی دەربەندەکەی (بەرگەڵو)دا، لە خاکی پێی داگیرکەر نەدیوو لە سێبەری چیای پڕ چریکەی هەڵۆی پێشمەرگەدا ئەژیام، وەك دڵی شیعرو هەستی نادیاری ئەودیو تەمێکی چڕ، خەبەری ئەوەم بداتێ کە ئەمجارەیان ڕێگای چارەنووسی کۆچکردنێکی دوورودرێژم لەبەرە و ئومێدی گەڕانەوە و شادبوونەوەی سەربەرزانە و ڕووسوورانە بە دنیای شارو جارێکی دی بە تێروتەسەلی و بەرفراوانی چاپکردنەوە و بڵاوکردنەوەی بەرهەمەکانم، لە تروسکەی مۆمێ کزترە و هەر تەنها خەونێکی شەوانەی بزرکاوە و ئەم شەوەزەنگەی کوردستان بەژاروژەنگەو ئەخایێنێ، چرپەی لە نە نپدییەوە هاتووی ئەو خەبەرە ئەفسوناوییە وائەهاتە گوێی زرنگاوەی نێو ژووری تەنیاییم. بۆیە گەلێ جار خەیاڵم دوور دوور ئەفڕی و بەدەم پرسی خۆزگەیەکی هەڵقرچاوەوە بە خۆم ئەوت"ئاخۆ کەی ئەو دەرفەتەم بۆ هەڵکەوێ و بتوانم لەهەلومەرجێکی گونجاودا بەسەریەکەوە یان لە چەند بەرگێکدا بەرهەمەکانم چاپ بکەم؟". بەرهەمی پەرشوبڵاو لە خێزانی دابڕاوو دوورکەوتە لەیەك و ئاوارەبوو ئەچن!، بە تایبەت دوای ئەوەی بەشێکی ئەو بەرهەمانە، تێکەڵ وپێکەڵ، لە پەڕەکاغەز و دەفتەری چرچ و لۆچ بووی گرمۆڵە بوودا هەریەکەو لە قوژبنێکدا گیرسابوونەوە، ئەم خۆزگەیە لە شاخەوە سەرچاوەی گرت. هەڵبەت ئەو بزووتنەوە ڕۆشنبیری و ئەدەبییە شێلگیرەی کە هەر لە ساڵانی دوای هەرەسی شۆڕشی ئەیلولەوە، لەو شاخ وداخانەدا و لە کونە ئەشکەوتدا لە دایکبوو بوو، لەنێو چەقەنە بەردا پێڕەوکە بووبوو. بەتایبەت لە دوای هاتنەکایەی (یەکێتی نووسەرانی کوردستان) و تا ئەوکاتەی منیش ڕوومکردەوە چیاو بووم بە شاگردی ئەو یەکێتییەو نزیکەی دووساڵ شەرەفی هاوبەشیکردن و بەشداریم لەو

بزوتنەوەیەدا پێبڕاو تا دواتریش و تا ئەو ڕۆژگارانەی کە گازی ژەهراوی و چەکی کیمیاویی لەو مەڵبەندە ئازادکراوانەدا تەنگی بە ژیان و هەناسەدان هەڵچنی، تا ئەو سەردەمەیش و تا ئیستەیش و بەردەوام. مەشخەڵی هەڵکراوی ئەو بزووتنەوەیە شان بەشانی هەڵمەت و شەڕی چارەنووسی پێشمەرگە گیان لەسەردەستەکان، بەخشندەو بەرفراوان، هەر لەگەشەکردن و تیشکدانەوە و تەنینەوەدایە، چاپخانەکانی نێو ئەو لێرەوار و کەژوهەردانە، خۆیان بۆ خۆیان شۆڕشێکی تری بەرەنگاربوونەوەیان هەڵگیرساندبوو. ڕیزە نامیلکەو کتێبی ئەدەبی، فەرهەنگی، مێژوویی، وەرگێڕدراو، هەر لە شیعرو کورتە چیرۆك و ڕۆمان و بابەتی ڕەخنەوە تا ئەگاتە سەربابەتە جۆربەجۆرەکانی تری کولتور بەگشتی، شایەتی بەڵگە نەویستن بۆ شان و شکۆی پیرۆزی ئەو بزووتنەوەیە. هەر لە گەرمەی جۆش و خرۆشی ئەو بزووتنەوەیەدابوو، کە چەند جارێك ئەو شیعرانەی پەیوەندییان بە ئەدەبی بەرەنگاربوونەوە و سەروەریەکانی جیهانی پێشمەرگایەتیەوە هەیە، چ ئەوانەی لەشار نوسیبومن و بە نهێنیی بڵاوببوونەوە و چ ئەوانەی لە شاخ و لەنزیك سەنگەرەکانەوە لە دایك بووبوون، لەو چاپخانە خۆشەویستانەدا، لە چاپدران ولە ئەشکەوتە نسرمەکاندا سەریان لە هێلکەی وشە جووقاو، لە ڕەوەزەکاندا پێیانگرت و تا دواتر چوونە بەر هەتاوی پێدەشتەکان و سەرئەنجام خۆیانکرد بە هەناو و دڵ و هەگبەی هەزاران پێشمەرگەی گەرمێن و کوێستانی گەلە قارەمانەکەمدا، هەر لە بەهاری ئەو ساڵەیشدابوو، کە لە گۆڤاری(گزنگ)ی یەکێتیی نووسەرانی کوردستان/ لقی کەرکوکدا کە ئەویش یەکێکبوو لەو ئەستێرانەی لەسەر (دابان) چاوی هەڵهێنابوو، لەوێدابوو، ئاگاداریەکم بڵاوکردەوە، کە تیایدا بۆ یەکەم جار نیازی لە چاپدانەوەی بەرهەمەکانم بە خوێنەران ڕاگەیاندبوو، تکایشم لە شیعر دۆستان کردبوو، کە ئەگەر هەندێ لەو شیعرانەی لای خۆم نین- ئاماژەم بۆ کردبوون- و لای ئەوان پارێزراون و بەر لە دیوانی یەکەمم لە چەند ڕۆژنامە و گۆڤارێکی ئەو سەردەمانەدا بڵاوبوونەتەوە، بۆم بنێرن تا بتوانم لە دەرفەتێکدا بێ کەمو کووڕی و بەسەریەکەوە چاپیان بکەمەوە. بەڵام ئیتر ڕۆژ لەدوای ڕۆژ زریانی پێشمەرگایەتی توندوتیژتر ئەبۆوەو، بەرەنگاربوونەوەی

ئەژدەهاك تووشترو، شالاوی دڕندانەی ئاسمان و زەوی بەربلاوترو شێتگیرانەتر ئەبوون. بۆیە هەل و مەرجی هاتنەدی ئەو پرۆژەیە نەرەخساو خەونەکە نەهاتەدی و پەرەکاغەزی هەناسە ساردم خستەوەباوڵ. لە کۆتایی ساڵی 1986دا، بەدەست پێشکەری و پێشنیاری دڵسۆزانەی ڕێبەرانی پێشمەرگە و ویستی خۆیشم ڕێی هاتنە دەرەوەم بەرەو ئەوروپا گرتەبەر، ئیتر لە ژیانی دوور وڵاتیدا تا بوویشمە پەناهێندەی وڵاتی سوید ئەو حەزو خۆزگەی لە چاپدانەوەی بەرهەمانەم بووە خولیایەکی ڕۆژانە و لە وڵاتی تریشەوە داواکاریی بەردەوامی شیعر دۆستانی کوردی ئاوارەی وڵاتەکانی ئەوروپا و هەروەها هەل و مەرجی لەبار بۆ یارمەتی و دەست گیرۆیی لە چاپدانیان لەم وڵاتەدا، گورجتریان کردمەوە بۆ ئەوەی بکەومە کۆکردنەوەو پێداچوونەوە و ڕێکخستن و ئامادەکردنی شیعرەکان تا لە نزیکترین دەرفەتدا بیانخەمە بەردەست. هەڵبەت بەرلەمن ئەوە وتراوە کە هەر شاعیرێ تا بەسەر بژی و وەك ئەڵێن لە بازاڕی مەرگدانەبێ، ناتوانین ناوی سەرجەم و کۆتایی لە چاپکراوەکانی بنێین، بەپێی مەزەنەی بۆچونێکیش پرۆژەی لە چاپدانی ئەم بەرهەمانە کە بە ناونیشانی (دیوانی شێرکۆ بێکەس) چاپ ئەکرێن، تەواوی ئەو شیعرو چیرۆکە شیعرو شانۆنامە چاپکراوو چاپ نەکراوانە ئەگرێتەوە، کە لە دیوانی (تریفەی هەڵبەست)ەوە 1968 تا کۆتایی 1988 و چەند شیعرێکی سەرەتای ساڵی1989 نوسیومن. بەڵام ئەوەی شایانی باسە و پێویستە هەر زۆر سەرنجی خوێنەری بۆ ڕابکێشم و ئاگاداری بکەم، ئەوەیە: کە پاش و پێشکەوتنێ کەوتۆتە زنجیرەی لە چاپدانی ئەم پرۆژەیەوە، کە پێویستی بە ڕوونکردنەوەیەکی خێرا هەیە. واتە بە دەستووری باوو چاوەڕوانکراو ئەبوایە بەشی یەکەمی ئەم دیوانە، لە یەکەمین کۆمەڵە شیعری چاپکراوەوە کە(تریفەی هەڵبەست)ە دەستی پێبکردایە. بەکورتی لە شیعرەکانی قۆناغی یەکەم و سەرەتاوە بەرەو ئێستە بهاتایە، بەڵام لەبەر چەند هۆیەك، کە لەپێش هەموویانەوە، دەست گیرنەبوونی ئەو کۆمەڵە شیعرەبوو-وەك پێشتر باسمکرد- کە لەکاتی خۆیدا نەچونەتە ناو دیوانی یەکەمەوە و هەر چاو لەڕێی گەیشتنیان بووم و نەبوون، ئەویش بۆ ئەوەی ڕەنگ و ڕووی نەخشەیەکی ڕونترو ئاشکراترو تەواوتری سەرەتای دەستپێکردن و زەمینەی

ڕسکانی بەهرەی شیعرم بخەمە پێش چاوی خوێنەران و بەتایبەتی ئەو ڕەخنەگرانەی ئەگەر مەبەستیان بێ لەسەر یەکەمین سەرهەڵدان و پشکوتنی ئەو بەهرەیە بنووسن. بەڵام بەداخەوە هەوڵێکی زۆرم داو چنگم نەکەوتن و تا نووسینی ئەم پێشەکیەش بەهیوای دەستکەوتنیان هەر چاوەڕوانم سا بەشکوو پێم بگەن و بیانخەمە سەر شیعرەکانی (تریفەی هەڵبەست) کە ئەچنە بەرگی دووەمی ئەم دیوانەوە، ئەمە جگەلەوەی لای خۆیشمەوە وام بەباشترزانی کە مادەم ئەو بەرهەمانەی تا ساڵی 1984 لە شارداو بەچاپی ڕێکوپێکتر و لەبەر بلاوترین ناوچەکانی کوردستانی خوارواداو بە ژمارەی زۆرتریش کەوتوونەتە بەردەستی خوێنەران و کەم و زۆریش لەسەریان نوسراوە، هەرچۆنێك بێ ئەوان بەختیان لەو کۆمەڵە شیعرانە چاکترە کە تا ئیستە وەك دیوانی سەربەخۆ چاپنەکراون. یان ئەگەر چەند بەشێکیان لەو شاخ و کێوانە چاپکرابن، لەبەر بارودۆخی دژوار و ئاڵۆزی کوردستان و مەترسیی هەڵگرتن و پاراستنیان ڕەنگە فەوتابن و بەبەراوردیش لەگەڵ دیوانە چاپکراوەکانی پێشووتردا، ئەمان لە سنورێکی تەسکتردا بلاوبوونەتەوە، جا لەبەر ئەو هۆیانە بڕیارمدا کە لە یەکەمین دەرفەتی هەڵکەوتوودا، ئەم شیعرانە چاپ بکەم و لەم سەرە گرتنی ڕیزەدا ئەمان پێشبخەم و بۆ جاری داهاتویش بگەڕێمەوە سەر ئەوانی تر. ئیستەیش بەرلەوەی یەکە یەکە دەستنیشانی ئەو دیوانانە بکەم کە ئەم بەشەیان پێك هێناوە، بە پێویستی ئەزانم سەبارەت بەو شیعرانەی کە لە کاتی خۆیاندا لە ڕۆژنامە و گۆڤارەکانی کوردستاندا بلاوکراونەتەوە ئەوە بڵێم: لەبەر ئەوەی لەکاتی خستنەسەر دەفتەر و نوسینەوەیاندا ناو و ساڵڕۆژی ئەو ڕۆژنامەو گۆڤارانەم تۆمار نەکردبوو، لێرەو لەم دوور وڵاتیەیش دەرفەتی دەسکەوتنیان ستەم بوو، بۆیە نەمتوانیوە وەك پێویست ئاماژە بۆ یەکەمین سەرچاوەی چاپ بوونیان بکەم، بەڵام ئەگەر بۆ جاری دووەم و لەم چاپەدا هەر ئاڵوگۆڕێکی هونەرییان بەسەردا هاتبێت، یان تێبینی و ڕوونکردنەوەیەکی پێویست هاتبێتە پێشێ، ئەوا بە کەمیش بووبن، لە پەراوێزداو لە جێی خۆیاندا خراونەتە پێش چاو. ئەمە جگەلەوەی هەوڵمداوە لەکاتی چاوپێداگێڕانەوە و سەرپەرشتیکردنی تێکڕای بەرهەمەکاندا بە چاپکراوو چاپنەکراوەوە، لەم بەرگەو

لەبەرگەکانی تریشدا، ئەو هەڵانەیش ڕاست بکەمەوە کە لەم لاو لەولا کەوتوونەتە نێو شیعرەکانەوە، جا چ بەهۆی هەڵەی چاپەکانی پێشووترەوە بووبن، یان بەهۆی بەسەرداتێپەڕبوون و غەفڵەتی خۆمەوە، بۆ نموونە وەك تێکچوونی کێشی نێو بەیتە شیعرێ لەناو قەسیدەیەکدا، یان پاش و پێشکەوتنی دوو ووشە کە ڕەنگە مانای ڕستەکەی گۆڕیبێت. ئەگەرچی دڵنیایشم ئەم جۆرە هەڵانە ئەکەونە بەرهەمی هەموو شاعیرێکەوە. باخی شاعیریش بێ خەوش نابێت.

بۆ ڕێبەریکردن و ڕوونکردنەوەو ئاگاداری زیاتری خوێنەریش، بەپێویستمزانی هەر بە هەمان ڕیزی زنجیرەی چاپبوونیان، دەست نیشانی ئەو دیوان و کۆمەڵە شیعرانە بکەم کە لەم بەرگەدا کۆبوونەتەوە:

1ـ دیوانی ڕەنگاڵە: ئەم کۆمەڵە شیعرە بەر لە ئیستە وەك دیوانێکی سەربەخۆ چاپنەکراوە. بەشی زۆری ئەم هۆنراوانە لەکاتی خۆیاندا لە ڕۆژنامەو گۆڤارەکانی وەك: (هاوکاری، بەیان، برایی، نووسەری کورد، پاشکۆی عیراق، کاروان)دا، لە نێوان ساڵانی 1974 – 1984دا بلاوکراونەتەوە. هەڵبەتە کۆمەڵێکیشیان بۆ یەکەم جارە لەم دیوانەدا چاپئەکرێن و بەر لە ئێستە لە هیچ شوێنێکدا بلاونەکراونەتەوە. هەڵبژاردنی ناوی(ڕەنگاڵە)یش – کەخۆی باڵندەیەکی بچووکی ڕەنگاوڕەنگە- هەر لەم هەمە ڕەنگی و ساڵی جیاجیاو ئاوازە هەمە جۆرانەی ناو ئەم دیوانەوە هاتووە و دوای ورد بوونەوەیش وام بە چاکزانی بەپێی لێکچوونی جۆری بابەت و ئاشنایەتی و نزیکی هەر تاقمە شیعرێ لەگەڵ یەکتردا- نەك بەپێی زنجیرەی ساڵڕۆژی نوسینییان- بیانکەم بە چەند بەشێکەوە و هەر بەشەیش ناونیشانی تایبەتی خۆی بۆ دابنێم.

2ـ دیوانی داستانی هەڵۆی سوور: بریتییە لە یەك قەسیدەی درێژو لە شێوەی هێشویەکدا لە چەندین دەنکە بەش پێکهاتووە، بەڵام هەر هەموو دەنکەکان ڕواوو سەوزبووی سەریەك لاسکن، یان وەك پەڕی پانکەیەك چەندین پەڕن و بەڵام یەك تەوەر ئەیانسوڕێنێتەوە. ئەم قەسیدەیە لە شاری سلێمانی و لە مانگی ئەیلولی 1981دا دەستکراوە بە نووسینی و لە تشرینی یەکەمی هەمان ساڵدا تەواوبووە، ئەم قەسیدەیە لەگەڵ قەسیدەی(کۆچ)دا، کە لە هاوینی ساڵی 1975دا لە مەنفاو لە

ناحیـەی بەغـدادی نوسـراوە و دواتـر لـە دیـوانی (دوو سـروودی کێـوی)دا لـە سـاڵی 1980دا چاپکراوە، وەك دووسەری پردێك، یەك یەکتری تەواوئەکەن، ئـەم قەسـیدەیە بـۆ یەکـەم جـار لـە سـاڵی 1984دا و لـەناو شۆڕشـدا، لەلایـەن(یـەکێتیی نووسـەرانی کـورد)ەوە بڵاوکرایـەوە و بـۆ جـاری دووەمـیش لـە سـاڵی1986دا دیـسان هـەر لـەناو شۆڕشدا لـە دیـوانی(هـەڵۆ)دا، وەك زنجیـرەی ژمـارە(41)ی بڵاوکـراوەی هـەمان یـەکێتی چاپکرایەوە. ئەوەی شایانی باسە، هاوڕێی ئەدیب کاك(سـامی شـۆڕش)یـش پێـشەکیەکی دوور و درێژی بۆ ئەم چاپەیان نوسیبوو.

3ـ دیوانی کەشکۆڵی پێشمەرگە: لە ئەسڵدا ئەم دیوانە هەر بە هـەمان ناونیـشان لـە سـێ بـەش پێکهـاتووە، کـە جیـا بـە جیـاو یـەك لـە دوای یـەك لـە سـاڵانی 1985 – 1986دا لە چاپخانەکانی نێو شۆڕشدا چاپکراون، بەشی یەکەمی ئـەم کۆمەڵـە شـیعرە لە نێوان ساڵانی 1980 – 1984دا لە شاردا نوسـراون و بـە نـاوی نـەهێنی و ڕێگـەی نـــەهێنی گەیەندراونەتـــە نێـــو ســـەنگەرەکانی پێـــشمەرگە و لـــەڕادیۆی شۆڕشـــەوە خوێندراونەتـەوە. بـۆ جـاری دووەمـیش هەرسـێ بەشـەکە لـەناو دیـوانی (هـەڵۆ)دا لـە بڵاوکراوەکـــانی یـــەکێتیی نووســـەرانی کوردســـتان، زنجـــیرەی (41)، ســـەر لـــەنوێ چـاپکراونەتەوە. هەڵبـەت خوێنـەری زیـرەکیش ئـەبێ ئـەوە بزانێـت کـە شـیعرەکانی کەشکۆڵی پێشمەرگە بەر لە هەمووکەس بۆ خودی پێشمەرگە و دنیای ئـەوان نوسـراون و لـە تاقیکردنـەوەی ئەوانـەوە سەرچاوەیان گرتـووە. لـە پلـەی یەکەمیـشدا بزوانـدن و چێژ لێ وەرگرتنی ئەوانم لا مەبەست بووە. هـەر لەبـەر ئەمـەیش (هەنـدێ جـار) خـۆم بەدەستی خۆم، لە پێناوی چارەنووسە گەورەکەدا، قوربانیم بە هەندێ لایەنی ستاتیکی جوانکاری داوەو ساکارانە نا بەڵام سادەتر دامڕشتوون. بەلای منـەوە لـەو سـەردەمانەدا، لەم مەیدانەی پێشمەرگەدا، هونەری شیعریش، هەر ئەوەی داوائەکرد.

4ـ دیوانی ئاوێنە بچکۆلەکان: ئەم دیوانە تەرخانکراوە بۆ کورتە شیعرەکان، کـە لـە بنەڕەتـدا درێـژەدان و گەشـەپێکردنی هـەمان تاقیکردنـەوەی پۆسـتەرە شـیعری دیـوانی (کازیوە)ی چاپکراوی ساڵی1978 ن، بـەر لـەم چاپە تـەنها (40) شـیعریان لـە سـاڵی 1986داو لـەناو شۆڕشـدا بـە هـەمان ناونیـشان (ئاوێنـە پـچکۆلەکان) لـە چـاپدراون و

بڵاوبوونەتــەوە. . ئــیتر بــاقی شــیعرەکانی تــر، کــە هەنــدێکیان هــەر لــە کوردســتان نوسراون‌و کۆمــەڵێکی تریــشیان لــە دەرەوەی وڵات، تــا ئیــستە لــە دیــوانێکی ســەربەخۆدا چاپنەکراون، هەڵبژاردەیەکیـشیان لـە گۆڤـارە کوردیـەکانی ئـەوروپادا لـە نێـوان سـاڵانی 1987 – 1988دا بڵاوبوونەتــەوە. زۆربەشــیان بــۆ یەکــەمجارە لــەم دیوانــەدا بەرچاوئەکەون. ئەوەی شـایانی باسـە، هەڵبژاردەیـەك لـەم کورتـە شـیعرانە و هـەر بـەو ناونیـشانە وەرگێڕاونەتـە سـەر زمانـەکانی عـەرەبی و ئیتـاڵی و سـویدی و فەرەنـسی و ئینگلیزی و ئەڵمانی کە هەندێکیان چاپکراون و کەوتونەتە بازاڕەوە و ئەوانی تریشیان لەبەردەم کارتیاکردن و ئامادەکردندان بۆ لە چاپدان.

5. دیوانی شایی شەهید: بریتییە لە کۆمەڵە قەسیدەیەك کە بەر لە ئێستە وەك دیوانێکی سەربەخۆ چاپ و بڵاونەبۆتەوە، چەند شیعرێکیان لە کوردستان و ئەوانی تریشیان لە دەرەوەی وڵات نوسراون. چەند دانەیەکیشیان لە نێو شۆڕش و لە گۆڤارە کوردییەکانی ئەوروپادا بڵاوبوونەتەوە.

6. دیوانی تەم توومان: دوا دیوانی ئەم بەرگەیە و بریتییە لە دوو قەسیدەی درێژ تەم(توومان) و (ژەهر) ئەمەی دواییان دوا قەسیدەی ئەم بەرگەیەو لە بەهاری 1989دا نوسراوە، قەسیدەی(تەم توومان)یش لە کۆتایی ساڵی 1988دا نوسراوە و پێشکەشی هاوڕێم شەهید(ئازاد هەورامی)م کردووە کە لە ساڵانی 1985 – 1986دا و لە ژیانی پێشمەرگایەتیدا لە نزیکەوە یەکترمان ناسی و چەندین یادگاری شیرین و تاڵی شەوو ڕۆژی بەیەکەوەبوونی نێو شۆڕش و ئەو شاخ وداخانە ڕیشاڵی گیان و دڵی بەیەکەوە بەستین و دوای شەهید بوونیشی هەر ئەو خۆشەویستیە بووە هەوێن و گریانی بێ دەنگی ئەم قەسیدەیە.

★ ★ ★

ئیستەیش لە پاشکۆی ئەم پێشەکیەدا ئەمەوێ دەقی تەواوی ئەو وتەیەم بخەمە پێش چاو کە بۆ یەکەمجار لە کۆڕە گەورەکەی ستۆکهۆڵمدا، لە ڕۆژی 1987/8/8دا، لە هۆڵی (فولکێت هویس)، لەبەردەم سەدان کوردی ئاوارە و دووروڵاتدا و دواتریش لە زۆربەی ئێوارە کۆڕەکانی وڵاتەکانی دیکەی ئەوروپادا خوێندمەوە. بەڵام پێویستە

ئاماژەیش بۆ ئەوە بکەم، کە لە مشت و ماڵو بژارکردن و دوا چاوپێداگێڕانەوە و دارِشتنەوەدا، قەڵەمی لێ زیادکردن و بڕینی هونەریم تێخستۆتەوە. بەڵام بەگشتی هەیکەلی وتەکەو هێڵی مەبەستەکان و زەمینەی کات و شوێن و ڕووداو و بیرو بۆچوونەکانی ئەو وەختەم وەك خۆیان هێشتۆتەوە.

دیارە هۆی هەڵبژاردن و چاپکردنی ئەم وتەیەش لێرەدا جگەلەوەی پەیوەندییەکی توندوتۆڵی بە بەشێکی زۆری شیعرەکانی ئەم دیوانەوە هەیە (بەتایبەتی ئەو بەرهەمانەی بۆ پێشمەرگە و شەهیدانی پێشمەرگە و نەبەردە خوێناویەکان وتراون) لە هەمان کاتیشدا لە زۆر برِگەی ئەم پەخشانە وتارەدا باری سەرنجی ئەدەبی و فیکری خۆم بە کورتی دەربرِیوە. جا ئەگەرچی ئەم وتەیە بەر لە کارەساتە گەورە و مەرگ چێنەکانی ساڵی 1988 و دواتر نوسراوە، بەڵام هەر کوردستانی لەت و پەتکراو ڕوانگەی قەڵەمەکەی بووە. لە لایەکی تریشەوە، ئەم نووسینە یەکەمین یادگاری وتارێکە کە دوای ئاوارەبوون و دوور وڵاتیم لە دایکبووە و حەزئەکەم لە گەورەترین ئەلبومی دیوانی خۆمدا بیپارێزم و لەتەك شیعرەکانمدا بۆ نەوەی کوردی دوارِۆژی جێبێڵم. لەلایەکی تریشەوە لەبەرئەوەی وتەکە لە ئەسڵدا بۆ(خوێندنەوە و گوێگرتن) نوسراوە، دواتریش هەروام لاپەسەندبوو ڕووی دەم و دووکردنە خەڵکی لە وتارەکەدا چۆن بووە بەوجۆرە دایرِێژمەوە.

★ ★ ★

خوشك و برا ئازیزەکانم!

هاورِێیانی خۆشەویست!

لە کوردستانی شۆرِش و هەڵۆ سوورەکاندا، لە شەوی خاکێکی هەمیشە ژان گرتوو بە برووسکەو ڕەهێڵەوە، لە گلۆربوونەوەی کەستەکە بەفری تەمەنی ڕوو لە لێژایی و داچوونی خۆمدا، بۆ جاری سێهەم، سێهەم شەقژن و هەڵفرِین، منی عاشقی وەك (مەم و وەلی) سەوداسەر و ڕۆح گلاراو، هۆش و گۆش ئاوێزان بووی، لە دەورگەرِاوی، بەژن و باڵا سەوزی ئەو خاکە دەزگیرانە شیرینە، وەك قەڵەمێکی دیکەی وشە لە کردار موتوربە کردووی (یەکێتیی نووسەرانی کوردستان)، ڕووی هەڵوێستم کردەوە شاخی

قیبلە و پشت و پەنا، لای ئەو بازە بەلەش ڕووتەڵە و بەگیان تێروتەسەلانەی، کە لەدوای کەسیرەبوونی هەر چوارپەلی ئەسپەکەی ئەیلول و هەرەسی هیوا بەژێرەوە کردووی مانگە شوومەکەی (مارت)ەوە، تائەمڕۆ، لەبەر مەتەڕێزی هەرەپێشەوەی ڕووبەڕووبوونەوە و چنگ نانە چنگی مەرگدا، لەسەر دەمە خەنجەری لوتکەوە بانگی ئازادی ئەدەن و بە دەستی دەمار دەرپەڕیوی باوەڕ، کوورەی ئاگری ڕاپەڕین و زەمین جۆشدانێ ئەدەمێنن، کە خوێن سووتەمەنی و گیانی ئالۆ والآ دەستە بەرێتی. ئەو کوڕانەی کێوی سەرکەشن و جڵەونەکراون. ئەو ئەفسانە ڕاستیانەی لەبەر ڕقی ئەستوور و دڕکاویی پەلامار و شالآوی بەکەڵبە جیڕی داگیرکەردا وەك ماهی و ڕەوەزی هەزار بە هەزار عاسین و لە گەردەلوولی هەڵمەتیاندا مەحاڵیش یخ ئەدەن! ئەو کون لە جەرگدا نەبووانەی کە دەستە لە دوای دەستە لە مرندا ژین و لە هەڵوەریندا گەشانەوە و لە سووتان و هەڵقرچانیاندا شەفەقی بەربەیان بۆ ئاینـدە ئەهێنن. ئەو چراوگانەی لە تاریکستانی چاو چاو نەبینی دوای هەرەسەوە، لە کۆت و پێوەندی شەختە و پشکۆی لە دەست و قاچ ئالآوی زیندانەوە، لەبەر ئەڵقەی شۆڕەوەبووی پەتی سێدارەو ژێر بوردومانی دۆزەخ ئاساوە، لە دنیای بەژەنگ و ژاری دەم داپچڕیوی برسێتی و تینوێتییەوە، چاویان هەڵهێناوە و کەوتوونە ڕێ و ئەوەتا ئێستەیش هەر چیاو دوندی کەڵ ملن و هەر حەسارۆست و شاهۆ ئارارات و پیرەمەگرونن، ئەوەتا ئەگەرچی دنیای چاوچنۆك و کەڕولاڵ و بۆنی دەم نەوتاویی، جیهانی بە گفتار پێغەمبەر و بەکردار سۆزانی، لە ئاستی داستانی قارەمانانەی ئەفسانە ئاسای پێشمەرگە و چرە دووکەڵ و بۆکرۆزی ئەم کوردە تەنیایەدا، چاو بنوقێنێ و بە مسی بەرژەوەندی گوێچکە تەپەکانی خۆی بئاخنێ، لەگەڵ ئەوەیشدا، ئەوەتا ئەو بروسکەو زریانانە، مێژوو ئەخولقێنن، لە هەناوی خوێن وڕەنج و ئارەقەی زەنگۆڵ زەنگۆڵی ڕێگایانەوە، گوڵ ئەستێرە دائەبارێ ئەوەتا لەگەڵ قرکەرترین چەکی نەهەنگی ڕژێمێکی تا بینە قاقا لە خوێن هەڵکێشراوی کورددا خۆڕن و ئەجەنگن، بە کڵپەی جەستەو بڵێسەی خۆیان تاریکیی ڕائەماڵن، نرکەیشیان هەر زوڵاڵ و زەنگی دەستە و پەلیشیان پڕ بە گوێی هەمووو کوردستان ئەزرنگێتەوە. من لە کوردستانی ئەو پێشمەرگانەوە هاتووم و پریاسکەی

چوار وەرزی شیعریشم بەرلەوەی لە: شام و فلۆرەنسە و ڤینیسیا و تۆرینۆ و ستۆکهۆڵم کردبێتەوە، پێشتر، لە مەرگەو سیروان و سەرگەڵو و بەرگەڵو و گاپیلۆن و یاخسەمەر و دۆڵی جافەتی دا کردۆتەوە، نۆبەرەی بەشی زۆری ئەم میوەی شیعرانەیشم بەر لە ئێوە ئەو پێشمەرگانە کردوویانە، دەم شیرینکردن و ئافەرین و ئۆخەی گیان و زەردەخەنەی چاوی ئەوانیشم لە هەموو خەڵاتێکی تری ناو ئەم دنیایە لەلا بە نرختر و پیرۆزتر و گەورەترە!. من لەو مەڵبەندانەوە هاتووم کە لە کوردستانی خواروودا، لە ڕێڕەوی بەهەڵمەت و ئازاری درێژی شۆڕشی نوێدا، لە نێو هەموو تێکۆشەراندا، لە نێو هەموو شۆڕشگێڕاندا، لەنێو هەموو کەڵەمێرداندا، ڕووباری خوێنیان لە هەمووان بە خوڕتر و بەردەوام ترو ژمارەی کەڵەمێردی سەر بڕاویشیان لە هەمووان زۆرتر و پەتی سێدارە و قەنارەیشیان لە هەمووان درێژتر بووە! لەوێوە هاتووم.. باوەشێك لەو شیعرانەم بۆ هێناون کە بۆن و بەرامەی خاکی موقەدەس و گوڵی کێوی و ئارەقەی بەرگی خاکییان لێ دێ. بە دەمارە دەرپەڕیوەکانی پشتی دەست و قاچیاندا خوێنی شەهیدان ئەگەڕێ. لە باڵا ئاوێنەی: وێنەو، ڕستەو، زەماوەندی وشەکانیاندا، چاوی خەماوی و ملی بەلارەوە گرتووی منداڵانی پەرەوازە و، بەژنی درەختی بە پێوە هەڵپروکاو و، گوڵاڵە سوورەی سیس بووی گۆنەی کچی دەزگیران کوژراو و، لەنجەی کۆتری سپی بە دووکەڵ ڕەش بوویان تیا ئەبینرێ. ئەو شیعرانەی لە کۆچی گەرمێن و کوێستانی بەرەو ژوور و بەرەو خواردا هەناسەی پێدەشتەکانی گەرمێنیان بە هەناسەی ساردی کوێستان و زەنویرەکان موتوربە کردووە، ئەو شیعرانەی کە لە هەگبە و کۆڵەپشتی پێشمەرگە لاواز و ڕەقەڵە لە ئاسك چووەکانی تیپەکاندا، هەر بە تەنیشت ڕیزە فیشەکەوە هەڵگیراون و ئەم سەرو ئەوسەری نەبەردە دوور و نزیکەکانیان کردووە و گەلێ جاریش هەر لە پاڵ ئەواندا زامدار و شەهیدبوون و پێکەوە خوێنیان چۆڕاوەتەوە بن دەوەن و بنچك و سەر تاشە بەرد و جۆگەلە ئاوەکان. ئەو گۆرانیانەی لە چریکەی دەنگ هەڵبڕینیاندا سنوورە مێردەزمەکان ئەبەزێنن و لەیەککاتدا وەك تریفەی مانگە شەوێکی هاوینی دەم بەشنە، زیو پرژێنی قژی دیاربەکر و باڵای سابلاخ و چاوی هەولێر بەیەکەوە ئەکەن. لەیەککاتدا پەنجەرەی هەتاوی ناودڵی یەڵماس گۆناو نەجۆو ئاوارە و

سـولتانی و لـەیلا قاسـم و شـەهاب ئەخەنـە سەرپـشت. هـەر لەیـەك ساتیـشدا، لەیـەك چاوتروكانیشدا، پۆلە چۆلەكەكانیان دەنـووك لـە زرێبـار و سـیروان و وان وەرئـەدەن و بەیـەك دەنگیش بۆ عەشقی شـیعری خـانی و نـالی و وەفـایی ئـەخوێنن و لەیـەك كاتیـشدا سەرچۆپی شایی یەككگرتن و تەبایی و ئاشت بوونەوەی گەرمی كوردستانیی لە ئەتروش و مێرگەسوور و زاخۆ و بامەڕنێ یوسفی و دۆڵی جافەتی دائەگرن!.

ئەم چارەنووسی خۆشەویستییە پیرۆز و مەزنە وەك هەڵگورد و ئاگری داغ و شاهۆن، نە گازی ژەهراوی هەڵگورد ئەخنكێنێ و نە زیندانی ئەویشیان ئاگریداغی پێ ڕاپێچئەكرێ و نە پەتی سێدارەكانی ئەولایش ئەگاتە ملی شاهۆ!.

## هاوڕێیانی خۆشەویست:

ئالەم ڕۆژگارە ئەموستە چاوو، ژیانە بە هەڵەت و دژوارەی ئێمەدا، شیعر ئەبێ چۆنبێ؟ ئەم هونەرە ناسك و گرانە، ناسك وەك باڵی پەپوولە و گران وەك داگیركردنی دڵی شۆڕشگێڕ!، هونەرێكی وا.. چۆن ئەتوانێ لە نێوان شەڕی چارەنووسی خۆر و شەوەزەنگدا، لە نێوان هەستی تایبەتی شاعیر و دارستانی هەست و ئاوات و خۆزگەی خەڵكدا، لە نێوان فەننی وردەكاری، وردەكارییەك بەوێنەی كاری هەنگ و كرمی ئاوریشم و لەم لای ترەوە سروشت و پێداویستیەكانی ڕۆژانەدا، تەوەر و چەقی ڕاستەقینە بدۆزێتەوە؟! شیعر نە قسەو هەڵبەستنی ساكارە و نە دروشمی زەقی بانگەشەو و هاواروجاڕ. نە گرێ كوێرە و نە مەتەڵی هەزار پێی بە پێچ و پەنای وشەگرفت. شیعری ڕاستەقینە وەك ڕاستیی ئاسانەو هەر وەك ڕاستیش گرانە. كوتومت لە خۆشەویستی ئەچێ كە نەچووە قولایی ناخەوە، وەك گوڵ گوارە گوێچكە دەروونی نەسمی، كە لە ژێ و تەلی هەست و نەستی گوێ گرو خوێنەری نەداو نەیبزواندن و گەلاكانی درەختی دڵی نەلەرانەوە، زەردەخەنە، یان، فرمێسكیان نەزاندە كالانەی چاو.. كە دڵدار و دڵخوازی پەیدانەكرد نابن بە شیعر با بە زاخاوی زێڕیش بنوسرێتەوە و یان با سەدان خێڵی ڕەخنەگریشیان لە پشتەوە بێت!.

زەردەخەنەی جوانی منداڵ و ئازایەتی پێشمەرگە.

بریسك و هووڕی نیگای دڵدارو پەڵكە زێڕینە.

بۆن و هاڵاوی نانی گەرم و گەورەیی شەهید.

چۆن بەبێ هیچ ڕاسپاردە و ڤیزەو تکایەك خۆیان ئەکەن بە ناخداو دەزوولەی تەزوو بە جەستەدا دێنن و لەسەرسامی خۆیان هەڵمان ئەکێشن، شیعری ڕاستەقینە و ڕەسەنیش، شیعری پاك و جوانیش، کۆن بن یان تازە، هەروان. لەم لای تریشەوە، ئەو شیعرەی، ئەو هونەرەی لە دڵی گەلەکەی خۆیدا نەژی هەرگیز لە دڵی هیچ گەلێکی دیکەدا ناژی.

## هاوڕێیانی خۆشەویست:

وەکوو گوڵە بەڕۆژەو خۆر، وەك هەنگ و گوڵان، دوێنێ و ئەمڕۆیش خۆشەویستیی‌و چاوی پێشمەرگەی وڵاتەکەم لەکوێ بووبێ شیعری منیش خۆی بۆ ئەوێ کوتاوە وەك چۆن ناتوانم لەدەست و پەنجە و سیما و دەنگ و ڕەنگم لە وێنە هەمەڕەنگەکانی نێو ئەلبومی منداڵی و ڕابوردووی خۆم پەشیمان بم و گازەرەیان لێ بکێشم و نکوڵییان لێ بکەم هەروایش لە هیچ شیعر و گۆرانی و هەڵوێستێکی خۆم پەشیمان نیم، ئەوانە منن، بە نشێوو هەڵدێر و بەرزایی و نوچدان و سەرکەوتن و هەڵەو لاوازی و بەهێزی و گەوجێتی و ژیریمەوە، بە بەرهەمی کاڵوکرچ و گەییومەوە، وەك وتویانە شاخیش بێ دەراڵ و کەندەڵان و شیو نییە، بەڵام هەر لە سەرەتای ڕێگاو، با هەنگاوەکانم تێکەڵ و پێکەڵیشبووبن، هەرچی گۆرانییەکم وتبێ، گەروو هەر گەرووی خۆمبووە، یەزدانی خواست و داواکاریی هەر لە ناخی خۆمدابووە، یەکەمین سەرچاوەی هەڵقوڵینی هەموو شیعرێکم بەئاوی تاڵ و شیرینەوە لە قەناعەتی هونەرمەندانەی خۆم و ئینجا ڕەنگدانەوەی خواست و حەز و ئاوات  و خۆزگەی گەلەکەمەوە لرفەی کردوە. من وەك شاعیرێ ئەو خۆشەویستییەی گیانم کەمەند کێشئەکات. هزرو هەست و نەستم ئەسوتێنێ و ئاگری عەشقی تێبەرئەدات، لاوك و حەیرانی دڵدارانەی خۆمی بۆ ئەڵێم هەزار ڕەقیبیش بەسەرمەوە وەستابێ! جا بۆ گوڵێك بێ، یان کچێ، یان ڕووبارێ، یان کۆمەڵێ.. گرنگ ئەوەیە خۆم سەرپشکی هەڵبژاردن بم و سەربەستانەش لە شەقەی باڵبدەم و دڵدارە شەیداکەم و پەروانە گڕتێبەربووەکەو هەروایشبووم! شاعیری ڕاستەقینە و دانەتاشراو، نە بە تکاو نە بە زۆر دروست ناکرێ. شاعیری وەزیفە و داتاشراو شیعرەکانی بە مردوویی لە دایکئەبن. من دوێنێ و ئەمڕۆیش بەر لەوەی ئەم کۆمەڵ یان ئەو ڕێکخراو، ڕەنگی زەمینەی

حیزبایەتییان ڕشتبێ. من خاوەنی باخی شیعری خۆم بووم. تەنانەت ئەوبراو هاوڕێ خۆشەویستانەی کە من بڕوام پێیانەو بە دۆستی نزیك و هاوبیری خۆمیان ئەزانم، ئەوان بەر لە کەسانی تر، بڕوایان وابووە، کە ئاسۆیەکی فراوان جێگەی خوێندنی کەوی شیعری منە نەك هیچ قەفەزێ!. بەڵێ من هەموو کوردستان و ئینجا هەموو جیهانیش بە شوێن گەشت و ئاسمانی فڕینی شیعری خۆم و دەنگی خۆم و هەستی بێ سنووری خۆم ئەزانم. خۆ خۆشەویستیی لە پێشی سلێمانی کە خۆم ڕسکاوی ئەویم، بۆ هەرگیز لە ئەوین و خۆشەویستیی مەهاباد یان دیاربەکر کەل ئەکات و کەم ئەکاتەوە؟! بێگومان ئەڵێم (نەء) و جا ئەگەر ئێوەش ئەو خەڵاتە هەرە مەزنەم پێڕەوابیبینن، ئەوا من خۆم بە شاعیری هەموو گەلی کورد، بە شاعیری شۆڕش و پێشمەرگە و گوڵ و منداڵی کرمانجی خوارو کرمانجی سەرو، بە شاعیری کوردستانی دایك ئەزانم!. ئەمڕۆ و دوێنێش، لایەنگیری و دۆستایەتیم لەگەڵ هەر حیزبێکی ڕزگاریخوازو شۆڕشگێڕی کوردستاندا، هۆگربوون و ئاشنایەتی زیاتری (بەشێك) لەو شیعرانەی کە سەرچاوەیان لە قەناعەتی سیاسی و ئەزموونی ژیانی پێشمەرگایەتی خۆمەوە گرتووە و هەندێجار داشکانەوەی باڵی فڕینیان بە لایەکدا لەبەرچاوتربێ، ئەمە هەرگیز مانای پاساودانەوەی هەڵەو هەندێ هەڵوێستیی بەلای منەوە نا دروستی سیاسی ئەوان ناگەیێنێ، تەنانەت بیروبۆچوونی دوو پێشمەرگەی یەك ڕێگەش کوتومت و لە هەموو سەرێکەوە یەکانگیرو جووت و کۆك نین، ئا لەم ڕوانگەیەشەوە، وەك لۆرکای شاعیری شەهیدی ئیسپانیایش وتەنی"ئەوانەی ئەیانەوێ زیانم پێبگەیەنن و ئازارم بدەن، وەختێ خۆیان بەفیڕۆئەدەن، چونکە من هەر یەکسەر چزەو کسپەی ئەو ئازارانەم بیرئەچێتەوەو بە پێکەنینەوە بەرەو ڕوویان ئەچم".

### هاوڕێیانی خۆشەویست:

ئێمەی کوردی ئاوارە و پەرەوازەی دوورە وڵات، ئا لەم وەرچەرخانە مێژووییە ناسکەی ئەمڕۆدا، لەم سەردەمە تووشەدا، لێرەیش و لە هەموو کونجێکی دەربەدەریی نێو ئەم جیهانە ئاڵۆزەدا، چارەنووسی ژیان و بزوتن و دوا ڕۆژی خۆمان و دڵنیایی و زەردەخەنەی منداڵ و نەوەکانمان بە بزووتنەوەی ئازادی خوازانە و شۆڕشی ڕزگاری و سەربەخۆیی ئەو جوامێرانەوە بەستراوە کە ئیستە و ئا لەم ساتەدا بە کۆمەڵ ئەبنە

سوتماکی نەورۆزی ئازادی ناو سەنگەرە سەرتاسەرەکانی هەموو کوردستان. دە با ئێمەیش بە گفتار و کردار، بە دەنگ و قەڵەم داکۆکییان بکەین و بچین بە پیر کاروانی خۆری ئەوان و بانگی هەقی ئەوانەوە، ئەی ئێمە کوڕ و براو هاوڕێ و کچ و خوشکی ئەوان نین و هەر هەموویشمان لە داوێنی پاکی کوردستان نەکەوتووینەتە خوارەوە؟!

### هاوڕێیانی خۆشەویست:

ئەو دەسکە گوڵە شیعرانەی لەم ئێوارە کۆڕەدا ئەیانخەمە ناو گوڵدانی بەردەمتانەوە، گوڵی ڕەنگاو ڕەنگ و هەڵبژاردەی باخەکانی چەندین ساڵی شەونخونی و گینگڵ و ڕەنج و هیواو سەرکەوتن و ژێرکەوتن و گریان و بزەی ڕابوردومن. لە هەر باخەو چەپکێ. لە شارەوە بۆ شاخ و لە شاخەوە بۆ ئێرە و تا دوا گوڵە شیعرێ کە لە ستۆکهۆڵمدا خونچەی کردبێ و گەشابێتەوە. لە شیعری وەك سیروان هەناسە درێژەوە تا ئەگاتە شیعری وەك گردۆڵکەکانی کەرکوکم کورتە بالاّ. لە گۆرانیی دەم و چاو خۆڵایی و پێ پەتی منداڵییەوە، بۆ سرودی ڕاپەڕین و دەنگی گڕی گەورەبوون، لە چاوی ڕەشی کچە کوردێکی دڵخوازی شوانکارەوە، بۆ دنیای ئازادی و شۆڕش و شۆڕشگێڕانی هەر هەموو دنیا. لە چوخمە تاریك و نوتەکەکانی دوای هەرەسەوە، بۆ لای تروسکەو شەوقی چاوی ئەو مۆمانەی لەسەر تاشەبەرد و نێو ئەشکەوتە نسرم و شێدارەکانی (قەندیل)ی سپی پۆشدا داگیرسانەوە. لە ئاوی تینووەوە بۆ شایی شەهید، لە سۆز و ئەوینی دڵداریی و سروشتی ڕەنگین و تەڕوپاراوی وڵاتەکەمانەوە، بۆ کاولاشی بە سوتماك کراوی دێهاتو کسپەی ڕاگوێزان و دەربەدەری و ئاوارەبوون و هەوای ژەهراویی...

**ستۆکهۆڵم** 1989/8/12

من بۆیە ئەنووسم ، چونکە نووسین، بەداخەوە !، تەنها سەنەدی تێکۆشانمە. کریت و تورکیا ، خێرو شەڕ، ڕوناکیی و تاریکیی، هەمیشە و بەردەوام لەقولآیی ناخمدا لەململانیٚ و زۆرانبازیدان. مەبەستیشم لەنووسین، ئەو مەبەستەی لەسەرەتادا درکم پیٚ نەکردبوو،لەدواییدا تێی گەیشتم ، ئەوەیە : چۆن بتوانم یارمەتی کریت بدەم، یارمەتی خێرو ڕوناکیی تا لەم جەنگەیدا سەرکەوێت. لە نووسینیشدا ئامانجی من ئەوە نییە بەجوانیی بگەم بەڵکوو بەسەرفرازیی.

رۆمان نووس و شاعیری گەورەی یۆنان نیکۆس کازانتزاکیس
لەکتێبی "ڕێگای گریکۆ" و بەرگی(( 1 )) و(( 2 )) ی بیرەوەریەکانی

## گۆرانییەکی ڕەنگاو ڕەنگ

منالێنە !

شەوێك گوێم لێبوو بەچرپە ،

بەفر

بەتریفەی ئەوت :

گیانە چرای

چاوەکانت

زیاتر هەڵکە !

گەر تۆ نەبی

هەور ئەمهێنێتە گریان

هەور دەرکە

کراسی پوولەکەی کلووی من لەبەرکە

با ئەستێرەی نیگاکانی "خاتووزین" ی

بەر پەنجەرە

لێم زیز نەبێ

خەوی ڕەنگاو ڕەنگ لەباخی

خەیاڵەکەی "کاکە مەم" دا

بەهەناسەی
هەڵوەرینی
پایز نەبێ !
⋆ ⋆ ⋆
مناڵینە !
بەیانییەك بینیم گوڵێ
قژی لەبەر
ئاوێنەی وردە شەپۆلی
جۆگەیەكدا دائەهێنێ
گوێم گرت ئەڵێ :
ئاوی ژینم !
گۆنەم ئاڵ كە
گەردنم پڕ
خەت و خاڵ كە
گەلاَی پرچم بهۆنەوە
ئەزانی بۆ ؟
تا پەڕەم شەوق باتەوە.
با پەپولەی یار نەتۆرێ و
بەناكامی بڕواتەوە !
گەرتۆ نەبی
دڕك زۆرم بۆ ئەهێنێ
بەپەنجەی ڕق

ئەموەرێنێ !

* * *

منالێنە !

نیوەڕۆیەك سەرنجم دا

واكێڵگەیەك

بەدەنگی بەرز "تۆو" بانگ ئەكا

ئەڵێ وەرە و لەناو دڵی

شەقار شەقارما سەوز بە

ئەڵێ وەرەو لە برینما سەردەربێنە

بەلاّم هەر بەمەرجێ دوایی

لەباوەشتا

كامەرانیم

بۆ بهێنە !

* * *

منالێنە ! ئێوارە بوو ،

بەفرو تریفە پێكەوە

گەیشتنە لام

ئێوارە بوو

گوڵ وشەپۆل و پەپوولە

تۆو و كێڵگە

هاتنە قسە

وتیان ئێمە وا دووبەدوو

کەوتینە ڕوو
تۆ ئەڵێی چی ؟!
وتم : بۆ ئەوەی کە بەفر
جوانتر بێ لەوەی کە هەیە
تریفە زۆر دڵگیرتربێ
پەپولە زۆر ئێسك سووكتر
تۆوی كێڵگە
زیاد بەپیت تر
بۆ ئەوەی من
یەکە
یەکە
زیاتر.. زیاتر
زۆرتر.. زۆرتر
خۆشم بوێن و لە ژووری شیعرەکانما
بتانکەم بەمیوانی خۆم
بتاندەم لەبەرۆکی وشەی نازداری
ژیانی خۆم
بەئێجگاری
پەسەندتان کەم
هەر کاتێ بێ
منداڵانی ئەم دنیایە و
منداڵانی وڵاتەکەم

هەرگیز چاویان

لە شەقەی باڵی کۆترەکەی

ئاشتی نەبڕێ ،

سەربەست بن و

پێکەنینیان درەختێ بێ

هێشوی چاوی بێ گریان و

میوەی ڕەزی خۆزگە بگرێ.

مناڵینە !

نەکەن بڕۆن !

لەگەڵما بن

هەرکاتێ ئێوە دێن بۆلام

منیش شیعری

ڕەنگاو ڕەنگی

وەکوو خەوی

ئێوەم بۆ دێ !.

بەغدادی : 1976ـ 1977

# کاڵێ

لەبیرمە زۆر جار کە بەفر
وەك میوانی درەنگ وەخت
ئەهات و سووك
ئەیدا لەشووشەی
پەنجەرەی شیعرەکانم
بانگی ئەکرد :
"بیکەرەوە !
لەدوور ڕا هاتووم ودیاریم
بەرچنە وشەی نەوازەی
ڕەزێکن قەت
دەنووکی کەو لێی نەداون ! "
لەبیرمە کە بەرچنەکەم وەرئەگرت و
ئەمخستە سەر ڕەفەی چاوم
ئەویش ئەی وت :
"ئەمێنمەوە لەبەردەمتا ڕائەوەستم
هەتا نیگام ئەخەمە ناونیگاتەوە"

ـ ئەی کاڵێ گیان!

هەرگیز لەبەفری میوانی

درەنگ وەختی نازداری تۆ

من تێر نابم!

ئەی کاڵێ گیان!

وەرەو لەگەڵ

دەستی خۆتا بەفر بێنە

من حەز ئەکەم گەر تواشمەوە

لەگەڵ بەفرا بتوێمەوە

ئەی کاڵێ گیان!

بەغدادی –1975

# شەقام

بیرم ناچێ ئەو شەقامەی

ئێوارەیەك بانگی کردین

داوای پیاسەی چەند سەعاتێکی لێ کردین

بیرم ناچێ.

لەو سەرەوە

کەتەنیا خۆم گەڕامەوە

سەرنجم دا :شەقام بوو بوو بەهەردووکمان.

لەشوێن چرپەت

چرۆ سەری دەرئەهێنا.

لەشوێن تاسەم

شەوقی گڵۆپ

ڕێژنەی قژی بارانێکی

زۆر لەسەرخۆ دائەهێنا.

لەوجێ یەدا

کەپێکەنیت

زنەی ئاوازێکی ڕووناك

**هەڵ ئەقولاً!**

**لەو جێ یەشدا**

**دەستم گرتی**

**بینیم لاولاوێ بە  بالأی فوارەیەکدا**

**هەڵ ئەزنا!**

**لەو جێ یەشدا**

**لەو جێ یەشدا**

**ماچم کردی**

**بینیم هەرچی دەم ولێوی**

**دڵدارانە بوونەتە هەنگ**

**بۆمژینی ئەو "شانە" یەی**

**کەماچەکەی من وتۆی کرد**

**بە هەنگوینی ئەم جیهانە!**

**بیرم ناچێ ئەو شەقامەی**

**ئێوارەیەك بانگی کردین**

**داوای پیاسەی**

**چەند سەعاتێکی لێ کردین**

**بیرم ناچێ**

**چۆن بیرم چێ؟!**

بەغدادی –1975

# بروسکەیەك

بۆ ئیسپانیا –مەدرید–
شەقامی بیکاسۆ
گارسیا لۆرکا

نیشتمانم کەشیعرەکانتی خستە ناو
کازیوەی چاو* دڵی ئیسپانیای بینی
وەك یاقوتێکی بەر هەتاو *
لەپەنجەتا ئەجریوێنیٚ *
لەجریوەش چەپکە بزە ئەچنێت و بەسەر لێوی
منداڵانی ناو دنیادا ئەیبارێنی* هاوڕێم لۆرکا !
کوردستانم لەپەڵە خوێنی "ڤیزاردا * سواڵەی
ناو خوێنی زێڕینی کرد بەدیاری وخستیە باوەش
ژانەکانم  هاوڕێم لۆرکا!* لەم ساتەدا کوردستانم
لەجیاتی  ماچی دیدەنی و
سەردانی خۆی * شیعری
منت پێشکەش ئەکا.

کوردستان
سلێمانی شەقامی کەنەفانی
هاوڕێت : گۆران

# لەیەکەم سەفەردا

ـ 1ـ

وەختێ خۆم و جانتای سەوزی

مارکەی سەر پشتێن "موسلاّوی "

لەئەستەموولّ

کەدابەزین و ڕاوەستاین

لەدرەخت وبنچکێکی لا ڕێ ئەچووین

هەردووکمان هەر :

قژ خۆلاّویی

شان ومل تەپ و تۆزاوی.

★ ★ ★

وادوو ڕۆژە

لەلای ئەم شارە چاوشینە

لامان داوە

کەهەر ئەڵێی

شۆڕەژنێکە کراس سەوز

ڕاکشاوە.
بالیفی ژێر سەری کەژە و
قاچی سپیش لەبسفۆڕدا
وەك مەڕمەڕی بەرهەتاوە.
ئەم شارە برۆی پەیوەستی
سەرچاوانی شین و ڕەشی
هەر دوو شۆخی
ئەوروپایە وئاسیایە
کەئەیبینی و تێ ئەپەڕێ :
جارێك قۆڵ ڕووت وکراس کورت
جارێکی دی کراسێکی ئاودامانی
لەبەردایە.

⋆ ⋆ ⋆

وادوو ڕۆژە چاوی نامۆم
هەر وەکوو دوو کۆترە شینکە
هەتا ئێستا باڵ بەسترابن.
گرێی باڵیانم کردەوە و
ئەوەتا وا دەمێ بۆ سەر
گومەزی شین وخلیسکی
بریقەدار هەڵ ئەفڕن و
دەمێکی تر قژو بسکی
"منەوەر"ی ئەستەمولی

ئەکەن بەهێلانەی شیعر و
ئارامێکی تێدا ئەگرن.

★ ★ ★

کەبەلای دیواری کۆنی مەڕمەڕینی
مزگەوتێکی کلاّو قووچدا گوزەر ئەکەم
بۆنی کەواو سەڵتەو ، بۆنی
پشتێنەکە وکلاّوەکەی نالی ئەکەم.
کەدەس ئەدەم
لەمۆردی پەرژینی باخێ
دەسم بۆنی ڕیشی ئەگرێ.
کەشەپۆلی سەرهەلگرتوو ،
پەڕەی گوڵی هەڵپچوورکاو ،
دووکەڵی هەر دووکەڵ کێشێ ،
کەمندالاّنی هەژاری
وەك کارژۆڵەی پەرەوازە
خەوتوو لەبن سێبەری پرد
چەتری پاسدا
بەدی ئەکەم
من بۆن ئەکەم
بۆنی بۆکڕوزی شیعری
ئاوارە بووی "نالی" ئەکەم!!

★ ★ ★

ئیسته بەناو گۆڕستانی "ئوسکۆدار" دا
ئەگەڕێم و چاوم وەکوو هەلاڵەی سیس.
چڵی مل کەوتوو بەلادا.
هەڵهێناوەی هەنگاوی خاوی پەستم ،
بەناو دارستانی سپی بەردە کێلدا ،
ورد  ورد ئەمبا.
گەورەم نالی  !
ئەی "نارەوەنە" تەنیاکەی
هەڵکەنراوی خانەقاکەی
سلێمانی !
تۆ لە کوێدا
چڵ و چێوی ڕاکشاوی ؟!
موریدێکی شیعری خۆتم
هۆرەیەکی "خاك وخۆڵ " تم
هاتووم بۆلات.
گەورەم نالی !
ئەی "تانجەرۆ"ی سەرگەردان و
"سیروان " ی وێڵ
شارێك گۆڕو بێشەیەك کێل
لەکام گۆڕدا
تۆ ئێسقانی
ڕاکشاوی ؟!

گۆڕت بزر
بزر وەکوو ساڵ ورۆژی
لەدایك بوونی هەزاران
منداڵانی نیشتمانم.
بزر وەکوو زۆر قەڵەمی
فڕێنراوی ناو گیرفانی شارەکانم.
بزر..بزر
وەك گۆرانی ودەنگی خۆش و
چریکەکەی "ئەحەی ناسر"
گەورەم نالی !
نەك گۆڕی تۆ
هەتا ئیستەش ئەم دنیایە
زۆری تیایە
زۆری تیایە
کەنازانن کوردستان خۆی
زامی گەورەی لەکوێدایە ؟!

ـ 2ـ

لە گوێ بسفۆڕ هەردوو دەستم
خستۆتە بەر پشتێنەکەم
خۆم بەتەنیا
وەك دار لیمۆیەکی زەردبووی

سەر پەڕ گرتوو

ڕاوەستاوم

"با" یەك بزێو خێرا خێرا

دێ و هێشتاکە دەستی تەڕە

بۆینباخم ڕائەکێشێ و

قژیش ئەخاتە سەرچاوم.

ئەم بایە گەلێ لاسارە

واز ناهێنێ وناڕواتەوە ،

دێ ودەستی وشك بۆتەوە

دێ وبەبەر چاوی خۆرەوە

توند بالاّم ڕائەوەشێنێ و

لیمۆی خەمم دائەڕنێ و

ئەیدا بەدەم بسفۆڕەوە.

⋆ ⋆ ⋆

تاکوێ بڕکات

"نەورەسە" کەی نزم فڕی

عاشقی ئاو پیا هەڵپرژاو

تاکوێ بڕوات

بەقەڵەمباز ، بەنەرمە غار

ئەسپی شەپۆل : یاڵ سپی وبژ، کەفەڵ شینی

جڵەو بەربووی سەربەرەو خوار.

بەدوایاندا

یەکە

یەکە

من خەیاڵم وەکوو هەتاو

ئەیانگاتێ وجێشیان دێڵێ.

یان هەر وەکوو پەڵە هەورێ

ژان بەبارانەوە بگرێ

بەسەریاندا دێت وئەڕوا

ئەڕوات ودێ

تائەو ئەزێ و

تائەوان تاقەتیان ئەچێ.

یان ناو بەناو

هەر سێبەریان بۆئەکات و

وەڕس نابێ و

بەدیاریانەوە ئەوەستێ.

وەکو شاعیر بەدیار وشەوە

زەوی بەدیار پرووشەوە

چرا بەدیار

عاشقێکی بێدارەوە

هەژاران بەدیار کارەوە.

منیش ئیستا

هەنگێکم و شیلەی لێوی

ئەم بسفۆڕە باڵی گرتووم

هەرچەند ئەمەویٚ هەڵفڕم

هەڵنافڕم وهەتا ئیستە

لەجێگەی خۆم

هیچ نەبزووتووم !

★ ★ ★

لەگویٚ بسفۆڕ دانیشتووم و

قۆڵی كراس هەتا ئانیشك

پانتۆڵ تا ئەژنۆ هەڵكراو

هەردوو قاچم

خستۆتە ناو

ئاوی تەنكاو

ئیستە لە "تیتڕواسك" ئەچم !

تیتڕواسكیٚ نامۆو بیٚجووت

چەند ڕۆژێكە

هەرخۆی و خۆی

بەسێبەری كەنارێكی دەس تەزیوا

بەهەتاوی بەستێنێكی

ئارەقی لاجانگ نەسڕیوا

هەرخۆی وخۆی نامۆو بیٚجووت

بەسەر ڕۆخی داوێن تەڕا

نزم.. نزم، بەقەد بالاّی

خەمی نەمام

هەڵئەفرێت و ئینجا بەرز

لەناو تەمی

نیوە داپۆشیوی شاخا

ون ئەبێت و لەدواییدا

هەرخۆیو خۆی نامۆو بێجووت

ئەگاتە لای بەفری نووستووی

سەر هەڵەمووت !..

⋆ ⋆ ⋆

لەگوێ بسفۆڕ ڕاکشاوم

هەردوو دەستم لەژێر سەردا

ئیستە ئەڵێی هێرۆیەکی

سەرلق سپیم

لەدوورەوە ئاو هێناومیو

ئاولایداوم.

وەکو هێلکە شەیتانۆکەی سەر لم

چاوم نووقاو.

وەك شۆڕەبی دانەویی

گوێ گرتوو لەگۆرانیی ئاو

گوێم گرتووە :

ئەڵێی هاژە ناوم دێنێ

کەنار لایلایەم بۆ ئەکا

گەرداوی دوور بانگم ئەکا.

سەر هەڵ ئەبڕم

تۆزێکی تر هەڵ ئەسم وبەم ڕۆخەدا

ڕێگەی  ئاونگاویی ئەگرم.

ئەڕۆم هەورازی سەر بەگوڵ

دەشتی  قژ  زەرد

گردۆڵکەی هەردی ڕووت و قووت

هەمووی ئەبڕم

ئەڕۆم.. ئەچم

لەکۆڵ کێشی پاپۆڕەکان

لەبێ کاری بەندەرەکان

پرسیار ئەکەم.

ئەڕۆم "شەفیقی تۆڕنەچی " ئەبینمەوە

لێی ئەپرسم،

تا بەلەمە سەوڵ سوورە

چاوشینەکەی "نازم حیکمەت"

ئەدۆزمەوە وسواری ئەبم.

ئەوسا ئیتر هەردوو سەوڵم

ئەبن بەدوو باڵی درێژ

ئەمبەنە لای  شەپۆلی دوور

ئەمبەنە لای ئەوگەرداوەی

بانگی کردم

ئەمبەنە لای ماسیگرێ

کەهەر وەکوو خۆم تەنیایە

بەڵام ئاواتی چاو سەوزی

وەکوو بسفۆڕ لە دڵیایە

# پایزە نامەیەك

وەرەوە بابەجووت بڕۆین
خۆرنشینە وشەقامی چۆڵ
خەمێکی زەردی کشاوە
چاوەڕێی پیاسەی ئێمەیە ،
ئێوارەی ڕەنگ.. هەڵبزرکاو
لەئاوێنەی ئەم پایزە درەنگەدا
ئەڵێی دەم وچاوی خۆمە
دەم و چاوی پێش حەوت ساڵم
ئەوساتانەی
کەجێت هێشتم :
" دەم وچاوم کانییەکی
ساف و ڕوون بوو
کەتوڕەبوونت هەڵیکرد
بووی بەگەرداو
لێڵت کردم ! "
ئەی شیعرە هەڵفریوەکەم

وەرەوە با  یەکە یەکە
شەقامەکان تەی  کەینەوە
ئەوشەقامە درێژانەی
وەك بێداری وشەونخوونی
ئێمە وان و تەواو نابن.
وەرەوە با  سەر کەینەوە
بەباوەشی باخچەکاندا
ئەوباخانەی گەڵای داریان
وەك ڕازەکانی دڵی من
چڕ و پڕن
ناژمێررێن و تەواو نابن.
وەرەوە بابەجووت بڕۆین
بێ دەنگ وەکوو ئاونگی سەر
پەڕەی چاوم.
وەرەوە بابەجووت بڕۆین
گلەییمان زۆر لە سەرە
گلەیی ئەو ڕوبارانەی
بەلایاندا تێپەڕین و
سەرمان لەشەپۆلیان نەدا.
گلەیی ئەو درەختانەی
بەلایاندا تێپەڕین و
سەرمان لە سێبەریان نەدا.

گلەیمان زۆر لە  سەرە

وەرەوە بابەجووت بڕۆین

خۆر ماویەتی هەورازێکی تریش ببڕێ  !

★ ★ ★

خۆر نشین ئیستە تارایە

تارای پەنجەرەی مالأن و

سەر گومەز ودرەختەکان.

وا ئێستە خۆر لەئەستێرك و گۆمەکاندا

ئەلێی تاوسێکی خڕی داگیرساوە ،

پەلکە ڕەنگینەی ئاگری  سەر ڕووی ئاوە.

وەرەوە با بەجووت بڕۆین

من ئەمەوێ ئەو تارایە

لەپەنجەرە وسەرگومەز و درەختەکان

بکەمەوەو بیدەم بەسەر سەری تۆدا

من ئەمەوێ

تۆ شاژنی ئەرخەوانیی

خۆرنشین بی و

منیش وشەی گڕ تێ بەربووی

ئەم دیدارە.

★ ★ ★

وەرەوە با بەجووت بڕۆین

دیوانێکی تازەم هەیە

**بەدەم ڕێوە**

**بۆڵە وشەی شیرینی  ئەکەم بەدەمتا**

**حەرفی زەرد وسوور سەوزی**

**ئەدەم لەفڕو بەرۆکت**

**ڕستەی شینت ئەکەمە مل.**

**وەرەوە بابەجووت بڕۆین**

**ئەوەتا خۆر**

**گەیشتۆتە سەر دوا هەوراز**

**هاکا لەپڕ بازێکی داو  خۆی هەڵدایە** [1]

**باوەشی شەو.**

**نەهاتی تابە جووت بڕۆین**

**شیعرم شەوی بەسەردا هات.**

**نەهاتی تابەجووت بڕۆین**

**نەهاتی تابەجووت.**

**نەهاتی تا.**

**نەهاتی.**

**نە.**

(1) وێنەی قەسیدەیەکی ئەلیوتە 1982.

# دوو دەنگ

## 1ـ فریشتەی دەنگی سپی

بیلێ وبا ڕوخساری گڕەی هاتووم بەسەر

ئەم ژیلەمۆی سەفەرەدا

بخەمە بەر

ئەوپڕوشە وکزە بایەی

کە لە کوێستانی دەنگتەوە

ورد

ورد

ورد

ورد

دێنە خوارێ.

بیلێ و باگوێم  پڕ بەبیستن

بۆنی ئەو باخانە بکات

کە لەتاڤگەی گەرووتەوە

ئاواز پرژێنی من ئەکەن.

بیلێ و با تاوڵی تاسەم لەم کۆچەدا
لەبەر کارێزی فێنکی دەنگتا بخەم.
ماندووم ئەی دەنگی سپی فریشتەی ،
لەلای بەفری کاوانەوە هاتوو
ماندووم.. ماندووم
توخوا ئەگەر لەسەر دەستی خۆرنشینی ئاخەکانت
هەڵم نەگری !
توخوا ئەگەر لەکەژاوەی پێڵوی هەوری نیگاکانتا
هەڵم نەگری !
ماندووم.. ماندووم، ئەزانی چۆن؟
ماندووم وەك هەناسەی سواری ئەو چلاّنەی
کە "با" لەکەناری چەمدا
سەریان ئەکا بەناو ئاودا و
دەریان دێنێ ودیسانەوە
ئەیانکاتەوە بەئاودا !
ماندووم ، وەك ئەو شەقامانەی
کەڕێبواری
سوارە وپیادەیان لەسەر ناڕەوێتەوە.
ئەی فریشتەی دەنگی سپی !
لەسەر باڵی ئاوریشمینی ،
لەسەر باڵی هەناسەکەت
هەڵم ئەگری ؟

ئەوائیستە ، خۆم ئەبینم لەدوورترین ئەستێرەدا

ئەجریوێنم !

لە دوورترین ئەستێرەدا گوڵی ناو خەو ئەکەمەوەو

ئەیدەم لەقژی لەیلاکەم

خۆم ئەبینم هێواش هێواش لەسەر شانۆی

سپی و بەرزی هەوری خەیاڵ

سەما لەگەڵ گیانتا ئەکەم.

" بایرۆن ! تەنیام وتەنیای هەر گەڕیدەی

ناو سرووشتەو ، پەنابەری دارستانە کپەکانە.

پوشکین ! تەنیام وتەنیایی تۆش هاتوەو

ئیستە بەجووت لەسەر درەختی گریانی

من ئەخوێنن "

ئەی فریشتەی دەنگی سپی !

بیلێو با ڕوخساری گڕەی هاتووم بەسەر

ئەم ژیلەمۆی سەفەرەدا بخەمە بەر

ئەو پڕوشە وکزە بایەی

کەلەکوێستانی دەنگتەوە

ورد

ورد

ورد

ورد

دێنە خوارێ وئینجا منیش لەگەڵیاندا

ئەتویٚ

مەوە

ئەت

و

یٚ

م

ە

و

ە.

## 2ـ کوڕ ژنی ئەسپی برووسکە

نێرودا وای بەشیللی وت :

لەبەرئەوەی

جیٚ ژوانی دڵداریم وسێبەری بن

ئەوسەروانەی کەسەرت تیا ئەنێمەوە..

لەبەر ئەوەی

تۆ ڕنوی ڤژی تاریکی و

لقی دەستی لاوازو لەرزۆکی دایکمی و

لەبەر ئەوەی

تۆ چۆلەکەی باڵکراوی

سانتیاگۆیت ونافڕی !

لەبەر ئەوەی لەناو نیگای

کتێبی ماندووی هەژارو برسیەکاندا

تۆ فرمێسکێکی قەدەغە ودەرکراوی !

نیشتمانم !

بۆیە کاتێ بانگم ئەکەی

ئەبم بەئەسپی برووسکە ولەتاریکیتا تاو ئەدەم

بۆیە کاتێ بانگم ئەکەی

ئەبم بەنان

بەئاو

ئەبم  بەباڵ و بە هەتاو

نیشتمانم !.

ئابی –1975

# پڵنگ و پەیکەر

بۆ" هێمن"

لە گیانەڵاوی ئێوارەی ڕۆژێکتا بوو
گەیشتمە لات.
برینەکانم هەرلەبەر دەرگاتەوە
خۆیان هاویشتە باوەشی ڕووبارەکەت
ئەویش هێواش گرتنیەوە و
بەدەم ماچی ئازارەوە
بردنیە شار :
ئەمە تۆی من لەناو خەوی
چەند ساڵەما
هەموو شەوێ ئەمبینیت و
دەستم ئەخستە کەمەرت
بەیەکەوە سەمامان بۆ :
باران ، لوتکە ، هەتاو ئەکرد !
ئەمە منم "گۆیژە" م بۆ تۆ هێناوەتە

پاڵ " زاوا –بووك" !

کەشەو داهات

بەدووقۆڵی سەرئەخەنە سەر شانمان و

ئێمەش ورد ورد لەبەرخۆوە

ئەو سرودەیان بۆ ئەڵێین

کەیەکەم جار لێرەپشکووت !

بمگەڕێنە !

نەشارەزای گەلێ شاری

چاوی خۆمم

لەدڵی خۆمدا ون ئەبم !

ـ کوا چوارچرا ؟!

ترسێ نیگای تروکانی

پەنجەی ئاوڕت خستە سەر

بێدەنگی یەك.. وەکوو کلووی

بەفرێکی مات

لە با پێچی ڕوخسارماندا

تروشکەی کرد !

کەڕاوەستاین مێژوومان دی

پاشەو پاش ئەگەڕایەوە ،

ڕۆژمێرێکی داینە دەست

لە خۆر نشین هەڵکێشرابوو !

ـ کەواتە من حەوت ساڵان بووم

کەتۆ "بوویت " ولێرەدا  بوو

خۆرت هێناو

ئەتدا لەبەرۆکی "سابلاّخ"

لێرەدا بوو شانۆیەکت لەگولاّڵە

دروست کردو ئەستێرەت پیاهەڵئەواسی.

شایی نێرگز لەناو بەفرا

ئەیخایاند و ،چراخانی مۆمی پەنجەی

داگیرساوی درەختەکان

ئۆپەرێتی ڕووناکی بوون.

ـ کەواتە من حەوت سالاّن بووم.

بەستەڵەکی بێ دەنگیمان

وەختێ شکان

کەچەند زەرنەقوتەی ئاخێ

سەریان لەناو سنگمانەوە هێنایە  دەر

بەبێ ئەوەی پێبزانین لەدڵۆپی

ئاونگی ناو

ئەستێرکەکانی پێڵۆیان ئەخواردەوە  !

وتت : بەلاّم ئیستە لەژێر

هەردوو قاچی پەیکەردا شار

پڵنگێکە ئەژنۆ شکاو.

تۆ بڕوانە ! چۆن لەنێوان

هەر دە پەنجەی پەیکەرەوە

هەتا ئەمڕۆش خوێنی هەڵۆ کوژراوەکان
دێنە خوارێ ولەچەقی گشت ڕێگەیەکدا
وەرزێکی نوێ ناو نووس ئەکەن !
تۆ بڕوانە ! "محەمەد" چۆن
لەناو نەڕەی شێرەکانی
هەرچوار گۆشەی باخچەکەوە
دێتە دەرێو هەتائیستەیش
پەیکەرەکە ئەتۆقێنێ !
گەڕاین.. گەڕاین
لەپێچی هەر شەقامێکت وکۆلانێکتا
گەلا.. گەلا
سەرنجەکانم ئەوەرین.
ناسیاوم و نەناسیاوم :
جلەکانم ، جامانەکەم هەندێ وشەم
پێناسێ بوون ئەیانکردمە
کۆڵی دایکی خۆشەویستیت.
ئەیانبینیم کوێرە کانیم
لەناو کاولاشی دڵیاندا
سەر لەنوێ ئەتەقاندەوە
ـ قوربانت بین
سەرنویشتمان وا لەدەستی ئێوەدایە
توخوا باشین ؟!

قوربانت بین !
گەڕاین.. گەڕاین
کچەکانت پۆلە گوڵ بوون
لەچارشێوی ڕەنگاو ڕەنگدا هەڵ ئەفڕین و
لەسەر لقی هەردوو دەستی هەڵ لەرزیوم
ئەنیشتنەوە..
چرای مەمکیان ئەدا لەشەختەی ڕوخساری
وەریوی من
ـ توخوا خەڵکی سلێمانیت ؟!
بریا.. بریا
سلێمانیم بدیتایە !
ئەی کچی جوان لەبەر بریاو خۆزگەی تۆیە
سەرم داوە بەوشاخانەو
لەبەر بۆ کروزی جەرگی تۆیە ، کەمن
گیانم کردۆتە چراوگی دارستان وئەشکەوتەکان
لەبەر ئەو ئێسکە سووکەتە
ڕەنگم پەڕیوی ناو تەمی
سەر ماڵانی سلێمانی و سەر ئێرەیە
ئەی کچی جوان !
لەگیانەڵاوی ئێوارەی ڕۆژێکتا بوو
گەیشتمە لات
برینەکانم هەر لەبەر دەرگاتەوە

خۆیان هاویشتە باوەشی ڕووبارەکەت

ئەویش هێواش گرتنیەوەو

بەدەم ماچی ئازارەوە

بردنیە شار !

1976

# ڕەشەبا

- 1-

بە "کەنفانی" م وت :
وشەی باڵندەت لەبێشەی چڕی
ئەندێشەتەوە هاتۆتە دەرێ و
ئەوا ئێستاکە هەموو ئاسمان و
دەنگی هەتاوی تازە هەڵهاتووی
وڵاتی خۆری بەستۆتە باڵی و
لەچاوی خۆیدا
هەرچی سەرنجی شەپۆلەکانە
کۆی کردۆتەوە.
جێگایەك نییە
کەجێی قەوارەی کۆچی وشەی تۆی
تێدا بێتەوە
زەمانێك نییە
کەخۆشەویستی وشەی شەهیدتی

لەبیرچێتەوە !

وشەی باڵندەت لەسەر درەختی

نامۆیی هەژار

هێلانە ئەکاو لەسەر چڵی گڕ ئەنیشێتەوە.

کاتێکیش وشەی باڵندەت ئەفڕێ

سنورێك نییە لەهەڵفڕینیا

نەیسڕێتەوە !

ئەویش پێی وتم :

وشەی باڵندەم ئاوابێ ئیتر

چۆن ماڵیی ئەکرێ و ئەگیرێتەوە.

چۆن ماڵیی ئەکرێ وئەگیرێتەوە!

ـ 2ـ

لەناو شریخەی چەخماخەدا بوو

کەتۆوی دەنگم

کرد بەسەر کێڵگەی تەمی وشەوە

کاتێکیش وەرزی سەرهەڵدانی ئەو

هات بەپیرمەوە

بینیم پەڵە دەنگ

لەتەماشاتا سەوز ئەکاتەوە.

لەتەماشاتا جۆگەلەی ڕستەم

ئاوێنەیەکە

لەبنی روونیا ئەتخوێنێتەوە.
لەتەماشاتا هەر برژانگێکت
ئەبێتە نووکی خامەی شاعیرێ و
لەسەر لاپەڕەی پێڵوی چاوانت
وەك هەزار هەڵبەست
ئەمنووسێتەوەو ئەمنووسێتەوە.

ـ 3ـ

بەربەیان گریا
کاتێ گوێ ی لێبوو
وا ڕەشەبایەك لەلەپی دەستی
زبر وتوڕەیا
گوڵی وشەیەك هەڵ ئەوەرێنێ و
بەرەو گۆڕیچکەی باپێچی ئەبا.
گریان پێ کەنی
کاتێ کەبینی
فرمێسکی وشەی
بەدڵی بەردا ئەچێتە خوارێ و
چرای ژوور سەری
چیا هەڵ ئەکا !

1975

# شـــاخ

بەناو مێژووی تەما ،ئاوڕ :سەرنجی خۆی

سواری ئەسپی

چەخماخەیەکی تیژ ئەکات ،

ئەسپی چاوێ

کە وەرزە جوانەمەرگەکان

جڵەو بۆ –تاوی – شل ئەکەن !.

زۆردەمێکە ئائەم ئەسپە

ڕێی مەرگ ئەبڕێ

تا ناوچەوان خۆرێکی سووری تیا هەڵبێ.

هەتا بفڕێ دائەگیرسێ وتیشك ئەهاوێ.

ڕامەوەستە

تا ماندووبوون هەناسەی ڕێگە سوار ئەکات

ـ ئەم کێوانە ئەیانەوێ

بومەلەرزە ڕایان ژەنێ.

ئەیانەوێ خۆشەویستی ومەرگ

بەگەردوونیان بناسێنن
پشکۆ لەشەختەی سنگیانا دەربهێنن.
ئەیانەوێ لووتکە نەگری و دنیا بەبارانێ تەڕ بێ
کــەئەستێرە کوژراوەکان جێ پێ ی بەهاری هەڵگرن.
ئەم کێوانە ئەیانەوێ
پرشنگ لەئاسۆدا بگرن
- نیشانەیە : گوللە سوارەو
برین : مەڵبەندێکە ئاگر
لەچوار دەوری
ئەم نەخشەیە ئەکاتەوە.
نیشانەیە : ئەم نەخشەیە سەری جەنگەڵە داوێکە
توناوتوونە
- بیرتان نایە ! مانگی کوژراو کەهەڵنەهات
چ کۆتەڵێ ئەگێڕدرا بۆ ئاسمانەکەم ؟
ئەم نەخشەیە گوندەکانی
لە شەوەزەنگا رزیون
لەناو ئۆردوگای دوکەڵا
ئاگردانی چاوی ئێوەی شاردۆتەوە.
نیشانەیە : ئەم نەخشەیە سەری جەنگەڵە داوێکە
هەزار داوی خستۆتەوە.
- بەئاگابن نەخشەکەتان
کەنیزەکێ بەماچێکی دوای نیوە شەو

لەسەر مەمکی تاپۆی نەکات !

بەئاگابن نەخشەکەتان لەپێشوازی

خەلیفە  دا

خۆی ڕانەخات !

ـ نیشانەیە: هەمووبڕینەوەی دارێك

باڵندەکان فێر ئەکات چۆن

هێلانەکان بگوێزنەوە و

لەگەڵ ئازاردا کۆچ بکەن.

بێ دەنگییان  ئەچەقانە چاوی یادمان.

بیرتان نایە ! یەکێ نەبوو لەژوور سەری

تەرمی پەیمانی "سیڤەر" دا

ڕمی دەنگی داچەقێنێ

بیرتان نایە ؟

ـ نیشانەیە هەموو هەڵکەندنی دارێ

باڵندەکان فێرئەکات چۆن

بەباڵ بێچوو بگوێزنەوە بۆ کونە شاخ

فێریان ئەکات کەنیشتنەوە

چاوی ڕاوچی

لەتان وپۆی پیلانەکاندا ببینن !

ـ کەهەڵفڕین

ئاوڕ لەو لقە بەنەوە.

نیشانەیە لق شکاوە

لق پوازی چوارەمینی

داتاشراوە !

ـ ئەم شاخانە "گەزنەفون "ی

کۆن ونوێیان

خستۆتە ناوئەشکەوتەوە و

دەمی ئەشکەوتیان بەتەرمی شەهیدەکانم بەستووە !

پشوو نادا

چەك زمانی کێڵگەی ئەو جوتیارانە ئەزانێ

کەهەوارو

دیوەخانی بەگ تێی ناگا.

barووتی گڕ لەزەمینی گیانا ئەڕوێ.

چەك لەگەڵ مردندا ئەدوێ.

چیتان ئەوێ ؟ !

کەگوێتان نا ، کەگوێمان نا

بەدەلاقەی دەرگای برینی شارەوە

چیمان ئەبیست ؟

ـ لەکێلانی خەمەکانی ئەم شارەدا

وشە ئەبێتە خەنجەر و

ئەکرێن بەقەدی شیعرەوە.

وشە ئەڕوا وئەگاتە شاخ

وشە ئەبێ بەباو بۆران

ئەبێ بەشەوبۆ بۆ قژی

مانگی کوژراوی دەزگیران.

چی ئەبیستن ؟!

چی ئەبینن ؟!

ـ لەناو گەڕەکی گریانی هەژارانا

ئاخێکمان دی

سەریان ئەبڕی

ئاخ بوو بەگوڵ

لەشاخ ڕووا

ئاخ بوو بە کەو

بۆ لای بەفری

یار هەڵ فڕی.

چیتان ئەوێ ؟!

ـ کەو نەخرێتە ناو قەفەزی پایتەختەوە

گوڵ نەڕنرێ و نەبرێ بۆ میر.

ـ ئەم کێوانە لەسەر پشتیان

کاسە سەری دێوی ڕەشی

چاخەکانیان هەڵ چنیوە.

پشوو نادا

ئەسپی خوێنی ئەم شاخانە

لەو ڕۆژەوە ئەحیلێنن

کەهۆگری غار کردنن لەدۆزەخدا

لەوڕۆژەوە ئەحیلێنن ، پشوو نادەن

تەماشاکەن

تیشکی زامدار ئەوا بەشانی ئاسۆدا

بەرەو ژوورە.

شەقاوی دەنگ

بنکەی بیستن

لەگوێ ی سالّدا ئەکاتەوە و ،

لەژوورەکانی کۆشکی "ڕەشید " دا ئەگرمێنن.

بارانی دەنگ

پەڵە لەسنگی سەنگەری

دە ساڵەدا

ئەداو بەتاو

دائەکاتە سەر شانۆی خوێن

ـ ئەزانن بۆ هەوری ئێمە

قەت بارانی لەبار ناچێ ؟

ـ هەژارەکان ڕەنگیان تێکەڵ

بەهەوری تینوو کردووە.

هەژارەکان ناونیشانی شاخەکانیان

لەسەر ڕوومەتی برسێتی هەڵکەندووە.

هەژارەکان ئالأی دڵی

ئایندەیان لە ئێستەوە

هەڵکردووە .

پشوو نادا

ئەمە ڕێگەی ئەو چاوانەن گلێنەیان

لەقۆناغی مەرگا تۆو کرد

بەئەژنۆ مۆری بەردەمی ترسیان نەکرد.

پشوو نادا

ئەسپی خوێنی ئەم شاخانە

لەو ڕۆژەوە ئەحیلێنێ

کە ئەستێرەی قوربانیی خۆی

لەگۆمی سەنگەردا دیوە.

لەو ڕۆژەوە  هەوری حیلەی ئەگرمێنێ

کەخۆی بەتۆفانی سەدەی  ،

مردن بەپێوە ناسیوە.

1974/2/6

ئەم شیعرە لەپێداچونەوەدا بۆ دووەمجار دەستکاری کراوەتەوە و هەندێ ئاڵوگۆڕی بەسەردا هاتووە.

# گەشتێك

یەك شەمەیە..

جادەكانی ڕوو لەباخی "هیرۆ سترۆ "

جووت جووت  دڵدار هەڵ ئەفرێنن

بۆ ئاهەنگی  دوای نیوەڕۆ.

"هیرۆ سترۆ" ی شاژنی گشت

باخچەكانی نێو "بۆ خارست"

لەچوار لاوە

دەرگای سەوزی میوانداری

وا لەسەر پشت.

دارستانی  سنەوبەری

نیوە هەتاو

نیوە سێبەر.

شەوقانەوەی فوارەی ئاوی

بەر تیشكی خۆر

چیمەنی تەڕ.

دەنگی باندی  مۆسیقایەك

شەپۆلی "با" ڕای ئەژەنێ ،

جارێك وەكوو بگری وایە و

جارێكی تر پێ ئەكەنێ ،

تەزووی فێنك

بەدەروون و گیاندا دێنن

ئەتدەنە دەم خۆزگەی فڕین

باڵ پێ گرتن.

بەسەر شەقامی بەرد ڕێژدا

جێ.. جێ.. تەڕی باراناویی

هێدی.. هێدی وا ئەڕۆم و

ڕووم كردۆتە گۆمی چاوی.

هەڵڕوانینی  ڕۆژهەڵاتیم بۆ دەورو پشت

هەنگاوی خاو

ئاوڕی زۆر، حەپەسان و

شان لەشان دان

ئێستی ناكاو !

ـ ئەی فریشتەی بوخارستی

ببورە لێم

یەكەم جارە

كەوی عومرم

خۆی لەقەفەز دەرباز بكاو

ئازاد بفڕم.
لەم گەشتەدا چاوی برسیم
لەچەند شۆخی نازدار ببڕم ؟!
بەکامێرام لێرەو لەوێ
چەند دیمەنی شیرین بگرم ؟!
هەر ئەڕۆم و "هیرۆ سترۆ"
قۆڵی شیعری لەقۆڵمایە
هەر ئەڕۆم و بۆنی کچ و
شەقامی گوڵ دوایی نایە .
لەم پێچەدا پەیکەرەکەی
سەری "گۆرکی " ئەموەستێنێ
وا شەماڵێك بۆنی بزەی
سمێڵی ئەو بۆ من دێنێ .
لەوپێچەیشدا "مایکۆفسکی"
تەوێڵ پانی ، قژ ئاڵۆزکاو
لەسەر سەکۆی کۆنکرێتی ی
ڕاوەستاوە
ڕوو لەهەتاو .
لەناوەندا "ئیمنیسکی"
دەستی چەپی بۆ هەوارێ
ڕاکێشاوە
کە سەربەستیی

ڕەشماڵی خۆی تیا هەڵداوە .
ئیمینیسکی !
ئەی لووتکەکەی
مانگی شیعر لەسەر کردوو .
ئەی بەخۆڵی ڕۆمانیا
چاوی وشەو بەهرە ڕشتوو .
بابەر لەوەی تێپەڕم و
"هیرۆ سترۆ " بەجێ بێڵم
سەری شیعری بچووکی خۆم
لەبەر دەمتا دانەوێنم .

1980

# كفن دز – ئەكتەر

هەناسەدان لەناو سنگی ولاَتێکدا
کە سییەکانی بەباروووت داگرنەوە !
چی بەسەردێ ؟!
ـ ئەمە ڕاهێنانی مەرگە ، کاتێ کەخاك
ژان بەدووانەی
شەوی بوومەلەرزەو بورکانەوە ئەگرێ !
ـ هەناسەی تۆم کەهەڵمژی
نمەی بارانی بینینم
ڕژانە سەر
گۆنەی پایزێ و سەوز بووم .
هەناسەدان لەناو سنگی ولاَتێکدا
کە سییەکانی بەباروووت داگرنەوە
ڕاهێنانی مەرگە ودەستەمۆکردنی بەوری ترسە
لەبێشەلاَنی ئاگردا .
هەناسەدان لەنیشتمانی دووکەڵدا
گەشکردنەوەی پشکۆکانی

ژێر ئێسکێکه

هەڵقرچانی :

بانگ کردنە لەبارەشێ

چنگی لوورەی بخاتە ناو

بەستەڵەکی مێژووەوە

لافاوی نووستوو هەستێنێ !

ـ هەناسەتم کەهەڵمژی

ڕەنگم بوو بەدەنگی هەڵۆو

لەناو هەوارا دای چەقانم

ڕەنگم لەدەنگتا گرتەوە

بیرکەرەوە : لەوگەشتانەی ، لەوسەفەرە درێژانەی

کردمان ونەگەڕاینەوە ..

ماڵ ئاوابێ ! گریان لە ناو

دەربەندەکاندا بەستویێتی !

ماڵ ئاوابێ ! دایکم ئەڕوانێتە مەرگم

بەر لەوەی هێشتا مردبم

ماڵ ئاوابێ ! هاتی و برسێتیت هێناوە بەپیرمەوە

ماچم کردی و ماچت کردم

ـ لەم ناوەدا

دۆزەخ لەبەهەشت چووز ئەکرێ !

لەم ناوەدا پرۆژەکان لە ـ خوێن ـ ەوە

وزەی ڕوناکی وەرئەگرن .

کامە شەهید پرسیوێتی
ئەو چەقۆیە سەرم ئەبڕێ ؟!
کام قوربانی هات و وتی :
مەرجی مردنم بۆ دانێن !
لەم ناوەدا ، هۆزی مەرگ هەڵبژاردن،جێنیشتەیە .
لەم ناوەدا تەنها بەفر فریشتەیە .
هەناسەدان لەناو سنگی ولاٌتێکدا
کە سییەکانی بەبارووت داگرنەوە
خۆر چی لێدێ ؟
ئەمە وەرزی
پەڕینەوەی تیشکە بەسەر شوورەی هەموو نێزەکاندا و
گرتنە باوەشی لوتکەیە .
پەڕینەوەی برسێتیەیە .
گوێ بگرن ! نان لەناو خەوا هاوار ئەکاو
هەژارەکان هەڵ ئەسێنێ .
مەیگۆڕنەوە ! ئێوە هاتوون دەم و چاوتان
لەکفن دزە کۆنەکان بسەننەوە
مەیگۆڕنەوە ! ئێوە هاتوون گۆڕی دنیای
تاوانەکان یەکە .. یەکە هەڵبەنەوە .

ـ 2ـ

لە"بیافرا " ی ناو "سینا "دا

**کەدەسکەنەی قژیان کردی**

**هەرچی دڵداری دنیایە**

**بێ قژ بینیم .**

**ئەی دڵدارە بێ قژەکان**

**قژی خۆتان ئەوێتەوە ؟!**

**یان بارۆکەی دەڵاڵەکان لەسەر ئەکەن ؟!**

**یان سەرتاشخانەی سۆزانیی ژێردەواری**

**سفر تاشی**

**"101"ی ئەم جیهانە**

**لەبیرئەکەن ؟!**

سە رەتای 1974

ئەم شیعرەش بۆ جاری دووەم و لەکۆتایی هەمانساڵدا کەمێك گۆڕانی بەسەردا هاتووەو دەسکاری کراوەتەوە .

# بەهارە شیعرێك

وەكوو درەختێكی تەنیای
بەر زەردە پەڕ
لەپاڵ دەوەنی گردێكدا
ڕاوەستاوم
سەرو مل و تا ناو قەدم
لەبەر هەتاو
قاچ و قول و تا ژوورئەژنۆ
نوقمی سێبەر .
بەرامبەرم :
كێوی بەردیینی گەردن لووس
وەك دیواری شووشەی شین باو
ڕێك هەڵكشاو
كەگلێنەم ئەفڕێ بۆلای
وەك سەرنجم هەڵئەخلیسكێ
چاو ئەتروكێ  وكزە بایەك
كالانە پڕ ئەكا لەئاو .
لەم لاشەوە تەم ومژێ
وەك قژی خاو
بەدەم "با"وە

دێت وئەچێ وجارێك ئەچێتە سەرلەشی
بەفری نووستوو دای ئەپۆشێ و
جارێکی تر وەکوو هەڵبێ
بەرەو دواوە
بەرەو دۆڵی ئەودیوی شاخ
مل ئەنێت و بەهێواشی دائەگەڕێ .
لەو لایشەوە لووتکەی تیژی
شێوە خەنجەر .
پەڵە هەورێکی سمیوە و
چەتری سپی
هەڵداوە لەسەر تەوقە سەر .
لەبناردا و لەسەر ڕووبار
کەشەوقی ئاوێنەی ئاوی
چەپکە پرشنگ
ئەدا لەپەڵکە گیای دەشتی
ڕاکشاوی تەختی کەنار .
پۆلە ماسیگرەی سپی
سپی وەکوو گوڵی چوالە
باڵ وەر ئەدەن لەتەنکاو و
تنۆکی سارد ئەپرژێنن
لەدەم وچاوی هەلاڵە .
بەلای ڕاستدا پەڵە چنار

لەجۆگەدا قاچی تەزیو
لەرەلەر و خشە خشی گەلاّی گوارەی
وەك ختووكەی  لامل بدا
دائەچلّەكیّ و پیّ ئەكەنیّ ولەنجە ئەكا
چلّی بەرزی گەردانە زیو .
بەلای چەپدا :
ڕێگەی نسرمی ناو دەربەند
ئەم بەر .. ئەو بەر
هەتا ئێستەش  دەست و پەنجەی
دارستانی شین هەلگەڕاو .. لەگۆ كەوتوو
بنچك لە ژێر بەفرا خەوتوو
كەسەرنجی زیاد لیّ بگرم
من لێرەوە لەسەرماندا
وەك شۆڕەبی هەلّ  ئەلەرزیم .
ئێوارەیەو خۆرنشینە و هەر وەستاوم
لەوساكەوە پەیكەرێكی بلوز شینم
هەردوو دەستم لەگیرفاندا و نەجولاّوم .
ئەوا ئێستەیش
لەدامیّنی زەردو سوری ئەم گردەدا
تۆ ئەبینم ئەی كچی  جوان  !
كراس وكەوای پوولەكەت  ،
نێرگزی قژ ،

بریسك و هوڕ

بریق و باق

وەك گزنگ و دەنكە تەرزە

وەك پوولەكەی پشتی ماسی

گۆمی زۆر ڕوون ،

وەك پزیزكی ئاگری شوانی

بەقەد پاڵەوە سووتاوم ،

وەك دلۆپی هەڵپرژاوی

سەر قەڵبەزە

هەزار تیشكی

ڕەنگاو ڕەنگ ئەدەن لەچاوم .

گەرای سەدان شیعری بچووك

لەناو ناخی مندا ئەخەن .

بەئەسپایی و بەژێی دڵم

زۆر مۆسیقای دەنگ سیحراوی

نەبیستراوم بۆ لێ ئەدەن .

ئەی شۆڕە كچ !

ئەبێ چی جوانتر بێ لەتۆ ؟

مەگەر تۆزێكی تر وەختێ

كەتاریكی بەپەلەپەل

بۆ ئێرە دێ

من ئەڕۆم و

ئەو لەجێگەم  دائەنیشێ .

وەختێ لەگەڵ

دەنگی سەوزی "خالقی" دا

سوار ئەبم و

بەرەو شار ئەگەڕێمەوە

وەختێ لەپڕ

لەسەر ملەی تاسڵۆجەوە

لەودیو جامی تاکسیەوە

"سلێمانی" م دەرئەکەوێ

مەگەر هەر ئەو لەم شەوەدا

لەو دوورەوە

شەپۆلی درەوشانەوەی چاوەکانی

تیشکی مرواری بەردەمی

هەڵڕێژراوی

وەك کراس و کەوای بەرت

پوولەکە چن  ..

مەگەر هەر ئەو

وەك تۆ جوان بێ و  بگاتە تۆ و

بەهەر دووکتان شیعری جوانیش

بدەن بەمن  .

بەهاری 1984

# لەسۆفیادا

ـ 1ـ

ئەوا ئێستەیش

گەیشتینە بەردەمی سۆفیای سەوز

کەهەر وەکوو سنەوبەری تیتك تەڕی دوای باران

خاوێن ..خاوێن, لەش برۆنزیی،بریقەی دێ و

لەودوورەوە زەردەی بزە

ئەدا لەدەم وچاومان.

★ ★ ★

لەپەنجەرەی واگۆنەوە سەروملی دەرهاتووم

ئەڵێی هێشووی بەردەمی ڕەشەبایە

هەردوو چاوم نیوە نووقاو ئاو تێزاو

دنیا ئەفڕێ و کەم خایەنە ئەم پەلەی تەماشایە .

★ ★ ★

لەجۆلانەی ناو بالقۆنی سەر نهۆمی بەرزەوە

وەکوو لەشم خەیاڵم ڕائەژەنم ..

بۆبەرەو خوار ، بۆبەرەو ژوور ڕوانینم

دێت و ئەچێ و

ئەوەی خەڵکی نایبینێ من ئەیبینم .

* * *

کچ بەچەپك زەردوسوور

شەقامەکان گوڵدانن

ئەوە بۆیە ئەمجارەیان شیعری سپی هاوینەم

بۆن خۆشترین عەتری وشەی

گوڵزاری ناو دیوانن !

* * *

ئەی کچانی لەش کەروێشکیی نەرم ونۆڵ !

لەبەر هەتاو پێستی شان ولامل تانیوەی قۆڵ

وەکوو ڕەنگی قەیسی گەیوو لێ هاتوو

من ئەمزانی ئێوە کوشتەی

تیشکی خۆری بەتاون ،

بۆیە منیش هەتاوی سووری هەڵبەستی

خۆرهەلأتیم لەچاودا بۆ هێناون .

ئەی کچانی پۆشاك سادەی نێو باخچە !

من بۆپووزیخڕو قەڵەو،لەرەی مەمك وگوڵمە گۆشتی بەرچەنە

بۆ پیرۆزەی چاوی شین وزەردەخەنەی بەشنە

بۆ پل و پێی پچکۆلانە و سەری پەنجەی وەك گێلاس

بۆ گەردنی یەك قولانجی و لووتی قنجی یۆنانی

شاعیرێکم  شیعری کێویی بۆنکەرم
بۆکوێ بڕۆن من لەوشوێنە ئامادەو
جارێ سێبەر  ، جارێ سروە و
هەندێ جاریش  پەیکەرم .

★ ★ ★

ئەی سۆفیای  قشتیلانەی هەمیشە ڕەنگ حەمامیی
پەساپۆرتم پۆلیسەکەی بەرباخەڵ !
ئەڵێ ئەبێ بەجێت بێڵم ، بڕۆم بۆ ڕۆژی دوایی .
ئەوائێستەیش ئەی سۆفیای ڕۆح شیرین
باپێش ئەوەی هەردوودەستی  دۆعا خوازییم هەڵبڕم
ڕووبکەمە ئارامگاکەی  "دیمترۆف"
تالەوێدا منیش وەکوو هەزاران
خەڵکی دنیای ئازادیخواز ڕیز بگرم  .

ـ 2ـ

وەك کشتەکی هەزار مووررووی ڕەنگاو ڕەنگ
چەتری سەر سەر لەبەر هەتاو
ڕیز بەستووە و کشاوە
ڕوەو دوامالّ ، جێ نزرگەی دیمترۆف
هەنگاو وردە ، بەوچانە و وەستان زۆر
مەگەر کۆکە یان پژمینێکی  ناوەخت
بیشڵەقێنێ گۆمی مەکسی

ئاپوورەی خەڵکی بەر خۆر !

* * *

پاسەوانی قۆزی بەردەم ئارامگا
دەس لەسەر چەك هەر ئەڵێی بووە بە بەرد
تروکەی چاو ، بزاوتنێکی نیگا
مشەمشێ ، هەناسەیەك ، لەرزینێ
نابیسی و بەدی ناکەی
چەند بوەستێ و چەند بڕوانی و سەیرکەی !
گۆشت و خوێنە ؟ یان مۆمیای بێ گیانە
دوا ڕۆیشتنیش ئەم دوو شتە
لە لات جێگەی گومانە !

* * *

کە سەر ئەکەی بە ڕاڕەوی
نیوە ڕووناکی نزما
وەکوو خەوبێ ترسێك گیانت دائەگرێ
ڕیزی باریك هەتاکوو زیاتر بتبا
هەیبەتی شوێن ، قوببەی بەسام ، ڕێی مەڕمەڕ
مەشخەڵی سەرگاردی وەستاو لە سوچدا
خورپە خورپی سەعاتی دڵ خێرا تر ، گورجتر ئەکا !

* * *

هەر خولێك و بەلای چەپا سەر سووڕا
لەسەر چرپای ناو شووشە بەند

"دیمترۆف" لەسەر پشت ڕاکشاوە
چەپکە گوڵ لەژوور سەرا
هەتا سەرسنگ داپۆشراو
دەستێکی دەرهێناوە
ئەڵێی بۆ سەر خەوێکە و ئێستە چاوی لێك ناوە !

★ ★ ★

ئەی پڵنگی سورو سپی ڕاکشاو !
بەپەیژەی دەنگی تۆدا
بولگاریا سەرکەوتە
سەر دوا پلەو دەستیشی
گەییە مانگی ئازادی
ئەی گۆرانیی هەژاران !
هەر بەڕاکشانەوە
تۆی ڕووباری بەهاژە
ڕۆژ نییە لێرەو لەوێ
هەزاران هەزار شەپۆل
هەڵئەسێنیتە سەر پێ !

بەرگەلۆ –1985

# لەبۆدابست دا

ـ 1ـ

لەدوای شەوێك ، خەوی پچڕ پچڕی زڕاو

لووره لووری شەمەندەفەر ،

بەنووزەی درێژ .

زیکە زیکی پێچکە وفیشکەی

لەپڕو ناکاو .

شەقە شەقی دەرگایەکی

دووری دانەخراو .

دوای شەوێکی دەم بەباوێشك

تۆزێ گێژو وێژ ..

وەختێ تازە

هەتاو : کراسی ئەرخەوانیی

ئەکردە بەر :

"بودابست " ی دەمە و بەیانی .

لەناو ئیستگەی پووره هەنگدا

منیش دابەزیم ..

شوێن : گوڵجاڕی ئەو خەونەبوو
پێش چەند ساڵێ دیم .
* * *
سەرنجی لووس وەکوو ماسی
لەدەست دەرپەڕیو ،
خۆی هەڵدایە
"دانووب "ەوە
ناو ڕوباری زیو .
باڵای شیعرم هەر لەڕێوە
خۆی تیا نوقم کرد .
خەیاڵ تۆڕ بوو
هەزار تیشکی
ڕەنگاو ڕەنگی گرت .
لەسەر پردی مەڕمەڕ ڕەش بووی
دێرینەی تاق تاق
بریسکەی دێ
پایتەختەکەی
ڤژ گوڵە مێلاق .
* * *

ـ 2ـ

بۆ کوێ بڕۆم نامۆیی کورد
ئەڵێی سێبەرمە

نیگاکانی پێڵوی تەڕی
پەڕەی دەفتەرمە .
بۆ کوێ بڕۆم کوردستانم
هەر لەگەڵ دایە
لێرەیش —سیروان —
لەهاواری
ناو ـ دانووب — دایە !.
دانووب ! هاتم لە کەنارتا
برین بسرەوێ
لەجۆلانەی
ناوشەپۆلتا
خەوی لێکەوێ .
هاتم خەمی دارستانم
تۆزێ بە بادەم
بەسەر سنگتا
بازبدەم و
وەك منالْ ڕاکەم .
کەچی خۆشیت
تا بە لووزەو
بێتە گیانمەوە
ئاو سەر ئەکا لە پەنجەرەی
هەردوو چاومەوە .

چونکە دانووب ،شاییت بۆ من

عومری دوو ڕۆژە

بەلاّم عومری شەونخونیم ..

ئێجگار درێژە .

٭ ٭ ٭

ئەی "جولیتا " !

کچی دانووب !

بەرگی بەر ساکار

پێست تەنکی ، توێکڵ ناسك

هەناری ئاودار.

سپێنە ڕوون

لاسکی پرچ ، وەك پەلکی چنوور

ئاسکی مالّیی ، سڵ نەکردووی

ناو هۆڵ و ناوژوور .

سەرسام مەبە !

مەلی نامۆی ئەم دەم وچاوە

بالّی ئەویش

وەك ولاّتم

توند توند بەستراوە .

با لاملیش لەشەپۆلی

گەردنت هەڵسوێ

بەلاّم چی بکەم

خەم گرتوێتی و

بزە نایگرێ ،

من ئەزانم تۆو  بۆدابست

لەدانووبەوە

زۆر پەنجەرەی

شیعری جوانتان

بۆمن کردەوە

لەبەر تاوی بارانتانا

درەختی بەژنم

بەو چەند ڕۆژە

گەلای تازەی

وشەی بۆ گرتم .

ئەی پاساری !

جریوەی تۆ ! زمانی ئەوین

کوێرەکانی  بەهرەی وشکی

خستمە هەڵقوڵین

بەلاّم جوانێ کچی دانووب

ڕێگەی سبەینێ

ئەمباتەوە بۆ ولاّتی

خەم تیا نشینێ

ئەمباتەوە بۆ ئەوشوێنەی

گوڵ تیا ئەکوژرێ

کچ لەنسێی هەژاریدا

سیس ئەبێ  ئەمرێ .

ئەڕۆمەوەو یادگارتان

ئەکەم بەسەرین

بۆشەوانی

تەنیاییم و

دنیای خەو بینین .

بەرگەڵو 1986/2/17

# دەفتەری

# گۆرانییە غەمگینەکان

دەروونم خاڵییە وەك نەی دەناڵێ

هەوارێکی چ پڕ هاوارە بێ تۆ !

**نالی**

# کۆست و چرا

ئەی گۆڕ هەڵکەن! ئێستەیش هەرئازاری ئەدەی؟.
کەدوا تەلەبەردی داناو یەکەم خاکەنازە گڵی
هەڵدایە سەر چاوەکانی
گوڵە گەنم فرمێسکی سپی هەڵ رشت و
ئەوچنارەی دڵمان لەسەر هەڵکەنیبوو
پڕ بەدەمی هەزارەها گەڵای وەریو زریکانی .
کەناشتیانی
لەژوور سەرت ڕاوەستابووم
" با" لەلانکەی تەمێکی ئەرخەوانیدا
بەهەردوو دەست تەرمەکەتی ڕائەژەنی !
ستونێك بووم لەودارستانی ئەوینەی
دەوریان دابووی
ـ باچراکە هەر داگیرسێ ونیشانەبێ بۆ گۆڕەکەی .
باچراکە هەر داگیرسێ و فووی لێ نەکەین .
ئەم چرایە لەدوورەوە
ئەستێرەی هیوا پرژێنە و ئەمانبینێ .

* باچراكه هەر داگیرسێ و نیشانەبێ بۆ گۆڕەكەی !
ـ باخەكەمان ناناسمەوە
گوڵە هێرۆی ڕەش هەڵگەڕاو
ملی كەچی  خستۆتە سەر شانی دایكێ
ئەگریجەكانی ئاڵاۆن لەتوتڕكێ وبەری نادەن .
ئەگریجەكانی ئاڵاۆن
لە چەند كێلێكی  ناو دڵی و سەما ئەكات !
ـ شانۆی خەڵوز چۆن بەژنی هەتاو ڕەش ئەكات ؟ !
ـ تەنیا باڵندەیەك مابێت هەر ڤاژووە
چاوتان لێیە ئەوەتا وا باڵەكانی
لەو پەڵە هەورانە ئەسوێ هێشتا سپین !
ئەوەتا وا دەنوك لەو پەنجانە ئەگرێ
كە تائێستە نەبوونەتە كۆڵەوژی  پیرێژنە دۆزەخێكە !
ـ شانۆی خەڵووز چۆن بەژنی هەتاو ڕەش ئەكات  ؟!
گەرووی دەربەند
تا تەنگتر بێت
"با" لەناویا
تیژ تر ئەڕوات و هەڵ ئەكات !.
كەناشتیانی
لەژوور سەرتا ڕۆژمێری
زەردەپەڕم ئەخوێندەوە
چۆن لێم ون  بووی ؟!

ئەوسا هاتی و دەستی پرسیارەکەت گرتم
بەرێو بانی تەمی ئاڵدا ئەتبردمەوە
دەنگی خۆمت ئەدایەوە بەگوێی خۆمدا
ئەتبردمەوە !
" ناتوانم لێت جیاببمەوە ، ئەمە عەشقەو
سەر بەگیانی سووتاوی شیعرم هەڵ ئەگرێ .
لەناو ئەودا ئەتوێمەوە
لەتوانەوەم دا پێت ئەگەم !
ئەبارێم وپەڵە لەناو ڕۆحتا ئەدەم .
ئەمە عەشقە و من ماچی خوا
بەلێوی مەرگی خۆم ئەکەم
ناتوانم لێت جیابمەوە "
هەردەکانم خستە بن هەنگڵی ژانم، سەرکەوتم و درەختەکان،
لەبەر دەمما گڕی عەشقیان لەخۆیان و چەم بەر ئەدا.
"ئاو" بوو بەنووروو بەدیدەی "مەولەوی" یەکانما هەڵڕژا.
بانگی پۆلە ئەستێرەی کاروانی دوورم ئەکرد. ئەهاتن و
یەك یەك ماچی، ئەوڕووبارەیان ئەکردم،
کەلەتەختی ناوچەوانما
ڕێگەی گەرمێن و کوێستانی ئەگرتە بەر.
ناتوانم لێت جیابمەوە
داگیرساوم
"داگیرسان"م بەستۆتە پشت

بەهەر كویێ یەكدا ڕەت ئەبم

ڕووناكی – دا ئەمەزرێنم –!

ـ كەڕووناكی و ڕەنگی زەردی هەژارەكان

تێكەڵ ئەبن

دوو ئاوانێ دروست ئەبێ

نائومێدی تیا ئەخنكێ .

ـ من بەسەردانێك نەهاتووم هەر گوڵاڵەت

لەپەرچەمی كچی تابلۆكانم بدەم .

هەر سەوزە گیاتم خۆش بوێ و

بۆن بەهەناسەی مێخەكی كەنار گەردنتەوە بكەم !

" سەرەتا بوو خۆم هەڵكێشا

لەدوو ئاوانی عەشقی تۆ

كەهاتمە دەر

لەشم هێشوی

سورە گزنگی گرتبوو

لەبەستێنی گۆمەكانتا

شەپۆلم پێچایە سەرو

بیرم لەكام شوێنتا قووڵ بوو

شۆڕ ئەبۆوە و باوەشی ئەكرد بەترسی

تووش هاتووتا "

ـ ئەی گۆڕ هەڵكەن! ئێستەش هەر ئازاری ئەدەی ؟!

كەناشتیانی

لەژوور سەرت ڕاوەستابووم

باڵندەكانیش  هێلانەی چەند ساڵەیان

تێك دایەوەو لەچاو ون بوون ،

ـ من ئەمبینین گریان باڵی

فڕینیان بوو

ـ ئێمە كۆست ناوكی ژیانی بۆ بڕیوین

نەو، لەشم، گیانم،هێشووی سوورە گزنگی

گرتووەو ، چاو

لەقاژوو زۆر زۆر بەرزتر

ئەفڕێ و دیارە .

شانۆی خەڵووز چۆن بەژنی هەتاو ڕەش ئەكات!

گەرووی دەربەند

تا تەنگتر بێت

"با" لەناویا

تیژ تر ئەڕوات و هەڵ ئەكات

1978

# پۆلە ئاوازێکی کۆچ کردوو

"ئـەم شـیعرە لەچـلەی چـوار هونەرمەنـدە بـچکۆلە گـەورەکانی کوردســتاندا و لــەهۆڵی نەقابــەی کرێکــارانی ســلێمانی لەلایــەن شاعیرەوە خوێنرایەوە ."

**کەمن هاتم**

**ئێوە کەستان لێرە نەبوون**

**کەمانچەیەك ناسیمێوە زانیی ماتم**

**هێواش هێواش**

**لەجێگەی خۆیەوە هەستا**

**هات لە تەنیشتی ڕاستمەوە**

**هەڵتروشکا**

**بێخشپە ، سووك**

**دەستی بە گیرفانی دیوانێکما گێڕا**

**چوار سوێسکە شیعری غەمگینی**

**لێ دەرهێنا .**

★ ★ ★

**کەمن هاتم**

**ئێوە کەستان لێرە نەبوون**

"ئۆ کۆردوێن "ێ بەدییکردم
ناسیمێوە،
زانی منم ئەو ئاوازەی
بۆ یەکەم جار
فێرم کرد چۆن دەستی قاسپە و
شەماڵ بگرێ و
بچێت بۆلای نێرگزە جار .
هات لەلای چەپمەوە دانیشت
دەستی بەگیرفانی "لاوك"ێکما گێڕا
چوار نۆتەی قژ ڕەش و زەردی
چاوگەش چاوگەشی دەرهێنا

* * *

کەمن هاتم
ئێوە کەستان لێرە نەبوون
شمشاڵێکی لەڕو لاواز
هێدی .. هێدی
بەدەم ڕێوە
فووی بەزامەکانیا ئەکرد
جارێك سەری
بۆ ئەستێرە کشاوەکانی هەڵ ئەبڕی و
جارێکی تر کڕنووشی بۆ
خوڕە و هاژەی ڕووبار ئەبرد .

گەیشتە لام ، سوڕایەوە
لەپشت سەرمەوە ڕاوەستا
پەڕە پەڕە "حەیران " ێکی
کۆچەریمی هەڵدایەوە ..
بەژێر ڕەشماڵی ئاخێکما چاوی گێڕا
دەستی بردوو
چوار گمەی کۆترە باریکەی
هەناوی "دەروێش عەبدوڵلا" ی لێ دەرهێنا!

★ ★ ★

کەمن هاتم
ئێوە کەستان لێرە نەبوون
تەماشام کرد لەو بەرەوە
ـ باڵەبانێ ـ
لەجۆلانەی خاوکەرێکدا
ئازاری کلووە بەفرەکان ڕای ئەژەنێ !
ئەویش هات و لەبەر دەمما
تروشکەی کرد
دەستی بەناو سنگما گێڕا
چوار هەناسەی ساردو بەسوێ ی
گۆرانیەکانی "ماملێ" ی لێ دەرهێنا
هەستان بڕۆن !
چوار برژانگی تەڕم وتیان

ئەو شیعرو نۆتەو ئاخانە

بۆ کوێ ئەبەن ؟!

لەگەڵ کرووزەی پەڵکە گیا و

وردەماسی و کارژۆلە دا

هەرچواریان پێکەوە وتیان:

ئەی شاعیرە خەمبارەکە !

کەئازیزان گرد بوونەوە و

هەموو هاتن

کەخەم لەسەر کورسی دانیشت

کەبێ دەنگیی سەر ڕوخساری ورد و درشت

وەك سێبەری درەختێکی حەپەساوی

دوای لق بڕینەوەی لێ هات !

ئەوساکە تۆ

لەزمانی گۆپکە و تەلی دڵمانەوە

پێیان بڵێ :

بۆ لەمەو دواو هەتا نووزەمان لێوە بێ

دەنگ وڕەنگ و

سیماو پەنجەی

" کارزان ، ڕێبوار ، ئازاد ، فەرمان "

لەگەڵ لێدانی ئێمەدا  هەموو جارێ

ئەبن بەپۆلە ئاوازی سورو سپی و

لەدەرونی ئەم شارەوە

دێنە دەرێ

باڵ ئەگرن و بەرەو لوتکەی

کێوەکانی گشت کوردستان

ئەکەونە رێ !.

مایسی ـ 1978

# فورات وچەند گۆرانییەکی غەمگین

بۆ "سەعدی یوسف "

## 1ـ ماسیگرە تەنیاکە

لەئاوی بەر زەردەپەڕ دا
بەلەمەکەی لەدوورەوە
سینییەکی درێژ کۆلەی
لووت تیژی لێوار زێڕینە .
لەناکاودا وەك بخلیسکێ
وەك قووت بچێ
لەلێژایی شەپۆلێکدا
دائەچێت و،لەپڕیشدا
وەك هەڵیدەن
سەرفوڕات ئەکەوێتەوە .
ئەی ماسیگرە تەنیاکە !
تۆ لەنێوان شەپۆلی تووڕە و هێمندا
خەمێکی تەمەن درێژی
منیش لێرە لەکەناردا

دار خوورمایەکی تەریکی کورتە بالاَم .
تۆزێکی تر کەتاریکیی چڕتر بۆوە
درەنگانێ کەتۆ نووستی
ئەوسا خەمی  تۆیش و فورات
بەجووت ئەفڕن ودێن بۆ لام .

## 2ـ مامزی ماندوو

پەنجەکانی "با"، بزێون
قژی بۆ دواوە ئەفڕێنن
پەنجەکانی "با"، نماوین
ئاونگ لەچاوی ئەزێنن .
لەفوراتەوە  دێتەوە چاوم لێ یە :
بەپەڵە پەڵەی  هەتاوی
دارستانی دارخورما دا
بەلارە لار ، تێ ئەپەڕێ
نیوەی لەشی لەسێبەردا و
نیوەکەی تر
تیشکی لەسەر هەڵ ئەپەڕێ  .
بەڕێوەیە،
لارە.. لارە
لەمامزی ماندوو ئەچێ
هەردوو دەستی سەتڵ گرتووی

شل ئەبێت و بۆ چەند ساتێ

وچان ئەگرێ .

ئێستەکە ڕێك بەرامبەرم

ڕاوەستاوە

ئەڵێ ی گوڵە هێرۆی سووری

دڵۆپ لەڕوو هەڵپرژاوە .

ئەی ژنە دڵ غەمگینەکەم !

ئەوینی تۆ و ئاوی فورات

نەبوونایە

هەرگیز .. هەرگیز

من ئەم شیعرەم

بۆ نەئەهات.

## 3ـ هاوڕێی بچووك

"حسون" منداڵێکە لاواز

باریك ، سەر خڕ

وەك مارماسی فورات وایە

ڕەنگی وەك خورمای خەستەوی

چاوی وەکوو ترێ ڕەشکە !

"حسون" ئەی هاوڕێ ی بچووك !

ڕووی خۆڵاویی خۆتم تێکە

تەماشامکە

تۆ لەچاوتا
خەمی ئێجگار
گەورە گەورەی تیایە !.

## 4ـ شەوی حکایەت

وەك ئافرەتێکی زراو چوو
"با " ڕا ئەکاو ئەزریکێنێ
قژی درەخت ئاڵۆزکاوە .
شەپۆل چاوی ئەنوقێنێ .
لە ئاسمانی خۆڵە مێشیی سەر فوراتا
وەکوو لۆکە
شی ئەبنەوە پەڵە هەور و
وەکوو پەڕی کۆتری سپی
باڵ کراوی فڕکە کردوو
بلاّو .. بلاّو
دێنە بەر چاو
ئێستە دڵم
وەك هەنارێکی گوشراوە .
ئەمشەو لەبەر تەنیا زۆپای
ژوورەکەمدا،
بەرامبەر دایکە پیرەکەم
دائەنیشم،

چاو ئەبڕمە چاوی کزی.
ئەمشەو شەوی حکایەتە
"لاس وخەزاڵ " میوانمانن
گوێم بۆ دایکم ڕاگرتووە:
کە"لاس " ئەدوێ
کە "لاس " ئەڕوا
دۆڵ بەدۆڵ و
ڕەوەز .. ڕەوەز
من لەگەڵیام.
وەختێ وەنەوز لەناو چاوما
ئەکەوێتە باڵە فڕێ
هێشتا فورات ئەناڵێنێ و
لەولایشەوە
"لاس " هەر ئەڕواو ڕێگە ئەبڕێ.

## 5ـ دراوسێ

"أم سعد " دراوسێمانە
وەك دووکەڵکێش
تەمەنی ئەو ڕەش داگەڕاو
دەم وچاوی
نانی سووتاو.
بالأی لەلقە دار خورمای

وشکەوە بووی
پەنا تەندوورەکەی ئەچێ .
ناسۆرێکە وئازا ئەژی
هەر یەك شتن
دەست و پل و کۆڵە وژی .
وەکوو ڕۆژگاری بیابان
ئەمیش لەبەر کڵپە و گڕا
سیمای داخە .
وەکوو شەوگاری بیابان
ئەمیش قسەی خۆش و فێنك
وەکوو سروەی ڕەزوباخە .
وەك ناعورەکەی ئەوبەرمان
چۆن خول ئەخواو
قەت ناسرەوێ
ئەم "أم سعد " ە یش
ئازارێکە بەپێوەیە و
کەس نازانێ
چ وەخت ئەنوێ!

## 6ـ لەکەناردا

لەناو پەنجەرەی هەورەوە
مانگ وا سەری دەرهێناوە

هێدی .. هێدی

زیو پرژێنی فورات ئەکا

تاڵە تیشکی هەڵ لەرزیوی

بنی ڕووبار

وەك گەردانەن

وەك پلێپلەن

گوڵ و گوارەن .

وەك ژنەکەم ، شەوێکە : مات .

کز دانیشتووین

لەسەر لمی هێشتا گەرمی

گوێ کەناریش

کچە گەورە چاو ڕەشەکەم

دوانزە ساڵان

تریفە ئەیدا لەقژی

کلاّو زەڕی ئەکاتە سەر .

بەچیچکانەوە خەریکە

یەکە .. یەکە

هێلکەی تەڕی شەیتانۆکە

ئەچنێتەوە

ئەوەتا وا

کچە گەورە چاوڕەشەکەم

لەبەر خۆوە

وەکو چەپکە گوڵێ ژاکاو

گۆرانی یەك ئەدا بەدەم فوراتەوە:

"هۆکوردستان ! ..هۆ ژیانم !"

من و دایکی لەیەك کاتا

بەیەکەوە سەر هەڵئەبڕین

بەبێ ئەوەی پێ بزانین

بێ دەنگ .. ئەگرین !

1982

# هاودەم

ئێوارەت باش! ئەی "فورات"ی
لەشاخەوە بەڕێ کەوتووی
هەناسە سوار.
ئەی دایکی ئەگریجە تەڕی .کۆڵوانە! تەم.
ئەی پشتی دەست دەماراویی
شینو دیاری هەردوو کەنار.
ئەی هاوڕێی شڵەژاوی خواروخێچ ڕۆی
دەمێ تیژو
دەمێ هێواش
ئێوارەت باش!

⋆ ⋆ ⋆

تۆ نەبی چۆن.. من ئەم ژەنگی بێزاری یە
کە سەعاتی ژینی گرتووم لێم بێتەوە؟!
هەر تۆی تەنیا لەم مەڵبەندە تەریکەدا
بێمە لاتو گوێم لێ بگریو لەباوەشتا
لەناو جۆلانەی شەپۆلی بێ سرەوتتا

وەك كوڕی خۆت

دەس بەقژی بژما بێنیو

شپرزەییم ڕا بژەنی.

منیش لە سەر خۆو بەچرپە

ئاخو داخی

شیعری خۆمت بۆ هەڵڕێژم

لە قوڵاییو نسێی سنگتا

گڕەی هەناسەم بنێژم.

تۆ نەبی چۆن من ئەم ژەنگی بێزارییە

کەسەعاتی ژینی گرتوم لێم بێتەوە؟!

هەر تۆی تەنیا لەم بەستێنە خامۆشەدا

ئەی هاودەمە شیرینەکەم!

من دڵم پێت بکرێتەوە.

★ ★ ★

لەبەر دەممای چاوم لێتە

وەك لەسەر لا ڕاکشابی

دەستێکت وا لەژێر سەرتاو

ئانیشکت خستۆتە سەر لم.

شەپۆلی نیگات پرشە پرش

تیشکێکی زەرد ئەدەن لە من.

منیش لەسێبەری کڕی

دار هەنجیری گەڵا پانا

که هەتاوی تین تیا نەماو
بە پێ دزکێ بە باڵایدا هەڵ ئەزنێ
ئینجا وەك سەرەتاتکێ
لەناو پەنجەرەی چڵانا
ناو بەناوێ
دەرئەکەوێو دەرناکەوێ
من لەوێدا بەچوار مشقی دانیشتوومو
خەیاڵیشم وردە وردە
وەك خۆری ئیستەی باکوورت
پشکۆ ئاسا
لەناو تۆ دا نقوم ئەبێ.

⋆ ⋆ ⋆

دوور لەیاران
دوور لەوڵاتی گوڵ عومەر
ڕۆژانی ڕەنگ خۆڵەمێشیم تێ ئەپەڕن
پەرت پەرت وەکو دوکەڵی سەر
ماڵانی دێی لای ئێواران.
پەستیی وەکوو قەوزەیەکی
مەڵاسی لینج
گیانی گرتووم.
ئازارێکی گرنج.. گرنج
وەك گرنجیی بەژنی ڕەقەڵەی دار خورما

دڵنیاییم ئەڕوشێنیٚ و
چرۆی هەستم زامدار ئەکا!
گەلیٚ خەونم
وەکوو ماسیی لە ئاو کراو
هێشتا چاویان زەقەیان دیٚ و
بەڵام خنکاو!
ئەم ڕۆژانە وەکوو ژاڵە
لەناو زاری عومری مندا
تامیان تاڵە.
بەڵام ئەی ئازیزانی دوور!
ئەی هاوەڵە شیرینەکان
لەهەر کویٚ هەن
یادتان وەکوو سێبەرەکەم
لەگەڵمایە..
نامەو وێنەی ڕەنگاوڕەنگتان
لەناو گیرفانی دڵمایە.
خۆشەویستیو تاسەی دیداری ون بووتان
دیوانی شیعری تازەمەو
لەناو دەفتەری ناخمایە.

★ ★ ★

شەوباش! شەوباش!
تۆ شەو کوێر نیت

ئەی دایکی نامۆیی‌و سەفەر.
ئەی هاوڕێ
ئەی فوراتی بەناو تاریکیا ڕاکەر.
گەرچی ئیستاکە تەماشام
وەکوو مەلێکی باڵ شکاو
ناگاتە لات
تا مل هەڵسوێ لە ژێر چەنەو
ماچت بکات.
بەڵام هاژەت وەکوو دەنگی
مێژووی بەسام
وەکو دەنگدانەوەی دەربەندی
کپی لەبەر شەوقی مانگەشەودا سەرسام
زوڵاڵ.. زوڵاڵ
ئەگاتە لام
ئەی هاوڕێی قەت نەنووستوو!
من خەوم دێو
ئەچمەوە لای ماڵی چۆڵو
ژووری تەنیای هەناسە سارد
تا سبەینێ لەم ئاستەدا
بەیەکتری ئەگەینەوە
ئەی هاودەمی تاق‌و تەنیای

# چەپگەرد

ئەو ڕۆژەی تۆ
دڵت وەکوو
کانیی گوندێکی چۆڵکراو..
یان پەلو پۆی درەختێکی
بەپێوە گڕ تێبەردراو
یان چۆلەکە باوکەیەکی، زەڕنەقووتە
لەهێلانەدا سەر بڕاو..
یان وەك چاوانی باخانی
(باوەمەردە)و قلیاسانی
ئەو ساتانەی
لەسەرە ڕێدا بۆ نالیو کۆچی نالی
وەك ژنانی سلێمانی
وەکوو ئەرخەوانی سەیوان
هەموو گەڵای قژیان ڕنیو
وەك (تانجەرۆ) بەکوڵ گریان.
ئەو ڕۆژە تۆ

دڵت وابوو
ئەو ڕۆژە تۆ
باوکی هەموو خەمی شار بووی.
هۆرەی گریانی قەرەداخ
لانکەی ژانی
قەت نەسرەوتی
داروبەردی سەرچنار بووی.
ئەی هاوڕێی فەرهەنگی خەم!
لەناو پەرژینی تەمەوە
تارماییمو چاوم لێ یە..
چ ڕۆژێکی وەیشوومەیە
چەپگەردی کۆست ئائەمەیە!
ئەی شاعیری
گەورە کچی شیعری قژ زەرد
جوانەمەرگ بوو!
گەردەلوولی "وەی" ئەمەیە.
ئەی هاوڕێی ئەژنۆ شکاو!
شارۆچکەکەت زۆر بچووکە
کەچی کراسی خوێناوی "کەژاڵ" ی تۆ
لەم ساتەدا!
بە بەری دنیاش گەورەیە!.
ئەی شاعیری فەرهەنگی خەم!

ئەو ڕۆژە تۆ دڵت وابوو
هەر هەمان ڕۆژ منیش وێڵی
دوای شیعرێ بووم
بەژنی وەکوو بەژنی خەمت
کەڵەگەت بێ
وەکوو ژاڵەی بەر پەنجەرەی
ژوری داخراوی کەژاڵ
هەموو شەوێ
چاوی گوڵیان
بەفرمێسکی درشت مەست ئەبێ.
شیعرێ.. شیعرێ
وەك چاوەڕوانی ئاوێنەو
شانەی قژیو
جانتای دەستی
وەك چاوەڕوانیی لاپەڕەی
هێشتا سپی ناو دەفتەری.
وەك تاسەی چاکەتی شینی.
وەك تەنورەی خۆڵەمێشیی
بەرگی سێ ساڵی خوێندنی .
شیعرێ.. شیعرێ
وەك تاسەی قەڵەم بۆ پەنجەی
وەك گوڵەباخ بۆ ئەگریجەی.

وەك چرپاكەی بۆ خەوتنی

وەك شەوقی هەیوانو ناو هۆڵ

چاوەڕوانیی جادەی بەر ماڵ

زەنگی دەرگا..

بۆ هاتنەوەی، دابەزینو گەیشتنی.

شیعرێ، زریكەی تاڵە مووی

قژ ڕاكێشان!

ڕەنگی شینو ڕەنگی مۆری

جێگە داری شانو قۆڵو ڕانی تیابێ.

ڕەنگی پەڕیوی وەك لیمۆی

سیسو گوشراو.

زەردەخەنەی كارتی دەرچون.دوا پرتەی مۆمێ كوژاوە.

دوا هەناسەی ئاسكێ سپی.

شیعرێ ورشەو پرشەی سوورمەی

سەر تەرمەكەی ئەوی تیابێ.

بەڵام ببوورە هاوڕێم

هاوڕێی سەیوان!

ئەی هاوڕێ ی قۆڵ بە قۆڵی

كۆستا كردوو!

ئەی هاوڕێی لەسێ ڕۆژا

ڕیشو سمێڵ

كاكۆڵی قژ

گوڵی سپی گریاو.. گرتوو.
ئەی پەیژەی خەمی بانیژەی
پلە شکاوی حوزەیران!
ئەی ڕەشە ڕێحانەی وشەی
سەرمەزاری گشت "کەژاڵ"و
گشت دڵدارێکی کوردستان.
ببوورە لێم بۆ ئەو شیعرە
ئێجگار گەڕام
بۆ هەر شوێنێ کەژاڵ چوو بوو
هەر جێیە بۆنی گوڵە زەرد
ئەو فژەی ئەوی گرتبوو.
منیش بۆی چووم
بۆ ئەو شیعرە گەلێ گەڕام :
لەپاسی هەژدە نەفەری ڕێی هەولێردا
سەر کورسیەکان
ژێر کورسیەکان
ورد ورد گەڕام .
کۆگاکانی دەوری "قەڵا"
ناو جامخانە، سەر ڕەفەکان
ناو مشتی قوتوی ملوانکە
ژێر نقێمی موستیلەکان
هەمووی گەڕام

بەرباخەڵو کلۆری گیرفانی هەموو
درەختێکی
شەقامی خڕی "شەست مەتری"
پۆل بەپۆلو
هۆڵ بەهۆڵی
زانکۆی زیزی
هەمووی گەڕام
کووچە بەکوچەی چیرۆكو
باخ بە باخی ناو هۆنراوەی.
کتێبخانەکەی "حەیدەری"
هەمووی گەڕام..
لێرەش گەڕام
ژێر چەتری پاسی سەرچنارـ سلێمانی
بست بە بستی کەناری ئاو
ژێر پردەکەی، مۆلگەی ماسی.
دوورو نزیك
ماڵ بە ماڵی دەستە خوشکی
هەمووی گەڕام
ناو ئۆرزدی، سەر شانۆکان
شەقامەکان، کاوە، مەولەوی، تووی‌مەلیك
پیادەڕەوی تەنگو نزمی
دڵ نسرمی

ناو قەیسەری
هەمووی گەڕام.
بەڵام ببورە هاوڕێم
هاوڕێی سەیوان!
ئەی قەڵەمەکەی گوڵ بەدەم!.
ئەی هەڵبەستە پشتێن ڕەشە
ڕیش هاتووەکەی
وڵاتی خەم!.
ببوورە لێم هەرچەند گەڕام
من ئەو شیعرەم نەدۆزیوە
باڵای خەمی بەقەد باڵای
ئەم کۆستەی تۆ کەڵەگەت بێ
وەك "کەژاڵ"ی گڵ بردوشمان
پەری یەکی شۆخو شەنگ بێ.

*لەکۆستی جوانەمەرگ بوونی "کەژاڵ"ی کچی
هاوڕێی شاعیرم حەسیب قەرەداغیدا وتراوە.

# دەفتەری

# سۆزو سووتانی گیان

ئەوەندەی ڕۆحی مەئیوس‌و مەلول تاریك ئەكا دنیا

ئەوەندەیش نوور لە ڕۆحی شادەوە ئەڕژێ بەسەر سەریا

گۆران

# دۆزەخ

ئەو دۆزەخەی خۆشەویستیت
بۆ ئەم دڵەی داخستووە
تیایدا ئەژیم‌و گشت ساتێ سووتاندنم
لەئاوێنەی بڵێسەدا
عەشقێکە: باڵی نور ئەگرێ‌و
خوا دێنێتە پێش چاوانی
ژیانەوەی دوای مردنم!
دۆزەخەکەت دەرگایەکی
لەسەر ئەم ڕۆحە ڕەوەندەم کردۆتەوە
بەهەشت لەوێوە دەستی سەوز درێژ ئەکاو
ئەمفرێنێ و
ئەمباتە ناو هەڵهاتنی سۆزی تۆوە.
"کەسۆزی تۆ ئەمگرێنێ
هەر دوو گلێنەم هەتاویان
تێ ئەکەوێ‌و توانەوەی من لەناو تۆدا
ئەبێ بە گوڵ خەندەرانێ‌و پێ ئەکەنێ"

ئاخ! لەبەر چی من بەبێ ئەو
هەڵقرچانو سوتاندنەی
لەیەك كاتدا
ئەموەرێنێو ئەمڕوێنێ!
تاوێك چییە هەڵناكەمو قەت ناتوانم
ئارام بكەم بە سەرینی
ئا ئەم سەرە گێژەنەی خۆم؟!
ئەی دۆزەخی خۆشەویستیم!
واز لەم ئازارە مەهێنە
ئەو وەرزەی تۆی تیا نەبینم
خوایش نابینم!
شیعری بێ خوا
لەو چەمە مردوانە ئەچن
كەئاو ڕوویان تێ ناكاتو
هەرگیز هەور بەسەریاندا ناگرمێنێ!
ئەی دۆزەخی ژیانەوەم!
واز لەم سەرەی من مەهێنە!
هەڵیگرەو هەموو شەوێ
فڕێی دەرە ناو خۆتەوە..
لەناو تۆدا پێغەمبەرە شاعیرەكان
ئەڵقەی نەمریی بەدەوری
فریشتە گیان سپیەكاندا ئەبەستنو

فێرم ئەکەن چۆن لەکوانووی

یەك وشەدا

دەیان "مانا" داگیرسێنم!

ڕامکێشە ناو لرفەی کڵپەی ئەوانەوە

تابسوتێم ڕوناکترم

هەتا ئازار تێم بئاڵێ

عاشقێکی گەورەترم.

1979

# قەقنەس

دیدەنیم کە

وام لەبەر ژووری دوا شیعرا ڕاوەستاوم.

چڕە دووکەڵی پێچ خواردووی

وەرزە نامۆی ئەم خەڵوەتەم

پەپکە مارن

لەژیلەمۆی ناو قەفەزی سنگما نەبێت

ئۆقرە ناگرن!

دیدەنیم کە!

وەرەو سەرێ بکێشە ئەو تەمەی بێزار بوونم

لەتەونی ئەم دووریەدا

هەڵی ئەپێچێتە گیانم

لوول، لوولم ئەداو

ئەمدا بەدەم ڕوبارێکی سەرکێشەوە

"ڕووبارەکە جڵەوی خۆی

بەدەس زەمانەوە پچڕان

ئەو هەر ئەوەندە ئەزانێ کە ئیستەکە

بخنكێنیٚو دەربەس نییە"
دیدەنیم كە
شانی ڕازم داداوەتە سەر لێواری
تاكە پەنجەرەی نیگای تۆ
من لەوێوە بازی تەماشام ئەنێرمە
سەر سەرەڕێی چاوەڕوانیت
بەم ڕۆژگارە
من ژانێكی كێویلەمو بەكەژی چاوەڕوانیتا
ئەچمە سەریٚو دێمە خواریٚ
دێمە خواریٚو ئەچمە سەریٚ
بەم شەوگارە
كەشتییەكم وەڕس بوونم ئەمپچڕێنیٚو
شەپۆلی وێڵ
ئەمدا بەنووكی تەڵزمە تیژەكانی
ڕۆخی ئازاری دنیادا.
چاوەڕوانتم
"باز ئەڕواتو كەدێتەوە
چاوەكانی لم خواردونی
تۆ ئەزانی لی تینوو هەتا ئیستە
چەند ئاسۆگەی خنكاندووە؟!
چەند هەناسەی دلدارانی وەك "مەولانە"ی
كردووە بەژێر گردۆلكەكانی خۆیەوە؟"

مەولانە نیم

بپرسە مەولانە دێتو

ئەو شارەزای کونو قوژبنی ئازارو

ولاتانی خۆڵەمێشو هەڵوەرینە.

باسنگی خۆیت نیشاندات

جا ببینە:

چ کیشوەرێ جێگەی لەناویا بۆتەوە!

ـ چاوت ئەپەڕێتە پشتی سەرت ـ

ئەو، لە گەشتی بێدەنگیی ناو هەڵقرچانیا

خوا هاوڕێی ڕێو بانی بوو

ئەو، بازێ بوو دوو پرشنگی

لەچاوی خوا کردبۆوەو پێ یان ئەفڕی.

قەقنەسێ بوو

بەرز ئەبۆوەو.. بەرز ئەبۆوەو

هەتا لەشی لەئاتەشگەی

دەروونی یەزدان بەر ئەدا.

لەو سەرەوە لەگەڵ بەفری ڕۆحی ئەودا

کلووی فریشتەی سپی بوو

ئەهاتەوە بۆ سەر زەمین.

ئەی من چیبکەم؟!

مەولانە نیم

فریشتە نیمو

قەقنەس نیم.

باڵەکانی من بەگڕی دۆزەخی لەشم ئەسووتێن.

ـ گیانم ئەوێـ

تەنیا دڵۆپی ئارامی مەولانە بکەیتە گەرووم

بەسە بۆ ئەوەی کە بچمە کۆڵی غەریبو

بەسە بۆ ئەوەی جڵەوی زریان کەمو

کێشی کەم هەتا بەردەمت!

مەولانە نیمو چاو لەخوا نەتروکێنم تا ئەسووتێم

مەولانە نیمو بەکوێریی بچم دەسی چاو ساغەکان بگرم

بیانبەمە بەر بارەگای

نهێنییەکانی مردنو هەرگیز سڵیش نەکەمەوە

ئەو بە بیابانی ئەوت:

ـ وا ئەزانی تینووم ئەکەیت؟

ئەی نازانی من دەم ئەنێم بە پلووسکی

نوورێکەوە، لەسەرچاوەی دڵی خواوە هەڵ ئەقوڵێ؟

وا ئەزانی کلاورۆژنەی خەڵوەتەکەی هیندستانم

لێ ئەگریتو نازانی من

لەهەر کوێ بم، ڕۆژ لەوێیە!

گوڵە بەڕۆژەیە عەشقم

لەگەڵ چاوی پاکی یاردا

پشکۆیە

ئەسورێتەوە

پێت ناگیرێ!

دیدەنیم کە

پزیزکێکی ئەو پشکۆیەم بۆ بهێنە.

ئەی مەولانە!

تۆ ئەوەندە لەبنی کانیی دڵی خوا ورد بوویتەوە

هەتا چاوت لەکالانەی هاتنە دەرێو بوون بە ماسیی

تۆ ئەوەندە گوێت بۆ بانگی دەغڵی برسیو

سۆزی هەژارانی ڕەوەند ڕاگرت،

تابیستنت بوون بەبینین!

ـ کوا مەولانە؟!

گۆمی لیخن دوورگەیەکی خۆی نوقم کرد

کەڕوون بۆوە لەداخاندا لێوی ڕۆخی

خۆی بۆ کرۆشت.

ئیستەش کە ئاو هاژە ئەکات

گوێ لێ بگرە ئەوە گریانە بۆ دوورگەیەو

باسی ئەکات!

دیدەنیم کە!

ئەم هاوارە

بێدەنگەی من، چۆن ئەبیسی؟!

کە وەرس بوون ئەئاڵێتە دیدەکانم

لێڵیان ئەکات!

ئیتر سەرنج ماسییەکانی بنی ڕۆحی

تۆ نابینیٚ

خوام لیٚ دوور ئەکەویٚتەوە!

ـ بۆ ئەوەی لەخوا نزیك بیتەوە

لەدووریتا سەودا سەری سووتانی بەر

چراکەی بە..

بۆیە سامناکیی دارستان

لەچڕیدا خۆی مات داوە.

هەتا هەتاو بە برینداریی بیگاتیٚ.

بۆیە بیابانیش ئاوی ئاوارە کردووە

هەتا تینوو بەخنکاویی خۆی بیگاتیٚ..

دیدەنیم کە

چاوەڕوانتم!

بەغدادی –هاوینی 1976

# کڵپە

بۆ ئەوەی تاقە گەڵایەك بخوێنمەوە
دارستانێك ئەنووسمەوە!
خۆت ئەزانی نە ئەچوویتە ناو ئەستێرکی
چاوی تاقە شیعرێکمەوە
گەر گەرداوم نەناسیایەو، زێو ڕوبارم
بەسەر کێوی، خەمە سەختو خزەکانما
سەر نەختسایە سەر ملەی ڕووتو تینوو.
چ سۆزێکە ئاڵاوەتە
ئەم سەرە دەروێشەی منو
"حاڵ"ە کانی وەکوو ناوم
دوای مردنیش لێم نابنەوە.
ئەم لرفەلرفی سووتانە حەیرانێکە
کڵپە ئەکاو بانیژەی عەشقت جێ یەتی
کڵپەی هاوار چنگ لەچنگی
ئەم زامانەم ناکاتەوە

**هەتا هەڵیان نەگیرسێنیٚ!**

**تۆ بینیوتە چۆن سەری شەو**

**لەناو کۆشی تاریکیدا**

**وەك پشكۆ گەش ئەبێتەوە؟!**

**من بینیومە، بەڵام بۆ دەمم گۆ ناکا**

**بیگێڕمەوە؟!**

★ ★ ★

**بۆیە توانیم ڕێگە دەرکەم**

**ئەو بەیانییەی چاوی تۆم ئەخوێندەوە**

**من لەشەوی ڕابوردودا**

**مراویەکانی —نهێنیـ م**

**لەبنی قووڵ وشەیەك دەرهێنا بوو**

**هەستت نەکرد؟! کەبیناییم خوێندیتەوە**

**چاوت تەڕ بوو!**

**هەستت نەکرد کە لەناو گلێنەتەوە**

**پۆلە وشە دێنە دەریٚو**

**لەسەر کاغەزی بەردەمم ئەنیشنەوەو**

**ئەبنە شیعرو کڵپە ئەکەن؟!**

**بۆیە توانیم قسە لەگەڵ**

**باوبۆراندا بکەم چونکە**

**هەورە بروسکەم پێچابوو لەسەرمەوەو**

**ناڵەو گرمەم**

خستبووه ناو هەناومەوه.

ئەی نەهاتیو خۆت لەگۆمەکەی ناو سنگم

هەڵنەکێشا؟

ئەی کەهاتیته دەرەوه

لەشت گوڵە ئەرخەوانی نەگرتبوو؟

★ ★ ★

بۆ ئەوەی گوڵ ئەرخەوانێ بخوێنمەوه

ڕەگەکانی ئەنووسمەوه.

ئای چیم لێ دێ

هەتا ئەگەمە لای ڕەگێو

نهێنی تاقە یەك گەڵای

ناو سەریم بۆ ئەدرکێنێ

ئای چیم لێ دێ!

1980

# گێژەنگ ـ سووتان

کەدێیت گەرداو لەگەڵ خۆتدا ئەهێنیتو

منیش کەنارێکم کە شەو

لەناو تەنیاییما ئەزێ

ـ چۆن بتوانم شەپۆلەکان ئاگادار کەم؟!

ـ داوـ ئاسمانت لێ نەدزێ

چیم لەدەست دێ؟!

ئەم پەنجانە لەژێلەمۆی سەردەمێکدا

کەوتوونە ڕێ

ئازار ئەدەن بەکۆڵی وشەی سوتاواو

وشەش وەکوو هەژارەکان

نانو ئاویان لەمن ئەوێ.

چۆن بتوانم بگەمە جێ!

هەموو ڕێیەك ئەچێتەوە سەر "بانە" یەك

پاسەوانی چاڵ بۆ ڕوناکی قوربانییە

کۆچەرەکان هەڵ ئەکەنێ..

دامەچڵەکێ!

کەدێیت نیگات پەڵە هەورێکە لەپاشکۆی

ئەسپی شیعرێکی کوژراواو

لەبەر دەمی تەرمی نیرۆدای

سەدەدا دائەبەزێ

دامەچڵەکێ!

ئەی نازانی کێ ئەستێرە لەچیاکانت ئەدزێ؟!

ئەی نازانی کێیە لەسەرمای ناو چاوی منداڵانتا

هەڵ ئەلەرزێ؟!

ئاخ بۆ دەسێ وێنەت لەسەر

لیرەی سوڵتان نە نەخشێنێ!

ئاخ بۆ ناخێ ئاوی شەرمی خۆشەویستیت

لەتاجی شا نەپرژێنێ.

ئاخ بۆ چاوم کەئەتبینێتو ناتبینێ

ئاخ بۆ چاوم کە

ئاخ بۆ..

ئاخ!

* * *

گەر خۆشەویستیت ئەیەوێ

لەگەڵ ئاودا بەیەکترمان بناسێنێ

لەکەناردا لێت ون ئەبم..

پێی بڵێ با بمخاتە ناو گێژەنگەوە

سوڕانەوە لەگێژەنگدا ناموەستێنێ!

گەر خۆشەویستیت ئەیەوێ

بە مردنم بناسێنێ

لەپێخەفدا لێت ون ئەبم

پێی بڵێ با لە هەستاندا بمسوتێنێ

ئەی نازانی سووتان

هەستان ئەوروژێنێ؟!

ئەی نازانی؟!

ئەی!

1975

# سۆز

ـ 1ـ

دڵت هەرێمێكی ساردەو
دوورگەیەكی تاریك‌و دوور
بەم شەوە من: ڕێم كەوتۆتە
ناو ئەم دارستانی بەفرەو
بەرەو لای تۆ
ئەم كوێستانی نامۆییەم
گرتۆتە بەر.
هەنگاو
هەنگاو
بەسەر لەشی
ڕەش‌و سپی ڕمووزنی
ئەم شەوەدا تێئەپەڕم.
هیچ دیار نییە
نەگڕی چاوانی ژوور و
نە ترووسكەی چرای بەر ماڵ

هیچ دیار نییە..
تەنها هەر خۆم
پشکۆی سووری
ناو ئەم بەفرو شەختەڵانەم
"با"ی هەڵکردووی
گڤە تەزیو
ئەمگەشێنێتەوەو.. ئەڕۆم.
قیبلەنمام ئەو سۆزەیە
کە لەکۆچی عەشقی تۆدا
خوا پێی بەخشیم.
"ئەی خوای ڕەوەندە نامۆکان
ئەی کۆچەرە مەزنەکەی
سەر قافڵەی خەمی یاران
پەنجەی نوورت ئاماژەکەو
بیخەرە سەر ناوچەوانی
هەرێمی سارد.
قژی ئەستێرە گرتووی خۆت
بئاڵێنە لەم شەوەوە
با هەڵگیرسێ
دوورگەی تەریکو، چراخان
ڕووناکی کا هەیوانو ژوور
ماڵی تاریک".

ـ 2ـ

بەدوای کۆچتا

من شیعرێکی لانەوازی

ڕەش‌و ڕووت بووم

لەباوەشتا هەڵ ئەلەرزیم.

ساوا بوومو دار بەدەستیش!

بەدوای کۆچتا

من شۆڕەبی غەمگینی سەر

کەنارت بووم

کە ئەگریام هاژەت لەگەڵما ئەگریا.

ئەبووین بەیەك.

هەموو گۆپکەکانم چاو بوون

ئەوەی من دیم

چاوی مەولانە دیویێتیو

کەسی دی نا!

گەڵاکانم هەمووی گوێ بوون

ئەوەی بیستم

هەر گوێی مەولانە بیستوێتیو

کەسی دی نا!

بەدوای کۆچتا

هەر ئەستێرەی نیگا تەڕ بوو

هۆن هۆن جریوەیان ئەڕشت!

لەئاسماندا

من جریوەی چاوم ئەسڕیو

لەزەویشدا

شوێن پێی هەتاوم هەڵئەگرت!

ئەی کۆچەرە مەزنەکەی

سەر قافڵەی خەمی یاران

چاو هی خۆتە

ناخ هی خۆتە

لەناو تۆدا من ئیستاکە

گوڵ خەندەرانی بەیانیم

تۆ بڕوانە

زەردەخەنەم بەڵام ئەگریم!

ـ 3ـ

بە سۆزی تۆوە بانگ ئەدەم

من تەنیامو کاروانیشم

زیندانیمو ئازادیشم

باڵدار نیمو لەناو هەورام

تەنها ساتێ

جێ نزرگەی خۆشەویستیی

تۆم جێ نەهێشت

کەچی دنیاش

هەمووی گەڕام.

ـ 4ـ

ئەی كۆچەرە مەزنەكەی

سەرقافڵەی خەمی یاران

تا ئەوینت ئابلۆقەی گیانی نەدابووم

سەربەست نەبووم!

تا لەچاوتا نوقم نەبووم

باران لەدڵما دای نەكرد.

تا نەچوومە مەشخەڵانی ناو ڕۆحتەوە

نەبوومە تیشك

تا بۆی هەناسەتم نەكرد

نەبوومە "با"و هەڵم نەكرد!

كە لێوم نا بەسەرچاوەی بنارتەوە

بومە شەپۆلی نەسرەوتی

بن بێ قەرار.

كە چریكەت ڕای چەنانم

بوومەلەرزەم خستە پێش خۆم.

لەو دەمەوە

حاڵ گرتوومیو

وەك ئاگری بەر زریانێ

لە لووتكەتا

پەل‌و پۆی كلّپە ئەهاوم

بۆ دێ بەدێ

بۆ شار بەشار.

لەو دەمەوە

من تەوێڵی ئەم گەردوونە

ئەخوێنمەوە.

لەو دەمەوە

من بوومەتە شاری گەورەی

عیشقو ئازار.

1980

# داستانی هەڵۆی سوور

1984

ئادەمیزاد قەت بۆ ئەوە نەخوڵقاوە تا ببەزێ!.

ئەشێ مرۆڤ تێك بشكێنرێ بەڵام هەرگیز نابەزێنرێ.

**ئێرنیست هیمنگوای**

**لەڕۆمانی "پیرەمێردو زەریا"وە**

ـ 1ـ

هەور تەتەرێکە خێرا و مژدەی سەوزی

ئەم بارانە ئەدا بەتۆ

بچۆ بەری

بچۆ بەریو

لەخۆشیاندا تێر تێر بگری!

زۆر دەمێك بوو، ئاسۆ وەکوو

شاعیرێکی تەنیای چاوشین

ئانیشکی دادا بووە سەرکەل

غەمگین.. غەمگین،

بەر پەنجەرەی چاوەڕوانی گەڕانەوەی

باڵندەی وشەی گرتبوو

بەیانیان زوو

ژانی نەنووستووی ئەو، ئەبوو:

بەنامۆیەکی گەڕیدەی سەر هەلگرتووی

شاخو دۆڵی

ولاتی تەم

ولاتی خۆی

لەئەنگۆرەشدا، هەناسەی

ئەبوو بە کزە بایەکی

باوەشێنکەر

بۆ ئاگردانی برینی پڕ لەپشکۆی

سەرنجی وێڵ ئەفڕیو ئەڕۆی

لەو سەرەوە، برژانگی تەڕ ئەهاتەوە

هیچ دیار نەبوو کپو خامۆش

هیچ دیار نەبوو کپ.

هیچ دیار نەبوو

هیچ!

⋆ ⋆ ⋆

باڵندەکان لەکۆچدا بوون

ڕێگە ونو، کۆچ بێ وادە

هەتاو: لەتەما خنکابوو

زەریا: کاروانی قووت دابوو

هەوار: دووکەڵ، وشە: نمەی

نەباریو بوو.

چاوی شاعیر دوو ئەستێرەی

خۆڵەمێشیی، لەناو سەردا

قەتیس ماو بوون.

دەستی شاعیر دوو لقی وشکی
دارێکی لەدارستان بەجێ ماو بوون
یاری شاعیر،
دوو سوێسکە مەمکی سپیلکەی
لەبناردا سەر بڕاو بوون.

* * *

زمان دەمی گوێزانێ بوو
ڕوومەتی ئارامو ئۆقرەی،
کچی خۆری قاش قاش ئەکرد
دڵۆپی سوور تکایە سەر:
شەوی تەمەن
بووکە بە بارانەی خوێنین باڵای تۆ بوو
هەژاری گوند، هەژاری شار
کۆڵان.. کۆڵان..تەلان.. تەلان
ئەیان گەڕان.
ئەی باڵا ئاوێنەی گوڵێن!
تۆ ئەرِۆشتیو چاوم لێ بوو
هەنگاو، هەنگاو لەدواتەوە
مێژوویەکی تازەـ ئەڕواـ !

* * *

ڕایان کرد و ماڵیان چۆڵ کرد
ڕایان کردو ئاگریان بەردایە بێشکە

بێشکە گریاو بوو بەزوخاڵ

ڕووباریان کوشت.

ڕایان کردو ماڵیان چۆڵ کرد

ئابڕوو مەلێکی سپی بوو

خستیانە ناو

قەفەزی سنگی فەرهادێ‌و

هەڵیان گرت‌و بردیان بۆ شا

ئابڕوو سەر پۆشی کێوان بوو

دایان بەسەر تەرمەکەمداو

بردیان بۆ شا

دوای قاقایەك کە "شا" سەرێکی هەڵبڕی

مەلی هێنایە دەرەوەو

لەبەر قاچی شا بانوو دا سەری بڕی

ئەمجارەیان دانەوێوەو

بەسەر پۆشیش

پێڵاوەکانی پێی سڕی!

* * *

ئەوەتا وا

لەپرسەی ڕوبارو شاخا

شایی مەرگ‌و برسێتی‌یە

کات: کوللەیە

چاوی کێڵگەو چرا ئەخوا

ئەوەتا وا

کوردستانم بەلەمێکی سەرگەردانە

ڕوەو گێژو گەرداو ئەڕوا

★ ★ ★

وەرن گوێ لەخوێنم بگرن

تاوانەکان بنووسنەوە

چۆن ئەژمێردرێن؟!

وەرنە سەر منارەی دەنگمو

"قەڵای دم دم" ێکی تازە

بخوێننەوە.

کێ ئەتوانێ گوێی بۆ بگرێ؟!

کەژ کچێکی بسك سەوزی

لەش زێڕینی چواردە ساڵ بوو

بەزیندوویی

ئەیان پەستایە گۆڕەوەو

پڕ بەدەربەند، ئەیزریکان.

★ ★ ★

وا دووبارە هەر هەمان تۆڕ

گرتمیەوە

تۆ ئاورێ بدەرەوە

چۆن تۆڕێکە:

وردە ماسی قەتیس ئەکاو

گەورە ماسیش سووکو باریك

لێوەی ئەچێتە دەرەوە.

* * *

ئێوەی ئەی گەورە پیاوینە

پیاوانی دز

پیاوانی پووت

چاومان لێ یە:

لەناو لنگی تارانەوە سەر دەردێنن

لەگەڵ خۆتاندا وەك جانتای،

ڕەشی دەستتان

ئوتێل.. ئوتێل

شەقام.. شەقام

ڕوو زەردیتان ئەگەڕێنن

ئێوە ئەی گەورە پیاوینە

پیاوانی پووت

چاومان لێ یە

بەڕیز جامانە دائەگرن

دای ئەگرنو پەردە کوللەی دەوری چرپای

سۆزانییەکانی تارانی پێ ئەگێڕن!

من ئەو شاعیرە ناسکەی

ڕابردوو نیم

هەرچی گوڵێ کە هەڵوەری

تێر بۆی بگریم!

* * *

ئەم بەیانییە تەرمەکەی
دوێنێی خۆم ناشت!

ـ 2ـ

ـ "آغا بیا"
ـ بۆچی لێرەین؟!
دەریاچەکەی سەرووی "ورمێ"
ئاسمانێکی دابەزیوو بوو.
پەڕەسێلکەی هیلاکی چاو
نەگەیشتە هیچ لایەکیو ئەهاتەوە
لەخوێ ئاودا، برینەکان، بەبێ ئەوەی فێریان بکەن
ئەیان زانی چۆن دەستی خوێن ئەبزوێنن
بەبێ ئەوەی فێریان بکەن،
ئەیان زانی بەکام زمان خەمی دەریاچە ئەدوێنن
ـ ئەی دەریاچە ناسیاوە نەناسیاوەکە, ئەمانبینی؟
ئێمە دۆستو کەسو کاری،
"گەلاوێژ"ێکین کاروانمان ون کردووە.
ـ "آغا بیا"
ـ "ئێمە لە کوێین"؟
لەبەستێندا ئێمە لم بووین

وێڵ بوون لەدەنگی "گوگوش"دا
دەستی بەسەر سەری نەرمی،
ئاسکی دڵماندا ئەهێنا
بەڵام جەخار! دەرزی هەموو قەوانەکان
لەبرژانگی هەڵکێشراوی خۆمان بوونو
خاتوو گوگوش
بەدێوەجامەی زەردو سوری ئاوازەکان
ڕاوی ئاسکەکەی ئەکردین.
جەخار! جەخار!
لەبەستێندا ئێمە لم بووین
بچووکترین منداڵی "شا"
بەچیلکەیەك:
"پایان"ی لەسەر ئەنووسین!
ـ قوربانتان بین، ئاگاداربن؟
ـ ئێرە کوێیە؟
شەقامەکان ڕیزە تابوتێکی ڕەش بوون
سەرەکانیان کرا بۆوە
لەناویاندا ـ موعینیـ یەکان ڕاکشابوون
کەبەسەریاندا ئەڕۆشتین
دەرلنگی
شەڕواڵە کانیان ئەگرتین
"ئەوە چۆن بوو  نەئەمردین"؟

ـ ئێرە کوێیە؟

سەرەتا بوو: پەیکەری باوكو کوڕەکە دەم بەخەندە

لەسەر سەکۆ هاتنە خوارێو پێشمان کەوتن

جانتاکانیان بۆ هەڵگرتین

لە ئوتێلی ـ ئاریان ـ دا

کام ژوور پۆشتەو ڕازاوە بوو

بۆیان گرتین

ـ سوپاس، سوپاس!

وەختێ ئەوان گەڕانەوە سەر سەکۆکە

کۆنە زامێکی مەهاباد زۆر بەپەلە هاتە لامان

ـ دەخیلتان بم چاوم لێ بوو

کە باوکەکە چاوی لە کوڕەکە داگرت

دووسێ کەڕەت چاوی داگرت

دەخیلتان بم چاوم لێ بوو

دەخیلتان بم!

ـ ئێرە کوێیە؟

کۆتایی بوو، پەیکەری کوڕو باوکەکە دانەبەزین

پشت لەئێمەو ڕوو لەپیاوە پووتەکانمان

هەڵ ئەپەڕین

کوژراو بووین و هاوارمان کرد

کوژراو بووینو ئەمانبینی:

ـ ئەوە مێزەرە سپیەکەی" محەمەدە"

بۆتە دەسماڵی سەرچۆپی

مەرگێکی سووری دووبارەی

بەهاری شار

ئەوە چۆغەی موعینییە،

بەسەر ئەسپی "قودسی"یەوە

دەوران ئەکاو

جارێکی تر

ئەیجۆشێنێ کۆتەڵی شار!.

⋆ ⋆ ⋆

ئەی تفەنگەکەی "موعینی"

تەنها ئەو وەختە ببوورە

لەپیاو کوژان

گەر توانیان جارێکی تر

"موعینیت" بۆ بهێنینەوە

بتکاتە شان.

⋆ ⋆ ⋆

بەدڵدارانی شەم بڵێن

حەریقێ بەربۆتە دڵم

هەر کە ئەدوێم

ئەبێ بە وەرزی ژیلەمۆو پشکۆ بارین

بە دڵدارانی شەم بڵێن

لەبەر بۆنو بۆکروزی جەرگی منە

باخان چاویان پڕ ئەبێ لە ئاوو، کەژان

هەموو وەکوو دایکم ئەگرین.

بەدڵدارانی شەم بڵێن

با بە دەرونما هەڵگەڕێن

بەڵام هێواش، نەبا پەیژەی

ئێسکم بشکێ

وا ئەکەوم!

بەدڵدارانی شەم بڵێن

با دەس بەنە پەلی شەمو

لەناو دڵما دەری بێنن

دەری بێنن

با بسووتێم ئەو نەسوتێ!

★ ★ ★

خۆ ئەمبینن!

من سووتاومو لەسەر تەختی ناوچەوانم

گوڵان ئەڕوێن

ئەی دڵدارە ئاوارەکان!

تەماشاکەن

وردبنەوە کام گوڵ، شەوقی چاوەکانی

ئەگاتە شەوقی چاوانی،

گوڵاڵەی خوێن.

ـ 3ـ

هەرێزی شەو بە لەشتا ئەتەنێتەوە

تۆ خاکێکی بەبڕشتی

هەموو وەرزێ

هەر یەکو سەد گوڵە ژانی تازە ئەبڕی

هەرێزی شەو بە لەشتا ئەتەنێتەوە

تۆ پردێکی ڕەشپۆشیتو

بەم ڕۆژگارە

خەمی سووری ئەم شاخانە

بەسەرتا ئەپەڕێتەوە.

⋆ ⋆ ⋆

لەم شەوەدا درەختەکان بیناییان:

وەکوو شوشەی چرایەکی دووکەڵ خواردوو،

نابینێتو هەر کەهەنگاو هەڵ ئەهێنن

بەسەر یەکدا ئەکەونو پەل ئەکوتن

هەر تەڵەزمەو ئەچێ بەچاوی گەڵادا

دارستانێ هەمووی کوێرە!

لەسەر ترۆپکی شاخەوە

کەشوانەکە دائەگەڕاو

قۆڵی ئەکرد بەقۆڵی گۆرانییەکانیا

گاڵۆکەکەی ئەکرد بەسەرینی دەستی

ئەوسا ئیتر دارستانی دار بەڕووەکان

هەڵ ئەپەڕن، ئەیان زانی،
هیچ ڕووبارێ شەپۆلی لێ نەمردووەو
هیچ دڕکێکیش نەیوێراوە
سەر بکێشێتە ماڵی هیچ گوڵێکەوە
ئیتر هەتا گۆرانی شوان
کڵاوی قوچی لاوکو حەیرانەکەی،
لارتر لەسەر سەری کەژو
گردۆلکەکان دابنایە
سەمای بەفرو قەڵبەزەکان
باوەشیان ئەکرد بە ملی کوردستانداو
گەنج ئەبۆوە ئەم دنیایە.

* * *

لەم شەوەدا بەرانە کێویی شاخی خۆی لێ بۆتە تەوق
ئەوەتا گشت پێ دەشتەکان وەك ڕانە مەڕ ئەبڕنەوە
شانەی هەنگو هێلانەکان
بۆ دورگەی مەرگ ئەگوێزنەوە.

* * *

ئەسپەکان چۆڕ چۆڕەی فرمێسکیان
کەوتە بن سمەکان
تەوێڵیان وەك ئاڵای جێ ماوی ئۆردویەك،
لەغاردا جێ هێشتو کەوتنە ژێر لمەوە.
ئەسپەکان حیلەیان لەقوڕگیان جوێ بۆوە

مێخەکان سواریان بوون
بڕوانە ئاوزەنگی چۆن لەپاڵ ئاخوڕدا
بۆ قاچی سوار ئەگری!
"ئەسپەکان زریانی تووڕە بوون
لەبەر پێی زەمیندا مەحاڵیان یخ ئەدا"

* * *

تۆ گوێ هەڵخە بابزانم
کوروزانەوەی گەنمو ئەم زەمینە
چۆن لەیەك جیا ئەکەیتەوە؟
ناڵەی پەلکە گیاو ئەو شیعرە
بەچیدا ئەناسیتەوە؟
تۆ گوێ هەڵخەو من پێت بڵێم: گوێت لە چیە!

* * *

لەسەرانسەری وشەدا بزوتنەوە قەدەغە بوو.
حەرفێکی زۆر خرانە ناو خودەکانی ئۆردوگاوە.
زەردیان گرت
سووریان کوشت
شین هەر بەپرچی خۆی هەڵواسرا
سەوز ئاوارەی وڵاتی گریان کرا
لەسەرانسەری تابلۆـ وشەدا
بوو بەپرسە!

* * *

کە گۆڕیچەی گوڵەکانیان هەڵدایەوە
تیایاندا بوو نەژاکا بوو
چاوم لێ بوو بولبولێ بۆ
تەرمی گوڵێك ئەگەڕا
کەدۆزییەوە پێ یان وت: چۆن ناسیتەوە؟
ئەم ناونیشانەی هەڵدا:
گوڵ ئەستێرەی سلێمانی دابوو لەسەر
مانگی پاوانەی سابلاخی لەقاچدا بوو
کراسی گۆمە شینەکەی وانو ورمێی ئەکردە بەر.

* * *

ئێوە بڵێن
ئەو پۆستەیەی کەخوێنی خۆم ناردبێتی
نەیگەیێنم؟
ئاوێنەیەك سیمای شاخو هەردەکانم
لێ بگۆڕێ
نەیشکێنم؟

ـ 4ـ

وا ئیستاکە
فوراتو دڵم دراوسێن
ئەو سترانێکی غەمگینەو
شەپۆلی کەنار ئەی ژەنێو

دڵیشم ژوورێکە تاریك

تاریك وەکوو گوندی قەندیل.

شەوانێکە

خەم چاوی خەمی تەنیشتی تیا نابینێ

من لە ناو  خەڵوەتی "مەی"دا

هەموو شەوێ، دائەگیرسێم

پێك چرایەو ئەیخەمە شوێن نەهێنیەکان

ملی خەیاڵ.. بەرەو گەردوونی ناوەوەی

گیانم ئەنێم..

کە پێك هۆشم ئەخواتەوە

ئەستێرەکان ڕام ئەژەنن..

کە پێك سەرم لەم نەخشەیە ئەکاتەوە

بەدوای یەکدا خەونەکانم

لەسەر مێزی  وەنەوزدەری

بەردەمی دوای

نیوە شەوم دائەبەزن.

ئەتوێمەوە

ئەی گیانی من.. خۆت ئەزانی شەوانێکە

خەم چاوی خەمی تەنیشتی تیا نابینێ

شەوانێکە رایەڵی ئازارەکانی

بێ سنوورو کۆتاییە

من مەستێکی بێقاچم و

شوێن کەوتووی دوای تەرمی خۆمم

نارۆمەوە

گلێنەکەم خۆت ئەزانی

ماڵم هەیە هەتاکوو من بڕۆمەوە؟

شەوانێکە بەتەنیا پێك

مەگەر ئازارم سڕ بکاو

لەسەر ڕانت تەنها تاوێ

گێژەنی ناو سەری ماندووم بسرەوێنێ

فریشتەکەم  بێنە ڕانت

من ئەمەوێ ئیستە بنووم

من ئەمەوێ ئیستە..

من ئەمەوێ..

من..

م..

⋆ ⋆ ⋆

سەرنج ڕووا

بۆ نەهاتی؟

تا هیچ نەبێ گوێیەك بگری،

لەو لاوکەی کە ئیستەکە

لە شمشاڵی شوانێکەوە

لەقەدپاڵی بێ دار بەڕووی کەژەکاندا،

ئاوازە ئێش لەسنگمەوە هەڵ ئەمژێو

ئەیرِێژێتە ناو سەنگەرە چۆڵەکانی فەرهادەوە
ـ نە فەرهاد دیارەو نەشیرین ـ
بۆ نەهاتی؟
من ئەترسم وام لێ بکەی کە وەرزەکان
بە چوار دەستە تەرمی غەریبیم هەڵ گرن
هەڵیگرن‌و ئێوارەیەك.. بەخۆرنشین
خۆیان بکەن بە ناو گیانی ماتی تۆدا
من ئەترسم لەو ساتەدا
بەفر رِێگەی دڵدارانی  شارەکەمی گرتبێت‌و
کەس دیار نەبێ
زوقم‌و سەرما دەست‌و پەنجەی
درەختی لەگۆ خستبێ
مەل‌و باڵندە دیار نەبێ
نیگام رِووا
بۆ نەهاتی؟
وابووم بەهەڵمی سەر فورات
بۆ نەهاتی؟
* * *
ئارام هەورێکە بەپێچ و ژارو ژەنگە
بارانی تیا بەند کراوە
هێلانە چۆڵەکەی دڵی باوکێتی من
زەردە مارێ وا لەناویا

باڵی فڕینم بەستراوە

دێمەوە لات؟

ئەی "هەڵۆ" گیان دێمەوە لات؟

دەستەکانم دوو لقی وشکی درەختی

تینووی لەشمن

لەکەناری دوورگەی لمدا ئەبنە زوخاڵ

نەهاتە ساڵە هەڵۆ گیان نەهاتە ساڵ!

شارە مێرووڵەی قلێشی بەردەمی من

داویانەتە چاوی ئاوو دەری دێنن

تاریکستانە هەڵۆ گیان تاریکستان

بەسەر سەرما ئەی هەڵۆ گیان

داڵەکان خووڵە خولیانەو لەئێستەوە چاوەڕوانی

دەم بەیەکدادانم ئەکەن

ئەیانبینم.. نزم ئەفڕن

ئەیانبینم.. دێنە خوارێ

چۆن بتگەمێ ئەی هەڵۆ گیان چۆن بتگەمێ

ڕێگەکانی نێوان منو چاوانی تۆ

بەدارستانی نێزە تەنراون

ڕێگەکانی نێوان منو گۆیژە

چەقۆن چەقۆ!

دە روخساری گریاناویی خۆتم تێکە

با ئەم شیعرەم پەڵەی خەمێکی تر بدات

من ئەزانم هەر کڵۆڵی و

شیعرت بۆ بەجێ ئەهێڵم

ـ وەك باپیرەت بۆی جێ هێشتم ـ

نەهاتە ساڵە

هەڵۆ گیان

نەهاتە ساڵ.

من نازانم ئەی هەڵۆ گیان

دێمەوە لات،

دێمەوە لات؟

⋆ ⋆ ⋆

سلێمانی گەڕەکی ئەزمڕ ـ ژمارەی خانوو 224

دایە!

دایە!

کوڕەکەت ئێستە قەقنەسەو

لەمەخفەرێکدا ئەسوتێ

کوڕەکەت زامێکە وێڵ و

بەم ڕۆژگارە

لەگوێ فورات

دەس بەپرچی خەما دێنێ و

سەر کوڵمەکانی ماچ ئەکات.

دایە! فورات هاوڕێمە

نامۆیی من ئەخواتەوە

شەو دێ بۆ لام

لەتەکمەوە لەسەر چرپا شکاوەکەم

ڕائەکشێ

ئای کە دڵم ئەداتەوە

تا درەنگان، تا نەزانێ

باڵە فرێی خەو لەچاوما خاو بۆتەوە

جێم ناهێڵێو ناڕواتەوە

دایە! فورات دەرگای دڵی،

پەنجەرەی سەر شەپۆلەکان

هەر بۆ غەریبە وێڵەکان ئەکاتەوە

ئەو کە ئەڕوات

ئاوڕ لەوان ئەداتەوە.

دایە!

دایە!

مادام فورات لەگەڵمایە

مەراق مەخۆ

وابزانە خۆتم لایە!

دایە توخوا لەبیرت بێ

کەچوویتە لای گۆیژەو ئەزمڕ

پێیان بڵێ

شێرکۆ ئەڵێ!

**بۆ ئەو شیعرەی پێیان وتم**
**داومەتە دەست شەپۆلەکان**
**ببەن، بیگەیێنە" سیروان"**
**لەبێ دەنگیی نیوە شەودا**
**لەوکاتەدا..**
**کەمانگ شەوقی چراکەی دەستی خۆش ئەکاو**
**بە کۆلانی پەڵە هەورا تێ ئەپەڕێ**
**لەو بەرزەوە**
**ئیستێك ئەکاو**
**سەرنج لەگوندێکی سوتاو ئەگرێ**
**لەوکاتەدا با گوێ هەڵخەن**
**گوێیان لەو هەڵبەستەم ئەبێ!**
**تێبینیەك:**
**پێ یان بڵێ**
**بەتایبەتی**
**فورات سلاویان لێ ئەکا!!.**

★ ★ ★

**ئەمرۆ فوراتم ڕوون بینی**
**تێ ئەپەڕیو ئەی وت: کاکە**
**نە ڕنو بەفری کوێستانان ئەچێتەوەو**
**نە ئاوی من ئەبڕێتەوە!**

ـ 5ـ

لەو ڕۆژەوە کە شاخو داخ دارستانی بەریان دڕیو

وەکوو کۆمەڵی چەتەوڵ لەبەردەمی شیرەکاندا ڕووت بونەوە

پاڕانەوەو کەوتنە سەر چۆك، لەو ڕۆژەوە ڕەوەز گریا.

کەژان قژیان دەسکەنە کرد، بەپۆل هەلۆ سەریان هەلگرت.

سەنگەرەکان ڕایان ئەکرد. قەڵەم ملی وشەکانی خۆی

ئەقرتان. شەپۆل هاواری ئەکردو ئەیقریشکان. لەو

ڕۆژەوە کە کانیەکان، لێلایی چاویان داهاتو کوێر

بوونەوە. قولاپەکان یەکە یەکە ماسی گیانی

گۆمەکانیان دەرئەهێناو هەڵیان ئەدڕین.

وەردو کێلگە بوبوون بەئوردوگای کوللە

گرد بەگۆڕستانی کوللە. تفەنگەکان سەر

بەرەو خوار هەڵ ئەچنران. هەتا ئەکران

بەهەرەمی دیوەخانی والیو سوڵتان.

لەو ڕۆژەوە ئیتر ترس

ئەم زەمینەی تەلبەند کرد و

بێ دەنگی بوو بە پێشڕەو و

یاسای ژیان

لەو ڕۆژەوە! چرا مردوو

بارگەی هەڵدا تاریکستان!

* * *

لەو دەمەدا

پیاوانی خوێنو هەتاو دز.

پیاوانی پووت

پیاوانی بیر عەمارە پۆ

لەناو لنگی سۆزانییەکانی تاراندا

لاسلکییان بۆ یەك ئەکرد،

شفرەی هەرەسیان حەل ئەکرد.

لەو دەمەدا

لەسەر شەقامی "پەهلەوی"

لە"خانەدا"

چاومان لێ بوو

جرتیان بۆ "هەندرێن" لێداو

کێریان نیشانی "زۆزك"دا!

* * *

لەیەك کاتدا

دوو شاعیر بووم لەناو خۆمدا

لەو ڕۆژەوە

دەستکێشێکی ئاسنینم لەدەست کردو

دەستم بەناو دڵما ڕادا

گەڕام.. گەڕام

هەتا ملی شاعیرە خۆش بڕواکەم گرت

هەڵم کێشاو دوور تورم دا.

* * *

ئەو شێرەی دەستی پەڕاندم

فێری کردم

شیعرەکانم

بکەم بە شێر!

* * *

هاوڕێکەم!

بۆت نووسیبووم

بە کێوەکانی شیعرەکەت

بڵێ، بۆچی

پەستن... ئەگرین؟

بۆ نازانی

ئەی هاوڕێ؟!

ئەو کێوەی هەڵۆی تیا نەبوو

پێ ناکەنێ!

* * *

هاوڕێکەم!

ئەمڕۆ دار خورمایەك وتی:

با بیابان جێ نیشتەم بێ

کە خۆشەویستی ڕەگی خۆی

بەئازارا شۆڕ کردەوەو

گەیاندیە ئاو

باڵندە خۆی پەیدا ئەبێ و بۆم ئەخوێنێ

"با" خۆی دێتو ئەمدوێنێ

★ ★ ★

هاوڕێکەم!

بۆ لات سەیرە؟

زۆر جار سیاسەت پیاوێکە کەتەو ورگن

شەپقە لەسەر

پیرەو بەڵام گەنج ئەنوێنێ

ئەم کابرایە

ئەفەندیەو سەر ڕووتاوەو

جانتا بەدەس

سەد گیرفانی بۆ جلەکانی کردووە

هەرچی زمانە پێی ئەدوێو

ناویشی:

ـ بەرژەوەندی ـ یە!!

★ ★ ★

هاوڕێکەم؟

ئەوەتا وا

سنورەکان بوون بە گاسن

بەسەر کێڵگەی لەشی مندا

دێنو ئەچن

وەرە پشتم هەڵبەرەوە

چی ئەبینی

ـ چۆن نازانم!

نەخشەیەکی کوردستانی

ئەنجن.. ئەنجن.

ـ 6ـ

هەفتەو هەفتە

بەغدا ئیزگەی دابەزینی نامۆییتە

تۆ "نەورەسێکی" ئاوارەیت خۆت لەدیجلە هەڵئەکێشی

دیجلە خەمێکی ڕەوانە

دڵت ئەدەی بەدەمیەوە

سەرت ئەخەیتە ژێر باڵی،

شەپۆلێوەو خەو ئەبینی:

ئەچیتەوە کۆنە هەوار

سەرنج ئەدەی ئەوا"بڵباس"

بەملەدا دا ئەگەڕێ

ئەگاتە پەلکە ڕەنگینەو تیا ون ئەبێ

دێتە دەرێو جلەکانی زەردو سورە

لەسەر لووتکەش تفەنگەکان

سەریان لەگەڵ هەوری ئاڵدا ـ یەکانگیرە

بەڕاکردن

بەهەورازدا هەڵئەگەڕێی

بەدەم هەناسە بڕکێوە

سەر ئەکێشیتە ناو هۆبەی ڕەوەندەوە
لێو: گزنگی بزە ئەگرێ
ئەم تاوڵە هەڵ ئەبژێرێ
"کاڵێ" ی چاو ڕەش ئەبینیتو
دائەنەوی و سووك سووك
ئەچێتە ژورەوە
بەبێ قسە..
ئاگری لەگەڵدا خۆش ئەکەی
وردە وردە
سەرت ئەبەیتە پێشەوەو
بۆنی مێخەك بەنگی سینەو
گوڵاوی نێو مەمەی ئەکەی
چاو دائەگریو
چاو دائەگرێ
ئەسپە مارۆی بەردەم دەوار
ئەحیلێنێ
زەنگی دەروونتان لێ ئەدا
دێیتە دەرێو لەمێخەکەی ئەکەیتەوە
خۆت هەڵ ئەدەیتە سەر پشتیو
"کاڵێ" فەقیانە هەڵ ئەکاو
لەسەر لا دێتە بەر دەمتو
بەپێ دەشتی سەوزو وەردا

ئەدەیتە غار

ئەو سەر ئەنێ بە دڵتەوەو

تۆش دڵێکی بن بێ  قەرار

ئەسپە مارۆ، ئەسپی داستان

باڵ ئەگرێتو ئەفڕێو ئەچێتە سەر لوتکەی

"سەکری سەکران"

* * *

هەفتەو هەفتە

بەغدا ئیزگەی دابەزینی نامۆییتە

زامەکانت گوڵە ژاڵەن

ئەیانکەی بە چەپكو لەسەر:

مەزاری یادی کۆچ کردوو دایان ئەنێی

بە دیاریەوە دەستت ئەخەیتە ژێر چەنەی

بیرەوەری‌و

لەبەر خۆوە.. شیعر ئەڵێی

* * *

هەفتەو هەفتە

بەغدا ئیزگەی دابەزینی نامۆییتە

تۆ تەنیایتو.. تەنیایت وەك:

جوانوویەکی لە رەوگە دابڕاو وایە

بە چوار دەورا کورڕژن ئەکاو

ڕەوگە ونە!

کوا هاودەمێ ئەم ئازارەت ڕابژەنێ؟
بەغدا گلۆڵەیەك دەزووی ئاڵۆزکاوە
وەك وەڕس بوونی تۆ وایە.
ئای لەو تەونی بێزاری یەی
لەم نامۆیی یە ئاڵاوە
کوانێ کچێ شپرزەییت ڕابژەنێ؟
گوێی بۆ بگری
ئەو گۆرانیی ئاوارەکان بۆ تۆ بڵێ‌و
تۆش بێ دەنگ‌و تەنها جار جار
چاوی تەڕی بۆ هەڵبڕی.
گولاڵە خان!
گولاڵە!
گولاڵە!

⋆ ⋆ ⋆

شەقامی"سەعدون" سەعات چوار
سەعات پێنج
سەعات شەش
شەش‌و نیو
خەمێکم گەش

⋆ ⋆ ⋆

لەتەکتام‌و بێ دەنگ ئەڕۆین
لەنێوانی هەردوکماندا

تەنها پەنجەی تێك ئاڵاوی
دەستمان ئەدوێن
من ئازارە زەرد باوەکەی
"بەغدادی" نیم
لەئیستەدا
خەمێکم گەش، خەمێکم سەوز
لەتەکتام‌و بێ دەنگ ئەڕۆین
کەتۆم خۆش ویست
خۆم لەلا خۆشەویستر بوو.
بێ دەنگ ئەڕۆین
ئەم بێ دەنگی‌یە.. هاوارە
ئەم بێ دەنگی‌یە.. تەنیاییم ئەشڵەقێنێ
ئەم بێ دەنگی‌یە.. لەسەرخۆ ئەمسوتێنێ
لەتەکتام‌و واهەست ئەکەم
یەکەم جارە سەرنج لەم دنیایە ئەدەم
یەکەم جارە هەست بەخورپەی خێرای دڵ‌و،
بوونی جەستەو هەناسەی سنگی خۆم ئەکەم
یەکەم جارە کە ڕەنگەکان بەدی ئەکەم:
درەختەکان سەوز ترن
گوڵە باخەکان سوورترن
ڕێبوارەکان زۆر جوان ترن
ئەو کۆشکانە بەرزترو

شەقامەكان درێژ ترن!

⋆ ⋆ ⋆

ئەی شاعیرە ئاوارەكە

سەرت نوقمی ناو قژی كە

لەبن تاڵە قژەكانتا نیگاكانت بكەرەوە،

وەك چۆن لەبنی ڕووبار دا هەڵیان دێنی.

لەوێ وردە ماسی ڕەنگین

لێرەش خەونی ڕەنگاوڕەنگی

عەشق ئەبینی.

ئەی شاعیرە بێماڵەكە!

پەنجەرەی سەر مەمكەكانی بكەرەوە

سەرت بخەرە ناو سنگ‌و بەرۆكێوە

بۆنی ئارامێ هەڵ مژە

بۆنی هیوایەك هەڵ مژە

كەتەنها هەر لەناو سنگی

بێوە ژنەكەی دایكتدا هەڵت مژی

⋆ ⋆ ⋆

گوڵاڵە گیان!

ئەو عەشقەی تۆ هەتاوێ بوو

خۆی كرد بەناو تەم‌و مژی گیانی مندا

بووم بەسامااڵو پێ كەنیم.

عەشقی تۆ بوو

رووی گرژو مۆنی ڕۆژانی —بەغدادیمی-

ڕوون کردەوە

بووم بە لاولاوو بە باڵای

خۆشەویستیدا هەڵژنیم.

عەشقەکەی تۆ

دەستی وشەی پەرەوازەو وێڵی گرتم

ئەوان بێ پەناو داڵدە بوون

جێت لەدڵتا بۆ کردنەوە،

⋆ ⋆ ⋆

نائومێدیی بەستەڵەکەو شاخی شەختەی

پاچو پێ مەڕە نایبڕێ، ناکرێتەوە

عەشقی پیرۆز بەخێرهاتی!

وەختێ لەچاوما هەڵهاتی

تەماشاکەن!

ئەوەتا واشاخی شەختە بەرەبەرە

ئەکرێتەوەو ئەتوێتەوە.

ـ 7ـ

گیانم قەوزەیەك گرتبووی

وەکوو چنگی قرژاڵ وابوو

نەم ئەتوانی بچمە ناوی‌و پەل بهاوم

نەم ئەبینیت

تۆ لەتەنكاوا ناژیتو فێری ناخیت

تۆ مرواریت

ئەم وت تازە ناتدۆزمەوە

ئەم وت.. هەرگیز جارێكی تر

لەو زنەی نیگا ڕوونانەت ناخۆمەوە

ئەم دیواری شەوە زەنگە

چۆن ئەڕووخێ؟!

سی ساڵی تر؟ چل ساڵی تر؟!

ئەم وت، هەواری خۆڵەمێش

چۆن ئەبێتەوە بە ئاگر!

چاویلكەكەم قەترانی بوو،

بەفریش وەكوو پەڵە خوێنی وشكەوە بووی

سەر ڕانكو چۆغە شینكیەكەم

ڕەش، ڕەش ئەینواند

گیانم قەوزەی وەڕس بوونێ

تێی ئالأبوو

دایكم ئەیویست بە نینۆكە تیژەكانی

بیڕنێتو ئاسوودەم كات

من حەوزێكی پڕ گومانی

لیخن بوومو

ئەویش ئەیویست دەرم بدات!

* * *

لەسەر سنگت تۆپی ئاسنە شەوانی دورە وڵات

ڕائەکشایت، چاوت ئەبڕیە: وێنە دێرینەکەی دایکت

ئەتویست بچیتە چاوێوە. ئەتویست لەناو قژیا بنووی

ژێر چەنەکەیت ماچ ئەکرد

لە پڕێکدا، وەك تارمایی

دەستێك ئەهات

دەستی جانەوەرێ، تووکن.

درێژ ئەبوو، چوار چێوەی وێنەکەی ئەشکان.

سەرپێچەکەی. سرکەییەکەی، کڵاوەکەی

دا ئەگرتو دەسماڵەکەی ئەکردەوەو

لەبەر چاوی تۆ ئەیسوتان.

ڕائەپەڕیت

وەك شێتو هار دەرئەپەڕیتە دەرەوەو

لەکەنار دا  دائەنیشتیو

لەگەڵ فوراتدا ئەگریایت!

★ ★ ★

ساڵی داڵە کەر خۆرەیە

پۆل.. پۆل ئەفڕن

ئەنیشنەوەو

دەنووك لە چاوی شاخ ئەگرن.

ئای شاخی تانە لەسەر چاو

شاخو داخی هەڵۆ کوژراو

هەتا ئیستەش
ئازارێکی چەند بەسامی!
⋆ ⋆ ⋆
هەتا برین قووڵ بێتەوە
مەرگی چەقۆ نزیکترە
تا بەخشینی گیان کەمتر بێ
ڕێگەی خۆرەتاو دوورترە!
⋆ ⋆ ⋆
ئەوەی هەتاوی ناسیوە
وڵاتی تاریکیی دیوە

ـ 8ـ

درەنگە.. درەنگە.. درەنگە.. درەنگە..
زۆر درەنگە
مێژوو ڕووی ئەکردە خوێنو وای پێ ئەوت.
ڕێو بانەکان ڕوویان ئەکردە ڕێبوارو
وایان ئەوت
ئابڕوو ئەبوو بەئافرەتێ قژ ئاڵۆزکاو
بەرۆك دڕاو..
یەخەی شارو گوندی ئەگرت، ئەوەی ئەوت.
وشەکان ڕوویان ئەکردە قەڵەمەکان
وایان ئەوت.

منداڵەکان ڕوویان ئەکردە گەورەکان

وایان ئەوت:

درەنگە.. درەنگە.. درەنگە.. درەنگە..

زۆر درەنگە

* * *

شورەی چین‌و هەرەم‌و کۆشکەکەی بابل

یەکەم جار تەنها بەردێك بوو

بناغەیان

ئەو شاخەوانەی یەکەم جار

سەرکەوتە سەر لوتکەی ئەڤرست

چۆکی دادا بەو چیایە

ئەویش تەنها بە یەك هەنگاو

دەستی پێ کرد.

هاوڕێکەم!

کانیەکانی وڵاتەکەم خۆشەویستن

لەهەموویان خۆشەویستر

ئەو کانیەی

تینوێتی زۆری شکاندووم.

باخەکانی وڵاتەکەم خۆشەویستن

خۆشەویستر لەهەموویان

ئەو باخچەیەی

بەری زۆرتر بۆ گەیاندووم.

مامۆستایانی وڵاتم خۆشەویستن

لەهەموویان خۆشەویستر

ئەو مامۆستایەی یەکەم جار

فێری یەکەم حەرفی کردووم.

هاوڕێکەم!

شەهیدانی وڵاتەکەم تێکڕا هەموو خۆشەویستن

لەهەموویان خۆشەویستر

ئەو شەهیدانەی یەکەم جار

ترسی مەرگیان

بۆ بەزاندوم!

* * *

ترس ژوورێکە داخراو

بەچرپە باسی هەتاوی تێدا ئەکرێ

ترس پۆڕێکی غەمگینی هەڵکورماوە

وەکوو باڵیـ کناچەـ یان هەڵکێشاوە

کێرد بە بێ کییف ئەگەڕێتو سەر بەدەرگای

هەموو برینێکدا ئەکات.

سەر ئەکەوێتە سەر کەژو، هەوار، هەوار

بۆ بەرەو خوار ڕاپێچ ئەکات.

کێرد ڤینێکی ڕەشی تیژە

زمانی کوردی ئەبرێتو

گوڵ لە باخچەو دەغڵ لەکێڵگە دەرئەکات.

"مامە یارە" لەگۆڕ ئەهێنێتە دەریّو

ـ عەگالێکیـ لەسەر ئەکات.

کێرد ڤینێکی پەند خوراوەی دەمیّ ساڵە

وا بەربووە

ئەڕوا ئەڕواو ڕائەماڵیّو

ئێسكو پروسکی "مەولەوی"و

دار بەڕۆکان بەیەکەوە ڕائەماڵیّ.

* * *

ترس ژوورێکە داخراو

بەچرپە باسی هەتاوی تێدا ئەکریّ

چرپە ئەڵیّ:

لەم بەینەدا. چەند هەڵۆیەك. ڕەنگە شێت بن

چوونەوە شاخ. ئەم هەڵۆیانە لەڕەنگو

شێوەی باڵو

دەنووکیاندا. لەهەڵۆکانی تر ناچن. ئەمان سوورن

ئەوان بۆر بوون

وەك ئەفسانەن: دەر ئەکەونو ون ئەبن.

ون ئەبنو دەر ئەکەون. تینوویان بوو

لەئەستێرکی چاوی یەکتر ئەخۆنەوە.

برسی یان بوو گۆشتی ڕانی خۆیان ئەخۆن

بە ڕۆژ ئەنوون بەشەو ئەڕۆن

لەناو کونە گورگەکاندا ڕائەکشێن

پێشبڕکێ لەگەڵ شەپۆلو "با"دا ئەکەن

لووتکە لەژێر باڵیانایە.

ئەڵێن:

ئەم هەڵۆ سوورانە. لەسەر پشکۆ کڕ ئەکەون

بروسکەیان لەناو هەورا دەرهێناوەو

خستویانەتە دەروونی خۆیانەوە

ئەڵێن:

ئەم هەڵۆ سوورانە بەشەوی زریانو بەفر

هێلانەیان ئەگوێزنەوە.

لەسەر لوتکەش نەبێ نامرن.

بەچکەکانیان لەناو گەردەلوولدا نەبێ قەت باڵ ناگرن

دۆستی هەموو بنچکێکن.

ئەڵێن:

ئەم هەڵۆ سورانە

ئەگەر ڕێ یان کەوتە گوندێ، تەنها مەلە هەژارەکان

لەزمانو هەڵفڕینی ئەوان ئەگەن

ئەم هەڵۆیانە زۆر سەیرن.

نان بۆ مەلە هەژارەکان ئەکەنەوەو نانیان ناخۆن

ئەم هەڵۆیانە ئەفسانەن

لەشەپۆلدا گەرا ئەخەن

چرپە ئەڵێن: ماوەیەکە شاخی قەندیل

لەناو هەموو شاخەکاندا

بەتەنها ئەو پێ ئەکەنێ

بینیویانە: چیتی هەورێکی‌گوڵ گوڵیی

"سەر" بەستێتی

بینیویانەو خۆی وتویەتی

بۆیە ئاوا دڵی خۆشە

چونکە هەڵۆی سووری داستان میوانێتی!

★ ★ ★

ترس وەکوو گرێ قوڵفەی پەتێکی شلە لە ملدا

دەنگ هەڵبڕی گرێ ئەچێتەوە یەك‌و مل دائەبڕێ.

چرپە ئەڵێن: کێردی ڕاوچی

قاقا بە هەڵۆ سوورەکان پێ ئەکەنێ

چرپە ئەڵێن: گوێ یان لێ بووە وتوێتی:

جارێکی تر گەر بیست هەڵۆ

چوونەوە ناو دڵی شاخ‌و

بەژێر هەوری منا فڕین

جارێکی تر گەر بیست هەڵۆ

نزارێکیان کرد بە دۆست‌و

دەربەندێکیان کرد بە ئاشنا

ئەوسا ئەبێ منی چەقۆ

خۆم لەسەر تاوێرە بەردێ بشکێنم‌و

نەیبینمەوە پێ کەنینی کەژو چیا!

★ ★ ★

هاوڕێکەم، شاعیر نییە، مامۆستای سەرەتایی یە
بیست ساڵە حەرف ئەچێنێ.
هەموو ڕۆژێ پەنجەرەیەك،
لەسەر دڵێکی بچکۆلە ئەکاتەوە.
بیست ساڵە دێراوی رستەی ناو دڕكو داڵ،
ناو بەردەڵان، بە پەنجە هەڵ ئەداتەوە.
هەموو ڕۆژێ لە تاریکیی هەڵ ئەنوتێو واز ناهێنێ
هەموو ڕۆژێ بەسەر ڕێگەی تەباشیرا
دێتو ئەچێو تۆز چاویلکەکەی ئەخواتو
واز ناهێنێ.
هاوڕێکەم، شاعیر نییە
بەڵام ـ کانی ـ ئەو حەرفانەی
لای شاعیرە، ئەم ئەچێتە ناویانەوە.
خشتی وشە دەرئەهێنێو ڕیزیان ئەکا.
ژووری ڕوناكو چلچرا لەو وشانە دروست ئەکا.
هاوڕێکەم هەفتەو هەفتە
نامەیەکی قژ تۆزاویم بۆ ئەنێرێ
هاوڕێکەم بەناو خەمو پێکەنیندا چاو ئەگێڕێ
هەرچی بینی بۆم ئەنووسێ
هەناسەی گۆیژە ئەخاتە ناو نامەوەو بۆم ئەنێرێ
ئاونگی چاوی تانجەرۆم بۆ ئەنێرێ
دەنگو ڕەنگی هەڵۆکانم بۆ ئەنێرێ

هاوڕێکەم شاعیر نییە، مامۆستایە

بەڵام لەشیعر جوانتریش، لەدڵیایە !

⋆ ⋆ ⋆

هاوڕێکەم

نامەیەکی بۆ ناردبووم

هەفتەیەك بوو

هێشتا چاوی،

وشەی تەڕ بوو

بۆی نووسیبووم:

بەرە بەیانێکی پایز لە پایتەختا

ئەو کاتەی سەرەتای ڕێچکەی،

خۆڵەمێشیی، کرێکارە خەماوێکان

لەشەقامو گۆڕەپاندا

بەرە بەرە دەر ئەکەوتن

ئەو کاتەی یەکەم نەورەسی دیجلە ئەفڕیٚو

شەپۆلەکان چاو هەڵ ئەبڕن

لەو کاتەدا

فەرمان درا

سیٚ هەڵۆی سوورمان سەربڕن!

⋆ ⋆ ⋆

دیجلە وتی: مەیانکوژن [2]

شەپۆلم وا لە دڵیانا

نەورەس وتی: مەیانکوژن
فڕینم وا لەگیانیانا
ـ سەروـ وتی: مەیانکوژن
سەوزیم لەناو چاویانایە
هەور وتی: مەیانکوژن
گرمەم لەناو دەنگیانایە
مێژووش وتی: مەیانکوژن
ڕێگەم لەناو سەریانایە
سەریان بڕین

* * *

بەلام هەتا سەریان بڕین
هەر بەرز ئەفڕین
هەلۆ لەئاسمانا نەبێ نامرێ
لەسەر سێدارەی خۆی نەبێ
لەنگەر ناگرێ

* * *

ئەو ڕۆژەی کێرد لە پایتەختا
سێ هەلۆی کوشت
لە "قەندیل"دا
بیست باڵی گرت!.

* * *

ئاسمان ئەڵێ ئەستێرەیەکم کوێر ئەکەن

له قوبه‌ما ده‌ی تر هه‌ڵدێن

زه‌مین ئه‌ڵێ دره‌ختێکم ئه‌بڕنه‌وه‌

له‌بێشه‌مدا ده‌ی تر ئه‌ڕوێن

تۆش سه‌رچاوه‌!

کانیه‌کت لێ وشك ئه‌که‌ن

له‌بنارتا ده‌یانی تر هه‌ڵ ئه‌قوڵێن

★ ★ ★

ساڵی: کتێب

ساڵی: ئافره‌ت

ساڵی: منداڵ.

ئه‌ی نوێنه‌ری کۆمه‌ڵانی

گشت نه‌ته‌وه یه‌کگرتووه‌کان!

لێره له ساڵی کتێبدا

قه‌ڵه‌میان کوشت.

لێره له ساڵی ئافره‌تدا

منداڵیان کوشت.

لێره له‌ساڵی منداڵدا

دایکانیان کوشت.

لێره ئه‌مساڵ وه‌کوو پاره‌

پار: پێرار.

لێره ساڵ هه‌ر یه‌ك ناوی هه‌یه‌

ساڵی: زیندان‌و سێداره‌!.

★ ★ ★

چوومە پایتەخت
هەواڵی شیعرو چیرۆکو شانۆم پرسی
ـ پەیکەرە دیواری- بەرزی
هونەرمەندێ
شەهیدەکەی هاتە قسەو
وتی: کە لێرەوە ڕەت بوون
من خۆم دیمن
تاك.. تاك نەبێ
هەموویان وان
لەسەر خوانی
کۆشکی سوڵتان!
* * *
ئەو نووسینەی
شەهید چەمۆڵەی لێ ئەنێ
ـ دوا ڕۆژ- لەدۆزەخی خۆیدا
ئەیسووتێنێ!
* * *
هاوڕێکەم بۆی نووسیبووم:
ئەمڕۆ دوو قەڵەمی شەهید
سەر خوێناویی
گەیشتنەوەو هاتنەوە شار
باخێکی زۆر

باخی گشتی، باخچەکانی بەختیاریو، ناو سەرچنار
گردێکی زۆر شاخێکی زۆر
مامە یارە، سەیوان، ئەزمڕ، پیرەمەگروون
هەموو بەرەو پیریان ئەچوون
هەمان ڕۆژیش
لەسەر شانۆیەکی مل کەچ
چەند قەڵەمێکی چاو حیزی
ناوبانگ زڕاو
قەڵەمەکانی گیرفانی"موشیری حەمەی سلێمان"
"راپۆرت"یان ئەدا لە بەردەقارەمانو
دەستیان ئەخستە ناو دەستی
"فرایزەر"و
ئەکەوتنە پێشی"سیکەکان"

ـ 9ـ

ئەو ڕۆژانەی
کە یەکەمین پۆلە هەڵۆ
بەدارستانی ئاگردا ڕەت ئەبوونو
دڕیان ئەدا بەدیواری نێزەو چەقۆ
ئەو ڕۆژانەی بە باڵی سوور
پەڵە هەوریان خوێناویی کرد
لە تاریکیی شارو گوندا
چرای چاوی خۆیان هەڵکرد

ئەو ڕۆژانە:

پیاوانی پووت

کەڵەشێرە بەزیوەکان

لەهەندەران

زاریان بۆ بەختی نەهاتی کورد هەڵ ئەدا!

لەسەر مەسەلەی ڕەوای کورد!

لەناو یەکدا

چەڵە مشکێنەیان ئەکرد

گەر تاقەتیشیان بچوایە

یەکی مێشکوژێکیان پێ بوو

مێشیان ئەکوشت!

* * *

هاوڕێکەم

بۆی نووسیبووم

هاتن.. بردیان

وتیان تەنها دەقیقەیەك

دایکی لەبەر دەرگاکەدا هەڵتروشکا

دەقیقەیەك بوو بەمانگێ

بوو بەساڵێ

دەقیقەیەك بوو بەحەوت ساڵ

دوێ ئێوارە

لەگەڵ خەڵكو خوای گەڕەکدا

دایکیمان ناشت!

★ ★ ★

لەهاوڕێکەم نەگەڕان
هەتا ڕۆژێ دەمو چاویان
خستە بەر دەس پەیکەرتاشێ
بۆ ئەوەی تێکی باتەوەو
سەر لەنوێ بیتاشێتەوە
هاوڕێکەم!
دەمو چاوی خۆی لە تەشوێ
ڕاپسکانو
چووە پاڵ هەڵۆ سوورەکان!

ـ 10ـ

دیواری ترسو بێ دەنگی درزێکی گەورەی تێ بووە.
نەك کوولەکە ئێستە بانگ لە کێو دا ئەدرێ.
نەدوان نە سیان نە چوار
سێدارەکان بەڕیز ئەچنە ناو مەرگەوەو پێ ئەکەنن
ئیستە پایتەخت کارگەی مەرگەو شارێکە شووم
بە یەکسانیی، گریان بەسەر
ئافرەتانو منداڵانی کوردستانا دابەش ئەکات
ئیستە پایتەخت، هەموو، هەموو بەیانیانێ
دەستو پلی خوێناویی خۆی

لەناو دیجلەدا ئەشواتو

دیجلەش هەر تفی لێ ئەکات!

دیواری ترس‌و بێ دەنگی درزێکی گەورەی تێ بووە

هاژە چۆن لەناو گەرووی شەپۆلدا دەر ئەهێنرێ؟!

کێ ئەتوانێ گڤەو لوورە لەناو دەروونی زریاندا

هەڵبکەنێ؟!

کێرد چەند رۆچێ ئەوەندەی تر

بەرەو ژوورتر خوێن هەڵ ئەچێ

دیواری ترس‌و بێ دەنگیی قڵیشاوە

خوێن چرایەو داگیرساوە.

* * *

ئەی هەڵۆی سوور!

هەڵۆکانی داستانی نوێی کوردستانم

لەسێبەری باڵتانایە

ئەژین، ئەڕۆن دەنگ هەڵ ئەبڕن

شیعرەکانم!

* * *

ئەی هەڵۆی سوور!

هەڵۆکانی داستانی نوێی ئەم شاخانە

کەهاتنەوە:

خەمی زەردی ئەم دەشتانە شین بوونەوە

ئەو گۆمانەی شەوان درەنگ،

مانگی گریاو سەری ئەخستە پەنجەرەی،
بێ تروسکەی دڵیانەوە.
ڕوون بوونەوە.
لقی درەخت گۆپکەی بزەی دەرکردەوە
شاخ تەوێڵی گرمۆڵە بووی
لەبناردا هەڵگرتەوەو..
لەهەورا هەڵیکردەوە!

* * *

ئەی هەڵۆکانی داستانی ئەم شاخانە
ڕۆژانێ بوو
کوردستانم کەشتیەکی بەرەڵڵای ناو
گەرداوێکی ڕەش‌و تووش بوو
ئێوە چوون‌و جارێکیتر گرتتانەوە.

* * *

من خەریك بووم
لەتینوێتیدا بخنکێم
کە بارانتان بۆ باراندم
من ترس رۆحی ئەکێشام
کە هیواتان لەناو گیاندا بۆ ڕواندم
من خەریك بوو.. نەهەنگەکانی تاریکی
قووتم بدەن
وەختێ چراتان بۆ ناردم

**ئەی باران‌و هیواو چرا**

**ئەی سێ برا**

**مادەم ئەو جارە نەمردم**

**هەرگیز نامرم!.**

★ ★ ★

**کە کێرد پۆلە هەڵۆی بینی**

**سوور ئەچنەوە**

**بەسەر دەمی تیژی ئەودا**

**بەرەو گزنگ ئەپەڕنەوە**

**کە کێرد زانی بەچکە هەڵۆی**

**تر، باڵ ئەگرن**

**خەوی زڕا**

**کێردەکانی ئەم لاو ئەولای کۆکردەوە**

**کێردی سێ لا**

**لەسەر هەسانێکی تازە**

**دەمی خۆیان تیژ کردەوە**

**کەوتنە ڕێگا**

**کاروانی هەڵۆی بەرەو ژوور**

**بەشوێن ئاگردا ئەگەڕێ**

**هەڵ ئەلەرزێ**

**کاروانی هەڵۆی بەرەو ژوور**

**بەفر ئەخوات‌و لەناو بەفرا هەڵ ئەکوڕمێ**

ڤینی سێ لا

گوێزانێکی سێگۆشە بوو

پیلانێکی سێگۆشە بوو

ئەوەتا وا

پیلانی سێ گۆشە ئەڕوا

توند ناوقەدی۔ هەکار۔ ئەگرێ

دوپشکی سێ چزو ئەڕوا

ئەدا بە لەشی هەڵۆوە.

پیلان پۆشتەو پیلان تێرە

هەڵۆ ڕووتەو، هەڵۆ برسیی

بەڵام پیلان سەری شۆڕەو

هەڵۆ سەرکەشی سەربەستی

ئەوەتا وا

سێ گۆشەی کێرد

کڵاوو مشکی خێڵەکیی ناو"هەکاری" لەسەر ناوە

خێڵ: خەنجەرێکی کرمانجی شەلو کوێرە

خێڵ: بێ "سەرە"و پشیلەیەکی کێویەو

چڕنوکەکانی هی خۆی نین

خێڵ: مێژوویەکی نووستووەو

بەرازێکی زامدار کراو.

کاروانی هەڵۆی بەرەو ژوور

جۆگە خوێنێکی مەییوە لەسەر سنووری

برسێتی‌و تەم

خێڵ‌و شاڵاو

شاخی بەفرو

تەلبەندی داو.

⋆ ⋆ ⋆

هەڵۆ لە لوتکەدا نەبێ نامرێ

بەر لە دوا کۆچ

باڵ لە خوێنی خۆی وەرنەداو

ئاسمان نەگرێتە باوەشی

ئۆقرە ناگرێ!

⋆ ⋆ ⋆

ئەی لاوکی هەڵۆی سووری

ناوچەی هەکار

گوێمان لەسۆزی برینتە

چەندە قووڵەو چەند بەرینە!

ئەی کێوی داستانی هەڵۆی

سووری هەکار!

چاومان لەخوێنی ڕژاوی،

کڵپە سەندووی

سەری لووتکەی ئاگرینتە

چەند بەتینە!

⋆ ⋆ ⋆

پەندی ڕێگەی

کۆچی بەرەو ژووری هەڵۆ
بۆ هەڵفڕینی سبەینێ
لەژێر باڵدا
بوو بە پشکۆ

★ ★ ★

هاوڕێکەم
بۆی نووسیبووم:
کەم کەس زانی هەر هەمان ڕۆژ
ـ ئەوـ زەردە پەڕ لە"هەکار"دا
شەهید کرا
کەم کەس زانی هەر هەمان ڕۆژ
بانگی شێوان
لەدالآنی مەخفەرێکی بیاباندا
"گوڵە"ی ژنی ژانی گرتو
کوڕێکی بوو
کەم کەس زانی.
کەم کەس.
کەم!

★ ★ ★

ئەی شاعیرە بێدارەکە
لەگەڵ شاخدا تۆیش بێداری
چاوت وەکوو چاوی هەڵۆ

ئاسمانی بەرین ئەپێوێ
ڕێگەکان ئەخوێنێتەوە
لە هەڵدێرانی دوێنێیەوە
سەرکەوتنی لوتکە فێر بووی
شیعرەکانت شاخەوانن
بەسەر پلەی خزو لووسدا هەڵ ئەگەڕێن.
شیعرەکانت پێستی دەستو پلو قاچو قولە ناسکەکەی
دوێنێی خۆیان وەکوو کاژێ فڕێ داوە.
ئەی شاعیرە خەم خۆرەکە
تۆ بێداریتو ئەمشەوت
پڕ لە ڕەهێڵەو بارانی سووری شیعرە.
⋆ ⋆ ⋆
پۆلە هەڵۆ سوور ئەچنەوە
گوڵجارێکە ئاسمانەکەم
ئەم شەو شیعر
لەوە ناچێ خۆش کاتەوە
لەوە ناچێ ئەم هەواری
سەرە شەیدایەم جێ بێڵێ.
من ئەمەوێ پشوویەك بەم
ئەو، ساوایەو جگەرگۆشەو
خۆی هەڵ ئەداتە سەر سنگم
سنگم نواڵەی وشەیە.

من ئەمەوێ پەنا بگرم

ئەو بە باوە ئەبارێتو

دێتە بەرۆکو سنگمەوە.

سنگم خاکی ئەم عەشقەیە.

من ئەمەوێ جگەرەیەک داگیرسێنم

ئەو ئاگرێ لە ناو ناخما ئەکاتەوەو

بە ماڵەوە ئەمسووتێنێ!

ئەمشەو شیعر

لەوە ناچێ خۆش کاتەوە

ئەی ڕێژنەی شیعری بەتاو!

داکەو داکە

چاوی هەورت قەت لێک نەنێی

داکەو داکە

وام لە ـ بەر ـ تا، غەرقم بکەی

غەرقم نەکەی ناگەمە قوڵایی عەشقت

غەرقم نەکەی نە تۆو نەخواو نە کوردستان

نەخەونی شەپۆلو گێژەن.. هیچ نابینم

غەرقم نەکەی!

چاوم لە ناو هاژەتایە

شمشێری سووری برووسکەی

شیعری ئەمشەو!

ـ لێم دە ـ بۆ ئەوەی ئەم لەشە

**ببێ بە یەك پارچە كڵپە**

**وشە نەچێتە كڵپەوە داناگیرسێ**

**دەنگی هەڵۆی سوور نابیسێ**

**ئەی چەخماخەی شیعری ئەمشەو**

**لەناو خۆتا بمتوێنەوە**

**تا بتوانم بتنووسمەوەو بتخوێنمەوە**

**ئەمشەو شیعر لەوە ناچێ**

**خۆش كاتەوە**

**ئەو ئەبارێو هەر ئەبارێو**

**من داستانی هەڵۆی سووری**

**ئەم شاخانە ئەخوێنمەوە.**

**ئەمشەوشیعر لەوە ناچێ**

**خۆش كاتەوە**

**هەور تەتەرێكە خێراو مژدەی سەوزی**

**ئەم بارانە ئەدا بە تۆ**

**بچۆ بەری**

**بچۆ بەریو**

**لەخۆشیاندا تێر تێر بگری!**

تشرینی یەكەمی/ 1981

* لەبەهاری 1987 دا و لەشام، لەكۆمەڵە شیعرێكی وەرگێڕدراوی شاعیری بەناوبانگی یۆنانی "ڕیتسۆس"دا هەندێ وێنەم بەرچاو كەوت كەجۆرە لێكچونێكیان لەگەڵ وێنەكانی ئەم پارچەیەدا هەبوو، دوو خەیاڵی شاعیرانە بۆ یەك بۆچوونو دەربڕینی هاوبەش، نووسینی ئەم تێبینییەم بەپێویست زانی.

کاتێ مشتەکۆڵەیان بەرز ئەکەنەوە

مژدەی خۆر هەڵهاتن ئەدەن

کاتێ بزە ئەیانگرێ

لەناو دەغڵی ڕیشیانەوە

بەپۆل پەڕەسێلکە ئەفڕێ.

وەختێ ئەنوون، کاتێ خەویان لێ ئەکەوێ

لەگیرفانی بەتاڵو کون کونیانەوە

ئەستێران ئەکەونە خوارێ.

وەختێکیش کەشەهید ئەبن

ژیان بەتەپڵو ئاڵاوە

بەگردۆڵکەو یاڵەکاندا هەڵ ئەگەڕێ!.

شاعیری گەورەی یۆنان

یانیس ڕیتسۆس

# کلیل

ئەم کەشکۆڵە
سادە ئەدوێ، وەکوو ڕاستیی.
وەکوو هەژارانی وڵات.
گوڵە شیعری نایلۆن نییە،
بێ بۆن نییە.
لووت بەرز نییەو
بەسەرکەسدا،
فیز لێ نادات،
وەکوو قسەی پڕ گرفتو،
وەك باڵقۆنی کۆشکەکانی،
چینی سەرووی بە دەسەڵات!.
ئەم کەشکۆڵە:
ساکارە وەك گوڵی کێویی
وەك کچی خانووە قوڕەکان.
ڕوونە وەکوو چاوی قرژاڵ

جوانە وەکوو:

ڕیشە سپیەکەی مەولەوی

بێگەردیش وەك:

بەفری لووتکەو

دڵی منداڵ.

★ ★ ★

ئەم کەشکۆڵە

وەك هەگبەی پێشمەرگە وایە

نانە وردەو،

تاك تاك گوللەو،

لەتە ئاوێنەی شکاوو،

نامەو نوقڵو،

ڕادیۆیەکی،

خشەخشکەریشی تیایە!

★ ★ ★

ئەم کەشکۆڵە

وەکوو دڵی

پێشمەرگەکانی کۆمەڵە

شاخی ورەی بەرزی تیایە.

گێژەڵووکەی ڕقی پیرۆز.

ئارامی مەنگ.

خەونی شەهید.

کۆچی بێ دەنگ.

گەڕانەوەی هەڵۆی تیایە!

٭ ٭ ٭

ئەی پێشمەرگەکانی  کۆمەڵە!

ئەم قەڵەمە..

بۆیە باڵی لێ ڕوواوە

ئاسمانی ئێوەی بەدییکرد.

ئەم قەڵەمە

بۆیە دەنووك سوورە چونکە:

سەری کێشایە پەنجەرەی زامتانەوە.

بۆیە وا بەکوڵ ئەخوێنێ

لەبەر ئەوەی:

لەسەر مەچەکتان نیشتەوەو

چووە ناو گەرووتانەوە.

٭ ٭ ٭

ئەی پێشمەرگەکانی کۆمەڵەی،

ناو ژووری چاو

ناو ژووری دڵ.

ئەم شاعیرە لاتەی خۆتان

هەر ئەم کەشکۆڵەی شك ئەبرد

گەر ڕازی بن

بیکا بە توێشووی ڕێگەتان

بەدیاری تان

وەکوو نانو

وەك چەپکە گوڵ.

ئەگەر ئەمیش بەختی سەوزی

مژدانە بێ

بچێتە ناو هەگبەکەتان

بچێتە لای گوللەو نوقڵو

بەر تەماشای ئاوێنەتان

ئەگەر ئەمیشتان خۆش بوێ

لەتەکتاندا

بێتو بڕواو

هەڵسێو بنوێ.

چەکەکانتان بانگی بکەن

ماچی بکەن.

ئەوا منی شاعیری لات

هەموو ڕۆژێ باڵای شیعرم

بەرەو ژوورتر هەڵ ئەچێتو

ئەبم بەشای،

هەژارانی هەموو وڵات.

1982

*لەرۆژگارە تاریکو نووتەکەکانی دوای هەرەسی (1975)دا، ناوی "کۆمەڵە"و پێشمەرگە هەڵۆکانی، یان ناوی "شۆڕشگێڕان"و قوربانییەکانی بەر لەوەی لەدڵو دەروونی خەڵکیدا پێناسەیەکی حیزبی دیاری بکەن، داستانو مەلحەمەی ژیانەوەو هیواو خەونی مێژوویەکی نوێ بوون، لەو سەردەمانەدا، لەپەلەپیتکەی ئەو پێشمەرگە تاکو تەرایانەدا، کەدرپیان بەشەوەزەنگی دوای هەرەس دابوو، نەك هەر گیانی تاقمێکی سیاسی، بەڵکوو گیانی هەموو کوردێکی شۆڕشگێڕیان لەگەڵدا بوو ئەو ناوانە ئەبوون بەناوی عیشقو ئازادیو ئەوینیکوردستان. دەیان شەهیدی وەك شەهابو ئەنوەرو جەعفەرو ئارامو جەمالو شەماڵو عەلی عەسکەریو خالیدو عەزۆو.. هتدو بووبوونە ویردی سەر زمانی هەموو دڵدارانی شۆڕشی ڕزگاری، هەر لەسەرچاوەی ئەم عیشقەیشەوەیە کە گەلێ جۆگەی سووری ئەم کەشکۆڵە هەڵقوڵیون.

ش. ب

# له شه‌وێكدا

شه‌و بوو هه‌ر پێشمه‌رگه‌و به‌فر
به‌بناری شاخه‌وه‌ بوون
كه‌به‌فر نوست
ئه‌وان ورد ورد هاتنه‌ خوارێ
له‌چوار لاوه‌ هاتنه‌ خوارێ.

* * *

شه‌و بوو له‌به‌ر ده‌ركی سه‌را
ته‌نها چه‌ن سه‌گێكی خوێڕیو
دوو پیكابی زه‌رد ئه‌بینرا.

* * *

شه‌و بوو قرمه‌ژنی گولله‌
گوێی گه‌ڕه‌ك‌و گۆڕه‌پان‌و
"سه‌را"ی كه‌ڕ كرد
بارانی گڕ به‌خوڕ دایكرد.

* * *

لەچوار لاوە دەست ڕێژو تەقە بڵاوە

لەژوورەوە، لەکونی کونی ژوورەوەی،

چەند ماڵێکدا

خائینەکان، وەکوو جرجی زراو تۆقیو

وەك توتەڵەی بەر بارانی،

لەسەرمادا لەش هەڵ لەرزیو

خۆیان لەناو ئاودەست خانەو

ژێر زێرابدا حەشار داوە

لەچوار لاوە

دەست ڕێژو تەقە بڵاوە.

⋆ ⋆ ⋆

لە "دارۆغا"

پێشمەرگەکان وەك ڕەوەیەك

ـ بەورـ ی چاو تیژ

شارەزای کۆڵانو گەڕەك

بست بەبستی

دابەش بوونو ئەوسا هەر بۆ

پەنگو عیبرەت

کلکی چەند جاشێکیان بڕی!

⋆ ⋆ ⋆

لە "ئازادی"

دوو پیکابی زەرد، وەکو عار

زەرد وەك سیمای "هێتلەرەكەی"
شاری بەغدا
ڤین.. باركردوو
چەند تەنێك تاوان هەڵگرتوو
دوو یەكانەی زامدار بوون‌و،
تیژ ئەهاتن
لەناكاودا، لەپێچێكدا
هەڵۆی سووریان بۆ دەرپەڕی
لولەی سەرشانی گڕ هاوێژ
دۆزەخێكی بۆ داخستن
تیا توانەوەو
فریای دابەزین نەكەوتن.

⋆ ⋆ ⋆

هەر ئەو شەوە لەكانێسكان
پێشمەرگەیەكی حەڤدە ساڵ
لەبنكە دا ناویان نابوو
ـ هەژاری زاڵـ
باریكەلەو، لەش سووكەڵە
وەكوو ئاسك
چاوشین وەكوو قوبەی ساماڵ
گەردی خەمێ لەڕووی نیشتوو
وەك باخی گوندێكی چۆڵ بوو

لەو شەوەدا.. دەمێ خێراو دەمێ هێواش

جارێك قیتو..

هەندێ جاریش بە کۆمە کۆم

ئەچوە پێشێ

تا بگاتە سەر بەنگەڵەی دوژمنانو

بەنارنجۆك دایان بێژێ.

⋆ ⋆ ⋆

لەناکاودا –هەژاری زاڵـ

کەوتە ناو تەلبەندی بۆسەی دوژمنانو،

بە ئەڵقەیەك دەوری گیرا

ـ هەژاری زاڵـ برووسکە بوو، هاتە دەستو

لەگورگە کلاو ڕەشەکان

چواری خستو.

لەدواییدا شەهید کرا.

هەر ئەو شەوە،

بێژنگی لاشەی بەپشتی

زیلێکەوە، لەقاچەوە، گرێ درا

بەسەر بەردو دڕكو داڵدا

بە لیتاودا، بەقوڕاودا.

ڕایان کێشا.

هەر ئەو شەوە.. لەشی سووری

لەسەر تەختی مەیتخانە فڕێ درا

دوژمن وتی:

چەتەیەکە بێ ناونیشان

بێ دایكو باوك

بێ کەسو کار

بۆ بەیانی کە خۆر هەڵهات

بینییان وا:

لەبەردەمی مەیتخانەی ئەم شارەدا

کۆمەڵ.. کۆمەڵ

دەیان دایکی عەبا بەسەر،

کوڕ لە کێوان

ڕەش ئەچنەوە

بەبێ دەنگیش پاڵەپەستۆو پەلەیانە

هاتوون تەرمی، ئەو هەڵۆیە ببینن‌و

بزانن کوڕی کامیانە؟!

1981

# ماڵ ئاوایی

هەورازی کوورِ: پشتی شاخێکی بە عومرە
بۆ پێشمەرگە دانەویوە
ئێوارەیە
ڕێچکەو ڕیزی یەك لەدوای یەك
بەرەو بناری ئەودیو
دەنگ: هەر پرمەی
وڵاخێکەو، وردە بەردو زیخی ژێر پێ
بێ دەنگ.. بێ دەنگ
بەسەر پەیژەی دانە بەردا
ئەم کاروانە کرِوماتە سەر ئەکەوێ
بەسەر پشتی وڵاخەکەی پێشەنگەوە
تەرمی شەهید
دوو دەستی شۆڕ بەرەو زەوی
ـ هۆ بنچکی قژ خۆڵاویی
ئەمە زامێکی تازەیەو لێ ی نەکەوی.

ئێوارەیە.

خۆر وێنە کێشێکە لاواز

دەستی دوا  تیشك درێژ ئەکاو

بە ئاستەمێ

زەردە.. ڕەنگێ

ئەدا لە لوولەی تفەنگ‌و

یاڵی خوێناویی وڵاخ‌و

ئینجا ئیتر چاو لێك ئەنێ

ـ هۆ شەماڵی تۆزێ بزێو!

پەلە مەکەو ئاگات لێ بێ

ئەمە زامێکی تازەیەو

با کاکۆڵ‌و قژی ڕەشی نە ئاڵۆزکێ

ئێوارەیە

وا لوتکە.. چەتری هەورێکی زۆر بەنزمی

لەسەر سەری خۆی هەڵ داوە

ـ هۆ لوتکەی بەرز!

ئەوا ئیستە ئەگەنە لات

مل هەڵبڕەو بەو هەورە تەنیایە بڵێ

کە گەیشتنە سێبەرەکەی

نمە.. نمە.. با بباری

مل هەڵبڕەو سووك پیی بڵێ

شەهیدێکیان لەگەڵدایە

ئەڕواتەوە بۆ دێکەی خۆی

لەوێ ئەنوێ

سووك پێی بڵێ

شەهیدێکە زۆر تینویەتیو ئاوی ئەوێ.

1982

# گۆرانیەکی داواکراو

دوانزە ساڵەو هەموو ڕۆژێ

لەم وڵاتە غەمگینە دا

ڕژێمی خوێنو سێدارە

دایکێ، خوشکێ

لە پرچەوە هەڵئەگرێتو

لەڕەنگی ڕەشی پرسەیان هەڵ ئەکێشێ.

تەماشاکەن: بەرگیان شەوەو

ئەستێرەی سەری بڕڕاوی

براکانیان، باوکیان، مێردیان

لەسەر سنگیان ئەجریوێنن.

تەماشاکەن: ئەو سەرانە

چاو لە چاوی

شۆڕشگێڕان ناتروکێنن.

پێش دوانزە ساڵ

ڕەشپۆشەکان ئەژمێردرانو

هەر ئەوەندەی

لقو چڵی درەختێکی ڕووتاوە بوون

ئەژمێردرانو هەر ئەوەندەی:

دەرگاو پەنجەرەی گوندێکی

شاخ نشینی چەوساوە بوون.

ئەی ئیستاکە چی ئەژمێری؟!

یەکە یەکە سنەوبەری

"سوارەتووکەی" چاوهەڵوەریو

چۆن ئەژمێری؟!

یەکە یەکە

ئەشکەوتی ناو شاخو کێوی

هەتاو نەدیو چۆن ئەژمێری؟!

دوانزە ساڵەو هەموو ڕۆژێ

ڕژێمی مەرگ

گوڵێك، مانگێك

شیعرێکی تازە ئەکوژێ.

دوانزە ساڵەو هەموو ڕۆژێ

ئەم وڵاتە غەمگینەمان

لەپرسەی کانییەك، گردێك

باخچەیەکیا دائەنیشێ

ئەی وڵاتە غەمگینەکەم چاو هەڵبڕە:

گزنگ لە بزەی کازیوەی

ئەو لێوانەت هەرگیز مەبڕە

تەماشاکە: لەم شەوەدا

خوێنی شەهید

بارانی تووش

دەشتی گولاڵە ئەڕوێنن.

تەماشاکە: هیوا بولبولێکی سەوزەو

ئەفڕێو لەسەر چەکی شانی

پێشمەرگەکان بۆت ئەخوێنێ.

ئەی ولاتە غەمگینەکەم:

فاشستەکان

کە درەختێکت سەر ئەبڕن

دارستانێ لە خۆیان ئەکەن بەدوژمن.

کە کانیەکت ئەکوژن

زۆریان لەتینووواندا ئەمرن.

ئەی ولاتە غەمگینەکەم:

تۆ گوێ بگرە

وا هەڵۆی سوور

چریکەیان پڕ بە ئاسمانی فڕینە

گۆرانییان باڵی تیشکی ئاگرینە.

ئەوا پۆل پۆل

لەدەوری سەری تۆ ئەخولێنەوە

ئەم سرووودە ئەڵێنەوە:

وەك سبەینێ ئەو ڕۆژە دێ
دایكو خوشكە ڕەشپۆشەكان
ببن بە باخی زەردو سوور
پەلكە ڕەنگینە لە بەركەن
ئەو ڕۆژە دێ
كانیو گوڵو شیعری جوانیش
هەرگیز نەمرێ.

1981

## کام ڕێبوار

باشە کەستان هەتا ئیستە
لەتوولە ڕێو
هەورازە ڕێو
شەقامە ڕێتان پرسیوە:
چ ڕێبوارێ
ساڵ دوانزەی مانگ
وەك ئەستێرە
وەك باڵندە وەکوو هەور
چاوی لەتانو پۆتانە؟!
چ ڕێبوارێ
وەکوو درەخت
وەك تاشە بەرد
وەك مێرگو وەرد
ئەتاندوێنێو لەگەڵتانە؟
من لەتیپی پەنجاویەکم

لە "جەولە" بووم
لەم سەر هەناسەی بەفرم برد
بۆ گەرمیان
لەو سەر گڕەم هێنایەوە
بۆ ڕێواسی قاچ تەزیوی
گەورەی کوێستان.
بەهەر لایەکدا تێ پەڕیم
بەهەر ڕێگەیەك گەیشتم
ئەوەم پرسی:
توولە ڕێ یەك بۆرەقنە
کشاو، پێچ خواردوو هەتا سەر
پلەی ملە
لەپێچێکدا وای پێ وتم:
ـ ئەو ڕێبوارە ئێجگار ئێجگار،
خۆشەویستە
کە ڕۆژانە بەسەرمانا
ئەڕواتو دێ
ئاو ڕاوەستێ، ڕاناوەستێ
بەتەقەڵی گەورەی هەنگاو
دەشت بە شاخو
شاخ بە دەشتەوە ئەدووری.
دیسانەوە ڕێ یەکی تر

هەورازە ڕێ

ڕێ یەکی تر

شەقامە ڕێ

هەموو وتیان:

ـ لە هەمووتان خۆشەویستر

ڕێبوارێکە

کە بست بە بست

ئەماننناسێ

نەهێنیی ئەو

لای ئێمەیە

ئەو ڕێبوارەش

هەر تەتەری پێشمەرگەیە!

⋆ ⋆ ⋆

ئەی تەتەری هاوڕێی "با"

ئەی هاوڕێی گەرماو سەرما.

تۆ یەکێکیو هەموومانی.

تۆ هەموومانیو یەکێکی.

لەم سەر، لەو سەر

تۆ پۆستەی ڕازو نەهێنی

هەموومانت لەمشتایە

شیرینو تاڵ.

سۆزی دایك

تاسەی برا

خۆزگەی خوشكو

شەوقی پرسی ژنو منداڵ.

بۆنی خۆشی دەزگیرانمان بۆ ئەهێنێ

ماچەكانمان لەگەڵ خۆتا ئەبەیتەوە

شیعری هێشتا قژ خوێناویی

ناو زیندانمان بۆ ئەهێنیو

لەم سەر نامەی،

باخێكی ئازاد كراومان ئەبەیتەوە.

ئەی تەتەری هاوڕێی ئاو!

هاوڕێی  سێبەر هاوڕێی هەتاو!

تۆ هەمووومانیو یەكێكی

تۆ یەكێكیو هەمووومانی،

تۆ ئەو كەسەی من بزانم

وەك هەر بەپێوە ژیاوی

ئەبێ هەر بەپێوەش بمری.

# لەبەر تەندورێکدا

زستان بێ، تۆ
وەکوو زۆپای ژوورەکانمان
هەر سووتاوی.
هاوین بێ، تۆ
وەکوو بیابانی خواروو
پڕووکاوی.
بەم ڕۆژگارە:
تۆ وەك شیشی سوورەوە بووی
ناو کورەکەی
ئاسنگەری
گەر بچیتە بەر شەماڵێ
وەك ئەو شیشەو بخرێتە ئاو
گۆشتو ئێسقان،
چزە کردووی
بە هاڵاوی،

لەسەد لاوە لەشت کانیی:
کانی ئارەق:
ئارەقی شین
ئارەقی مۆر
گەرم.. گەرم
دەر ئەداتو کەچی تۆ هەر
لەبەر دەمی کلّپە کردووی
زمان ئالّی،
تەندوورێکدا ڕاوەستاوی.
ئەی نانەوای ئەم مەلّبەندە
ئەی هاوڕێی
ڕیش ئارداویی
ئەی برژانگو تووکی سەر سنگ
هەلّکرِوزاو
وەك باخەکەی:
"دێ" ی ئەوبەری ڕاپێچ کراو.
ئەی نانەوای ئەم مەلّبەندە
ئەی هاوڕێی،
پێش هەمووومان لەخەو هەستاو!
بابێ نانی
گەرمی قەراغ زیاتر برژاو
بابێ نانی دەس سووتێنەر

جار جار پشکۆ پێوە نوساو
ئەی هاوڕێ!
ئەم کۆمەڵەمان زوو تێرکە
پەلەمانە، ڕاییمان کە
ئەی هاوڕێی ڕیش ئارداویی
ڕێ یەکی دوورمان لەبەرە
کێ ئەزانێ جارێکی دی
کاممان دێتەوە بۆ ئێرە؟!

# پەڕەسێلکەیەک

هەفتەیەکە

ڕووتو قووت هەڵیان واسیوە

چاوی ئاوساو، سەری کەوتۆتە سەر شانی.

پێست توێخێکی داماڵراوە

کە ئەیبینی:

ئەڵێی کەروێشکێکی لەڕی،

تازە لە قولاپ دراوە

پەڵە خوێنی سەر کۆنکرێت

دڵۆپ.. دڵۆپ

لەدیواریش هەڵپژاوە.

هەفتەیەکە..

ئەو دڵە بچکۆلانەیە

کەهەر.. پڕ بەمشتێ ئەبێ

لۆکەیەکەو ئازاری مۆر

ئازاری شین هەڵ ئەمژێ

ئەو دڵە بچكۆلانەیە
سەعاتێكی جەڕەس دارە
هەتاكو ژان قوڕمیش كات
ئەو زەنگێكی خەبەر دارە.
هەفتەیەكە
ڕووتو قووت هەڵیان واسیوە.
ئەو نەهێنیانەی لە لای بوو
بەستیە باڵی پەڕەسێلكەی دڵیو،
دڵیش بەرەو ئەو شاخانە هەڵفڕیوە.
ئەوا ئیستا
لەش ساردو سڕ
ساردو سڕ وەك
تاشێ بەفر
ئەوا ئیستا
لەمابێنی مەرگو ژیندا..
لە پەنجەرە بچكۆلەكەی ئەو بەرەوە
چاوی لێڵ بووی سەرنج ئەدا
ئەوا ئیستا بەیانییە
خۆرێكی تازە هەڵهاتو
ئەمیش هێواش
چاوی لێك نا!

# هەرەس

لەبیرتانە؟!

ساڵی هەرەستان لەبیرە؟!

لەبیرتانە؟!

ئەو بەیانییەی کە هەستاین..

چاومان گڵۆفت

سەیرمان کرد:

شاخەکان: تفمان لێ ئەکەن؟

دارستان: پشتمان تێ ئەکەن؟

گوند، چەمۆڵەمان لێ ئەنێ؟

شاریش پێمان پێ ئەکەنێ؟

لەبیرتانە؟!

چەکەکانمان بەسەرماندا

چۆن ئەگریان؟

پاڕانەوە

داوێنیان گرتین کە نەڕۆین.

لەبیرتانە؟

بەزۆر.. بەزۆر

دەسمان بەستن

دەممان بەستن

لە "مەخفەر"و "پادگاکان"دا

یەك.. یەك

گۆڕمان بۆ هەڵکەندن؟!

لەبیرتانە؟

لەدوای هەرەس

پەنجە: لەقەڵەم ئەترسا

برۆ: لەبرژانگ ئەترسا

دەستی چەپ لە

دەستی ڕاستو

هەنگاو لە ڕێگە ئەترسا؟!

لەبیرتانە؟

لەدوای هەرەس

ئەو سەردەمە

کە پڵنگان چوونەوە شاخ.

وەختێ بزە

کەوتەوە سەر لێویی قەندیل؟

بانگی سەفین

گەیشتەوە گوێی قەرەداغ.

لەبیرتانە؟!

ئەو سەردەمە

لەدوای هەرەس

کەس نەبوو کەس

جگە لە هەڵۆی کۆمەڵە؟

لەبیرتانە؟!

1982

# سێوەکەی دڵ

بۆ شەهید جەمالی عەلی باپیر

ئەگەر لەچیاتان پرسی:
"جەمال" کێیە؟
لووتکەی خۆیتان
نیشان ئەدا!.
ئەگەر لە ڕووبارتان پرسی:
"جەمال" کێیە؟
ئەڵێ گوێ لە خوڕەو هاژەم بگرن!
ئەگەر لەباخانتان پرسی:
"جەمال" کێیە؟
ئەڵێن: بۆنی
گوڵباخی سەر،
چڵانمان کەن!
ئەگەر لەڕووتەو هەژاری
ئەم کوردستانەش ئەپرسن:
"جەمال" کێیە؟

هەموو تێکڕا

دەستی چەپیان

ئەخەنە سەر:

سێوەکەی دڵ!

1981

# شیعری کاریکاتێر

بەیانی بوو لە "کانێسکان"
بەچاوی خۆم:
"قەعقاع"م دی
بروسکەیەو شاڵاو ئەبا..
ئازا.. ئازا
هەر خۆی ئازا
دێتە پێشێ
قژی کچێکی قوتابی
سیانزە ساڵان ڕا ئەکێشێ!
ـ هەلهولە.. هەلهولە.. هەلهولە..
نیوەڕۆ بوو لەناو قەیسەری نەقیب دا
بەچاوی خۆم:
"سەعدی کوڕی وەقاص"م دی
تیر لە چاوی یەوە ئەباری
لە بازاڕی مانگرتودا

قفڵی دوکانێکی شکان

چوە ژورێ

ئازا.. ئازا..

وەختێ لەوسەر هاتە دەرێ

ئارەقی زۆری ڕشتبوو

بەم دەست چەند تەبەقێ هێلکەو

بەو دەستی تر چەکەکەی خۆی

هەڵگرتبوو

ـ هەلهولە.. هەلهولە.. هەلهولە!

# هێلانە

چەند ڕۆژێکە

جوتێ کۆتر.. کۆترە شینکە

تاقی پەنجەرەی هەوایی ژورەکەمیان

تەنیا ژوری ماڵەکەمیان

لەو دیوەوە..

کردۆتە  هێلانە بۆ خۆ

بە یەکەوە ئەگمێنن

بەدەنوك ئەدەن لە شوشە

وەك حەز بکەن بماندوێنن.

ئەیانبینم:

چاوی بادەمی زەرد باویان

ئەبڕنە چاوی خەمگینم

بەماڵی نوێی

پشت لە گڤەی بەر ڕەشەبا

بەختیارن

نە تینوو، نە برسیانە

مل لە باڵی یەك هەڵئەسوون
باڵە فڕێی خۆشییانە.
ئەی جووتە کۆترە شینکەکە!
من نازانم لە کام مەڵبەندەوە هاتوون؟
کام ڕێگای دوورتان بڕیوە
ئاوارەن و هێلانەتان لێ شێواوە؟
چیتان دیوە؟!
من نازانم! بەڵام ئەی داخ
ئەی جووتە کۆترە شینکەکە
ئەی داخ.. ئەی داخ
تەمەنی ئەم شادیەتان
ئێجگار کورتە
ئەی جووتە کۆترە شینکەکە
ئەی نابینن دەم و چاوم
ئەڵێی کانیەکە وشك و
پەستیم هەورەو داپۆشیوە
ئەی نابینن دڵم ئەڵێی
شەمامەیەکی گوشراوەو
نیگای تەڕی خۆی نەسڕیوە
ئەی جووتە کۆترە شینکەکە
باڵ لێك مەدەن.. مەگمێنن
بەیانی دێن

**نازیەکان دێن، ئەم گەڕەکە**

**ژورەکەمو ژورەکەتان**

**ئەڕوخێنن!**

*ئـەم شـیعرە لـە رۆژانێکـدا وتـراوە کـە ڕژێمـی خـوێنو سـێدارە کەوتـە ڕوخاندنی هەندێ لە گەڕەکە میللییەکانو ئاوارە کردنـی سـەدان خێزانـی کوردو دەربەدەر کردنیان.

# گریان

ـ ئەو دارستانە بۆ ئەگری؟!

ـ ڕەنگە درەختێکی گەنجی لێ مردبێ.

ـ ڕەنگە زریانی دوێنێ شەو

کچە چنارێکی شۆخی فڕاندبێ.

ـ ڕەنگە هەواڵی کوشتنی

پۆلە مەلێکی عاشقی

خۆی بیستبێ!

ـ ئەو.. ئەزانێ

لەسبەینیەوە بە تەنها

جێ ئەمێنێ

وەختێ گوندی خۆشەویستی

هەزار ساڵەی

لە لووتکەوە

بۆ بەرەوخوار دائەگیرێ!

1980

## نیشانە

لەدوای "مەسیح"

خاچ بوو بەنیشانەی دییان

ـ ئەی بۆ شەهیدی کوردستان؟!

ـ من نیشانەو

مەدالییای

سێدارەیەك دروست ئەکەم

هەتا یەك یەك

بیدەن لە یەخەو بەرۆكتان.

1980

## دەرمان

بۆ شەهید دوکتۆر بەختیار

**من خۆم پزیشکم.**

**بۆ تیماری زام**

**دەرمانی هەزار**

**برینی لەشی**

**دەردەدارم کرد**

**بەڵام بۆ زامە قووڵەکەی لەشی**

**ئەم کوردستانە**

**دەرمانی چەكو فیشەکم هەڵگرت.**

1980

# گەردەلوول

شیعری سرود

براینە!

تەماشاکەن

لەو پێ دەشتانەی خوارەوە

هەتا چاوی چەکمان بڕکات

گەردەلوولی سووری ئێمە

چۆن هەڵ ئەکات؟

تەماشاکەن

لە گێژەنی تووڕەبوونیا

لەگەڵ خۆیدا

دوژمن تا کوێ ڕاپێچ ئەکات؟

گەردەلوولە.. گەردەلوولە

گەردەلوولی گەرمیانە.

تەماشاکەن:

لەو پێ دەشتانەی خوارەوە

بە دێهاتو بە شارەوە

له "سەرقەڵا" وە تا "دوبز"
له "دوز" ەوە هەتا "هەكز"
ئەم شمشێرە سوورەی شۆڕش
چۆن ئامادە
لەڕووی مەرگا هەڵكێشراوە.
گەردەلوولە.. گەردەلوولە
گەردەلوولی گەرمیانە
براینە!
تەماشاكەن
لەو پێ دەشتانەی خوارەوە
كە وەك لەپی دەستی ڕەنجدەر
هەڵقرچاون
كەوەك قاچو قوولی ڕووتی هەژار
قڵیشاون
تەماشاكەن:
چ ئاگرێ بەربۆتە شەوی ئەو ناوە
چ دۆزەخێ بۆ داگیركەر داخراوە
گەردەلوولە گەردەلوولە
گەردەلوولی گەرمیانە.

1982

# لێبووك

**شیعرێکی لێبووکی پایتەخت**

**لە دیواری کوردستانی**

**نووسی: بەهەشت.**

**کە شەو داهات**

**کە خەو پەنجەرەی چاوانی**

**شاری داخست.**

**ئەوسا ئیتر**

**بەدەم ڕێوە**

**پرچەکانی "سنەوبەر"و**

**ڕیشە درێژەکەی "سیروان"**

**تێك ئالآنو**

**ئەو بەهەشتەیان سڕێوە!!**

1982

*لێبووك: موهەریج

# بووکە سەماکەرە

شاعیرێکی بستە باڵای
دەرباری شا
شیعری بووکە سەماکەرەی
تەمەن کورت بوو
زۆر کەم ژیا
هەر کە سوڵتان هەستایە پیان
هۆڵی جێ هێشت چووە دەرێ
هەر ئەوەندەی:
تا ڕادیۆکەمان بێ دەنگ کرد
تەلەفزیۆنمان بێ ڕەنگ کرد
ڕۆژنامەمان کرد بەسفرە
ئیتر شیعری بستە باڵاش
بوو بە ـنەبووـ
هەردەمو دەست.
ڕۆحی دەرچوو.

1982

# پیاو

بۆ جگەرگۆشەی شەهیدە قارەمانەکان،

بۆ منداڵانی کوردستان دیاریو یادگارە

مامۆستایەك بەناو پۆلدا

ئەهات. ئەچوو

باریکەلەو غەمگین وەکوو

جوانوویەکی لە ڕەو وون بوو.

ئەهات.. ئەچوو

مەکۆی ژان بوو.

دەمو چاوی:

لە "مانگ "ی تازە گیر خواردووی

ناو تەمێکی ئەستوور ئەچوو

هەر هاتو چوو

مەکۆیەکی بێ ئارام بوو

هەر هاتو چوو

بەسەرنجی وێڵیا دیار بوو

خەیاڵی ئەو

وەك گەواڵە هەوری دەم "با"
بۆ شوێنێکی دوور فڕی بوو.
هەر هاتو چوو
لە چۆلەکەی
هێلانە لێ شێواو، ئەچوو.
لە پڕێکدا
ئیستێکی کرد
دەستی بۆ بەر باخەڵی برد
چاویلکەکەی کردە چاوی
تا چرکەیەك تاس بردیەوە
لە دوایدا
هێدی
هێدی
ئەم شیعرەی بۆ پۆل خوێندەوە:
مناڵینە!
پێش چەند ساڵێك
پیاوێك هەبوو
تەماشاکەن:
تاکوێ دەستم هەڵبڕیوە
وا کەڵەگەت!
ناوشانی پان، مل بەرزو کەڵ.
لەش پڵنگیی.

ڕەوت گورجو گۆڵ.

ماسوولکەی ڕان

وەك بەرد پتەو

ماسوولکەی قۆڵ.

ڕەنگی چاوی

مەیلەو سەوزی بریقەدار،

هەر وەك گۆمی بەرهەتاوی،

ڕوون تا بن دیار.

بزەی تەڕی وەکوو باڵی

پەپوولەیەك ئاونگاوی

هەرگیز وەنەوشەی سمێڵە

باریکەکەی جێ نەئەهێشت.

جار جار تورە

وەك ڕەشەبا.

ناو بەناویش وەکوو شنە

زۆر لەسەرخۆ.

هەندێ جاریش گاڵتەکانی

پەردە دڕی دەم بە قاقا

قسەکانی خۆش‌و شیرین

هەر وەك گەزۆ.

★ ★ ★

مناڵینە!

ئێوە کەستان هەر نەبوو بوون
کە ئەو پیاوە
کوڕی شاخ‌و کوڕی بەفرو
پێش مەرگە بوو
ئێوە کەستان هەر نەبوو بوون
کە ئەو پیاوە
پڵنگێکی کوردستانی،
ناو لێرەوارو بێشە بوو
بازی باڵ سووری بەچنگی
سەر سەفین‌و
سەر هەڵگوردو
سەگرمە بوو.
مناڵینە!
چەم‌و ڕووبار خۆشیان ئەویست
شەوان درەنگ
بە هاژە ئەیانکردە خەو.
شەماڵ هێواش بە لەپی دەست،
ئارەقەی ناوچاوی ئەسڕی.
درەختەکان:
بە پۆپشمینی سێبەریان
کە پاڵ ئەکەوت
باڵای بەرزیان دائەپۆشی.

نمەی باران‌و منداڵان
خۆشیان ئەویست
گوڵ بارانی قژیان ئەکرد.
هەژارەکان خۆشیان ئەویست
ئەو خەمی ئەکردنە کۆڵو
ئەمانیش گشت دەست لە ملان
ماچیان ئەکرد.

* * *

مناڵینە!
ئێوە بووبوون، کە ڕۆژێکیان
نیوەڕۆ بوو
کوردستانمان تاریك داهات.
نەهەنگێ هات
چیای قووت دا
بەردی کرۆشت
ڕووبارەکانی هەڵلووشی
مناڵینە!
کۆست بوو، کۆست بوو کۆستی نەهات!
مناڵینە!
چیمان لێ هات
چیمان لێ هات!

* * *

منالێنە!

با بێ ینەوە سەر ئەو پیاوەی

لەو دەمەدا

دڵی لیمۆیەکی زەرد بوو

لیمۆش خاکی کوردستان بوو

کوردستانیش سیس‌و گوشراو

★ ★ ★

منالێنە!

کێ بێ.. کێ بێ؟!

سواری ئەسپەشێکەی خۆی بێ.

لە ئاوزەنگی تێ‌تەقێنێ

کێ بوێرێ؟

درِ بە تاریکی‌و بەترسی

ئەژدەهاکی تازە بدات؟!

کێ بێ بڕوات؟!

بچێ ڕاوی نەهەنگ بکات

ئاو بۆ شارو گوندی تینووی

ئێمە بەردات؟

کێ بێ بڕوات؟!

★ ★ ★

منالێنە!

ئەو سوارانە سوار بوونەوە

ئەسپەکانیان نەفرۆشتبوو

دڵیان نەدا بوو بە کرێ

کلیلی دەربەندو شاخیان

بەجێ نەهێشت بۆ هیچ دزێ.

ئەو سوارانە سوار بوونەوە

شەوی درێژ نەیخەواندن

تاریکە ڕێ نەیگلاندن.

⋆ ⋆ ⋆

سوار بوونەوە

وا بەرەو ژوور

جڵەویان سووڕانو، ڕوویان

کردەوە هەواری خاڵی.

ئەوا حیلەو چەپۆکانی

ئەسپی یاڵ بژ

شریخەی ناڵی گڕ هاوێژ

بەدەم هۆرەو قەتارەوە

سەر ئەکەون.

یەکەم جارە خۆیان ئەکەن،

بە دەربەندا

یەکەم جارە نەهەنگ لە خەوی خۆشی دواى،

هەرەس ئەکەن!

لە تاریکیی چاو نەبیندا

لەو دەمەدا

سەرو ملی ئەو سوارانە

کۆمەڵێ مۆمی کافووریی داگیرساو بوون

هەر کەترووسکە دای لە کەژ

درەخت زەردەخەنە گرتی.

هەر کە ترووسکە دای لە ئاو

شەپۆل گوڵی دا لە قژی.

هەر کە ترووسکە دای لەماڵ

خەمی هەژاران پێکەنی.

* * *

مناڵینە!

ئەو .. ڕۆژانە

ئەو.. پیاوانە

ئەو.. سەردەمە

ئەو.. چەند کەسە

وەك دارەڕای

ژووری سەپانێکی لادێ

وەك ئەو وانانەی ئەیخوێنن

ئەتژماردن..

یەكو دووانو سیانو چوارو..

وەك پەنجەکانی مام ڕۆستەم،

باخەوانی قوتابخانە

لە دوو دەستا دوو پەنجەش کەم!
منالێنە!
بەڵام ئەو چەند پەنجەو دڵە
ئەو سەردەمە
دڵو پەنجەی
ملیۆنان بوون
ئەو چاوانە
چاوی هەموو
پارچەیەکی کوردستان بوون.

* * *

منالێنە!
ڕۆژ هاتو چوو
بەرە بەرە چاوی نوستوو
خۆیان لەدەس خەو ڕاپسکان
مۆمی زیاتر
لەسەر دوندو
ناو ئەشکەوتو
تاشە بەردەکان داگیرسان
منالێنە!
ئەو ڕۆژگارە.. تاڵ بوو.. تاڵ بوو
هەر ئێجگار تاڵ
کونە گورگو

کوونە ورچو

کلۆری دار

ئەکران بە ژوور، ئەکران بەماڵ.

* * *

مناڵینە!

ئەوانەی تەپلەی ئاسنیان

لەسەردایە

ئەوانەی بەرگی کوشتنیان

لەبەردایە.

دەستیان ئەخستە سەر دەمی

زنەو کانیی

زنەو کانیش وەکوو منداڵ

وەکوو ئێوەی چاو گەش چاو گەش

لە دوای یەکدوو شڵپەو نووزە

لە ژێر دەستیاندا ئەترسان

لە ژێر دەستیاندا ئەخنکان

ئەچوونە سەر:

پیرە داری باپیرەی دێ

پیرە داری قەد کۆماوەی

سەر لق لەرزۆك،

ڕدێن درێژ

شاپڵێتەیان ئەخستە ناو

هەناوێوە

هەتا ئەبوو بە خۆڵەمێش.

شەو درەنگان

ئەچوونە سەر:

ماڵی شیعرو ماڵی چیرۆك

ماڵی "بێکەس" ماڵی "بلە"

ماڵی هەر خامەیەك بەرگی،

"سمکۆ"و "شێخ" یان بپۆشیایە

هەر قەڵەمێ فەقیانەکەو،

جامانەکەی "مامەیارە" ی ببەستایە

بەپەیژەدا

بۆ سەر سەربان سەرئەکەوتن

ئەچوونە خوار

لەناو جێدا ئەیانگرتن

لەدواوە دەستیان ئەبەستن

بەپەڕۆ چاویان ئەبەستن

ئیتر ئەبران

لەپێچێکدا

لەدۆڵێکدا

لەگۆمێکدا

دوایی سەرەونگون ئەکران.

* * *

منالێنه!

ئەو.. ڕۆژانە

ئەو.. پیاوانە

ئەو.. سەردەمە

ئەو.. چەند کەسە

ڕووتەڵە بوون وەکوو شاخی "مامەڕووتە"

وەکو "قانع".

سکیان وەك جامی فافۆنی تێك قوپاو بوو

تینووشیان بوو

وەك"هەڕوتە"

بەسێو چوارێکو.. یەك تفەنگ

بەسێو چوارێکو.. لێفەیەك

بەسێو چوارێکو.. خەپلەیەك

بەڵام بە هەمووشیان یەك دەنگ!

منالێنه!

ئەو.. ڕۆژانە

ئەو.. پیاوانە

ئاگریان بۆ ئاگردانی

ساردەوەبووی کێوان ئەویست

ئاگر نەبوو.

تفەنگ داوای گوللەی ئەکرد

گوللە نەبوو.

قۆڕەی سك داوای لەتێ نان،

زیادی ئەكرد

لەت كوا هەبوو!

منالێنە

هیچیان نەبوو

هیچیان نەبوو

تەنها هەر خۆشەویستیو باوەڕو

چاوی گەشی ئێوەیان بوو!

منالێنە!

بابێینەوە سەر ئەو پیاوەی

بەدوای چاوی كوردستاندا

بەشوێن پشكۆو گوللەو ناندا

هەر ڕۆشتو ڕۆشت

مامزی سرك،

شوور و،

بەران

ماندوو بوون، ئەو

ماندوو نەبوو

دەمێ ئەبوو

بە "ڕەشەبا"

دەمێكی دی

بە برووسكە.

ئینجا ئەتدی پەلەوەرە
بۆتە قولنگ
بۆتە شاهۆ
جارێکی تر ئەتبینیەوە
شوانی گوندو ڕانە مەڕە.
گردی دڕكو داڵی بڕی
شاخی قەڵو داڵی بڕی
خێڵگەی کەڕو لاڵی بڕی
هەتا دواجار
کوڕی شوانکار
وەك قولنگی باڵ بریندار
گەیشتە ناو توونی بابای
ناوچەی هەکار.

* * *

مناڵینە!
ئەو.. سەردەمە
دۆستیَ وتی:
هەر بگەنە ماڵی ئێمە
ئاگردانمان پڕ پشکۆیە
پشکۆ بەرن
کۆشی ژوورو
گیرفانی تاقو هەیوانمان

پڕ گوللەیە

گوللە بەرن

نانمان هەتاکوو لای بن میچ هەڵچنیوە

هەر نان بەرن.

منالێنە!

ئەفسوس.. ئەفسوس

دۆستی سالووس

کە چووینە بەر ئاگردانی

خۆڵەمێشمان کرد بەسەری

درۆکانیا

بەڵێن بوو بوو:

بە جرجێکی

بۆدڕ و پیس

ئەگەڕا بە شوێن کونێکدا

خۆی حەشاردا.

⋆ ⋆ ⋆

منالێنە!

هیچ لە ئێوە ناشارمەوە

بۆ بەڵێنە بێ قاچەکەی

خانەخوێی دۆست

لەدواییدا

چەکەکانمان

خامەکانمان
هەموو لێوی خۆیان کرۆشت.
⋆ ⋆ ⋆
منالێنە!
وا قولنگی باڵ خوێناویی
باڵ لە بەفری نواباریو، ئەخشێنێ
لە کێڵگەی سەهۆڵ بەنداندا
خوێن ئەڕوێنێ.
ئەستێرەی سوور
کەمێ ئەفڕێتو ئەکەوێ.
مانگی زامدار
تۆزێ هەڵدێو
لە دوایشدا
ڕەنگ زەرد.. ڕەنگ زەرد
لە نوێنی هەورا ئەخەوێ.
⋆ ⋆ ⋆
زامەکانی ئەستێرەی سوور
تینوویانە
چاو بۆ کانیەك ئەگێڕن
کوڕەکانی خاکی زامدار
برسییانە
بۆ بنچکێ،
گژوگیایەك.. چاو ئەگێڕن.

مناڵینه!
له هەكارا
له هەكاری تارومارا
گوڵه گەنمەكانی شۆڕش
لەبرساندا زۆریان مردن.
جۆگەكانمان لەتینوانا
زۆریان مردن
مناڵینه!
ئەوا هاتن
نزیكو دوور به لووره لوور
گورگەكانی هەكار هاتن
لەو دیو.. لەم دیو
به ڕەو هاتن
به ئەڵقەیەك دەوری مانگی
زامداریان گرت.
ئەوا ئیستا مانگ گیراوه
ئەوا ئیستا ئەستێرەی سوور
دەم بەستراوو
دەست بەستراوه،
لەسەر پشتی گورگێكی ڕەش
برینی شەتەك دراوه.
* * *

منالێنه!

کوشتیان!

کوشتیان!

وەختێ کوشتیان

سەعات هەشتی بەیانی بوو

تەمو مژ ئەرخەوانی بوو

وەختێ کوشتیان:

خونچەیەك تازە ئەپشکووت.

پاسارییەك تازە.. تازە

خەریکی باڵەفڕێ بوو.

ماسیەکی بن گۆم، تازە

گەڕای ئەخست.

کارژۆڵەیەك تازە ئەبزووت.

منداڵی چەند شەهیدێکمان

دارە دارە

تازە تازە

پێ یان ئەگرت.

وەختێ کوشتیان

سەعات هەشتی بەیانی بوو

تەمو مژ ئەرخەوانی بوو

هەر هەمان سات

لە کەرکوکدا

یەکەم جار بوو کیژۆڵەیەک

لە پۆلی یەک

پەنجەی خرپنی هەڵبڕێ

یەکەم جار بوو

فێر بێ ناوی،

"عەلی" باوکە پێشمەرگەکەی

لەسەر تەختەی ڕەش بنووسێ!

مناڵینە وەختێ کوشتیان

سەعات هەشتی بەیانی بوو

تەمو مژ ئەرخەوانی بوو

کە ئەویان کوشت

هەر هەمان سات

"مەرگەوەرێك" زیندو بۆوەو

دەستی گوڵ کوژانی، گوشی.

"مەلای خەتێ" یەك هاتەوەو

بەپێی پەتیو سەری قۆتی

سەرکەوتەوە سەر منارە!!

مناڵینە

کە ئەویان کوشت

"موشیرێکی" تر هاتەوەو

دەرگای دەربەندی بۆ پیاوکوژ

ختسە سەر پشت

کە ئەویان کوشت
سەعات هەشتی بەیانی بوو
تەم‌و مژ ئەرخەوانی بوو
ئەو وەختەی کەوت:
چاوی سەوزی
گەڵایەکی سەوز ماچی کرد.
قژی ڕەشی
وەنەوشەیەك خۆی تێئاڵان.
کانیی خوێنی
ڕەگێ دەمی خۆی پێوەناو،
هەڵیمژی.
مناڵینە
لە هەکارا
لە هەکاری تارو مارا
هەتا ئیستەش لەو دۆڵەدا
ئەویان تیا کوشت
لووتکەیەکی سەر بە هەور
کە سەعات هەشتی بەیانیی،
ئەو ڕۆژە "عەلی" بینیبوو
هەتا ئیستەش
بەردەوام هەر ئەناڵێنێ.
بەردەوام هەر ژانەکانی

لەلانکەی بەردیینی دڵیا

ڕائەژەنێ.

ئەو درەختانەی کە سەعات،

هەشتی بەیانی ئەو ڕۆژە

"عەلی عەسکەری" یان دیبوو

هەتا ئیستەش چاویان تەڕە

هەتا ئیستەش گەڵای بسکیان،

ئاڵۆزکاوە.

بە شانەی "با"

کاکۆڵیان دانەهێناوە.

منالێنە!

لەو ڕۆژەوە هەموو سەعات،

هەشتی بەیانییەك تاقە کوکوختیەك

لەسەر درەختێکی نزیك

هەڵئەنیشێ

گۆرانییەکی زۆر غەمگین

غەمگین تر لە:

"خاڵەی ڕێبوار"

غەمگین تر لە:

"هۆرەو قەتار"

بۆ ئەو ئەڵێ و

ئینجا بە باڵ، بەپەڕەی باڵ

چاوی ئەسڕێو

لەدواییدا

بۆ دوور ئەفڕێ!

منالێنە

هەر بەتەنها دڵدارەکان چاویان لێ یە:

لەو ڕۆژەوە هەموو سەعات

هەشتی بەیانی یەك.. "مەم"ێك

زۆر کوتو پڕ

لەو شوێنەدا پەیدا ئەبێ

بۆ "زین" چەپکێ

لەگوڵاڵەی سووری چاو ڕەش

ئەچنێتو ئیتر لە چاوان ون ئەبێ؟!

* * *

جوتیارێکم ئەم زەوی یە:

وەك بەری دەستم ئەناسم.

ئاسمان: وەکوو دەمو چاوم.

ڕووەك: وەك سمێڵو ڕیشم.

ئەزانم کەی

زەوی ئەزێ؟!

ئەزانم کەی

هەور ئەمرێ

کەی ئەستێرە،

به بووك ئەبرێ!
باران كەی منداڵی ئەبێ؟
گێژەڵووكە:
كام كڵاوی گرد ئەفڕێنێ؟
دارستان كەی،
قاچەكانی ئەجوڵێنێ؟
مناڵینە!
بۆیە ئەڵێم:
هەوری خوێنی "عەلی"و "خالید"
چاوی ئەستێرە سوورەكان
بەڕیز هەموو.
دڵی "مانگ"ە كوژراوەكان
وەكوو "عەزۆ"
بەڕیز هەموو.
دەنگی خەرمانانی برسی
دەنگی كانیاوی تینوو
بەڕیز هەموو.
لە هەكاردا
لە هەكاری تارو ماردا
كە چەخماخەیان دایەوە
كە گرماندیان
كە دایان كرد

**که دارڕژان**

**ئینجا پەڵەی تەواوی دا**

**وەرزی سووری ئەمجارەمان.**

1982

# شەماڵ

با پاساریی یان کەویش بم

هەموو شاخێ من ناناسێ.

با دارستان یان کەژیش بم

هەموو "با" یەک ڕامناژەنێ.

با سەرچاوە، یان بەفریش بم

هەموو مەلێ خۆ نەیدیوم!

با ماسیش بم

هەموو گۆمێك

ئاشنای مەلەو مۆلگەم نییە.

با شیعرێکی عاشقیش بم

هەموو "وەلی"و

هەموو مەمێك

چاویان لە گریانی وشە و

پێکەنینی بەستەم نییە.

من "شەماڵ"م نەبینیوە

قەت دوو بەدوو



2

چاوی‌و چاوم

بەیەکەوە دانەنیشتوون.

دەستم قسەی

لەگەڵ دەستیا نەکردووە.

وەکوو تەرزەو وەکوو گڕە

قەت پێکەوە نەبینراوین

ئەو کەڵی ناو شاخان بووەو

منیش شیعرێکی شارنشین.

ئەو سەرچاوەی زەڵم بوەو

منیش شەقامێکی غەمگین.

من نازانم ئەو چاوانە..

ڕەنگیان وەکوو:

کراسی دایکی شەهیدان؟!

وەکوو سەروو سنەوبەری

چنارۆک‌و هەیبەت سوڵتان؟!

وەکوو کێڵگەی گوندی "باخ"و؟!

دەشتی ئەولای "کانی وەتمان"؟!

من نازانم ڕەنگیان چۆن بوو

تەنها ئەوەندە ئەزانم

ئەو چاوانە..

وەختێ لەسەر دوندی قەندیل

بوون بەچرا.

تازە یەکەم ڕەوە ئەسپی
سووری ئێمە
بە تاریکیی کوردستاندا هەڵ ئەگەڕا.
تازە یەکەم هۆرەی خوێنی
حوزەیرانی ئەو هەوارە
ئەبوو بە لاوکی ڕێگەی
بەرەو پیرچوونی سێدارە.
ئەو چاوانە
وەختێ لەسەر دوندی قەندیل
بوون بەچرا
لەو کاتەدا
چاوانی پیاوی کەرەجو
پاڵەوانانی هەلاتوو
ئەو چاوانە:
تۆپی بلیارد
دەنکە تەزبیح
پاژنە هەڵکێش
مorووی ملی گەماڵی شا
گوڵی خوێناویی سەر سنگی
پێڵاوەکەی شا بانوو بوون
لە تارانا!

* * *

من "شەماڵ"م نەبینیوە
وەك چۆن "قودسی"و
گۆمی وانو
دوکتۆر فوئادو "قامیشلی"م نەبینیوە؟!
من نازانم کەڵەگەت بوو؟!
باڵای بەقەد،
باڵای هەناری گوڵکردووی گوێ تانجەرۆ؟!
هێرۆی ئاڵی ڕێی قەرەداغ؟!
بەقەد بەرزیی
لەسەر یەکی
هەردوو چەکی
"عەلیو خالید"
بوو؟! نەئەبوو؟!
من نازانم باڵای کورت بوو؟!
وەکوو باڵای
بڕنەوی کورت؟
وەکوو "ڕەنجبەر"؟!
وەکوو "ئارام"؟!
وەك دەروازەی نزمو نەویی
ماڵە هەژارانی لادێ؟!
من نازانم لەڕ بوو وەکوو
ئاسکە کێویی؟!

یان بەخۆ بوو وەکوو "شەهاب "؟!
من نازانم
من هەر ئەوەندە ئەزانم
ئەو بالآیە..
وەختێ لەسەر دوندی قەندیل
بوو بە تارای سوورمەچنی
کەژاوەکەی شۆڕشی نوێو
شەکایەوە..
وەختێ ئەو کردی بە زریان
وەختێ ئەو مردنی تۆقان
بەژنی پیاوانی ناو کەرەج
بەژنی پیاوانی هەڵاتوو..
نزم نزم..
بستە باڵا
سەری کەسیان
خۆی نەئەدا..
لەقەراغی جزمەکەی شا!

⋆ ⋆ ⋆

ئەوەی "شەماڵ" ی وەکوو من
قەت نەدیوە..
با بەیانیان ئەویش لەگەڵ
تیشکا هەستێ

**له گەردنی ئەو کێوانە**

**لە بەژنی تەڕی دارستان**

**لە چاوی چەمو قەڵبەزە**

**وردبێتەوە**

**دڵنیابێ**

**وەکوو باڵا**

**وەکوو نیگا**

**وەکوو بڕوا**

**وا بزانێ ئەو ئەبینێو**

**ئەوی دیوە.**

سلێمانی/ 1983

# میوان

بۆ شاعیری شەهید "جەمیل رەنجبەر"

نیوەشەو هەندێ جار کە شیعر

ئەمباتە ناو دنیای سیحراویی خۆیەوە

ئەمخاتە سەر باڵی خەیاڵی دوورە فڕ

ئەوساتە ساماڵ بێ یان زریان

باران بێ یان بەفر

ئەبینم.. گوێم لێ یە:

وا دەرگای حەوشەمان

جیڕەیەك ئەكاتو تۆزێكی ئەترازێ

ئەبینم.. بێ خشپە، لەسەر لا

چاو زیتێ

قژنێ، ڕیشنێ

باڵا كورت

هەناسە سواربوویەك

هەروەكوو مامزێ پێكرابێو ڕاونراو

بەپەلە خۆی ئەكا بە ماڵدا

دوو پشکۆی بیلبیلەی
بەدەوری حەوشەدا ئەگێڕێ
ئاوڕێ.. دوو ئاوڕ
ئەوساکە بەرەو ژوور
هەنگاوی خێراتر هەڵئەگرێ
ئەگاتە بەردەمی پەنجەرەی ژوورەکەم
ئەوەستێ
بە پەنجە چەند جارێك لەسەریەك
لێی ئەدا:
ـ تەق. تەق. تەقـ
بەئەنقەست دووجاریش
لەسەریەك ئەکۆکێ..
" تێئەگەم خۆیەتی:
"جەمیل" ە
لە دوور را هاتووە
ماندووە
ئەزانم:
لەم ناوە بەتایبەت لایداوە
بۆئەوەی سەردانی من بکا!"
ئەشڵەژێم، خەریکە پەنجەرەم لێ ئەبێ بە دەرگا
سەرسمێك ئەدەمو پێ خاوس ڕا ئەکەم
هەر لەبەر هەیواندا

باوەشی پیا ئەکەم

هەر وەکوو دوو لقی

دوو داری ڕاستو چەپ تێك ئالاو

من سەرم ئەخەمە سەر شانی ڕاستی ئەو

ئەو سەری ئەخاتە سەر شانی ڕاستی من

نە جارێ  نە دووجار نە دەجار

تۆبڵێ هەزارجار

پەلاسی ناودەمی

ئاوێنەی تەوێڵی

گەردنی ڕەنگ لیمۆی ماچ ئەکەم

گولاڵەی برینی سەرسنگی ماچ ئەکەم

ئەو وەختەی کە دەستمان لێك بەردا

بەرامبەر یەکتری دانیشتین

لە بالا ئاوێنەی  دیواردا

تەماشای خۆم ئەکەم.. ئەبینم

سەرسنگم سوور بووە

ڕوخسارم سوور بووە

ژوورەکەم سوور بووە

بۆن ئەکەم

دەستوپل  بۆنی گرت

بۆنی گوڵ، بۆنی خاك، بۆنی گیا

جل بۆنی بارووتو قژ  قەوزەی ڕوبارو

ژوور بۆنی گۆگردی

ئەشکەوتی ناو چیا

★ ★ ★

سەرەتا بێدەنگیی خوێنێکەو ئەمگرێ

سامێکەو زمانم ئەبەستێ..

ئەو کاتەی چنگی خوێن بەریدام ..

هەڵئەستم:

چایەكو پەرداخێ ئاو دێنم

هاڵاوی چایەکەو هاڵاوی هەناسەی

تەمێکە بۆ: کەمێ

لەڕوومان ئەنیشێ.

ـ جەمیل گیان لاواز بووی

لاوازی

وەك کۆترە باریکە

وەك وەلی دێوانە

وەك قەڵەم.

بەیەك بین ئاوەکە هەڵئەدا

چایەکەی بەردەمی تێك ئەدا

قومێکی لێ ئەداو دەستی چەپ

ئەخاتە سەرشانم:

ـ لاواز بووم؟!

شاخو داخ چاوەکەم! شاخو داخ

شاخ خاکەو شەم دایکەو

من وەلی دێوانەو
من کۆترە باریکەی "کۆمەڵە"و
بۆ پەنجەی زارۆڵی هەژاران،
من قەڵەم.
پاش تۆزێ دەست ئەبا
لە پزووی شەرواڵدا
چوکلێتە نامەیەك
دەردێنێو ئەمداتێ
بەدەنگێ، وەك وژەی دارستان بمدوێنێ
وەك شەپۆل، هاژەی دوور
بمگاتێو بمدوێنێ
پێم ئەڵێ:
ـ دوێنێ شەو کە دیمن سێ قۆڵی
"شەهابو جەعفەرو ئەنوەر" بوون
هەرسێکیان لەسەر ئەرز چوارمشقی
لەدەوری ئاگری بە کڵپەی
ماڵێکی کۆچەردا دانیشتن.
هەر لەوێ، هەر لەبەر ڕوناکیی ئاگردا
بە نۆرە هەر یەکەو دێڕێکی نامەکەی
بۆ کیژ و .. بۆ کوڕی
قوتابی پێشمەرگەی شار نووسی.
⋆ ⋆ ⋆

سەعاتێ زیاترە لە چاویام

تەماشای خۆر ئەکەم.

سەعاتێ زیاترە لەدڵیام

گوێ ئەگرم لە خوێن‌و سەر ئەنێم

بە سنگی خاکەوە.

سەعاتێ زیاترە من ئەوم , ئەو منە

من پرسیار

ئەو وەرام

ـ جەمیل گیان بێدەنگی  دە بدوێ؟

ـ مەنزڵم.. بڵاوە.

هەر ئەمشەو من ئەبێ پێیەکم لێرە بێ‌و

ئەویتر لە —بۆکان ـ

هەر ئەمشەو من ئەبێ

بە سواری ئەسپە ڕەش

دەمامك هەڵبەستوو

خۆم بکەم بە "قەڵای هەولێر"داو

هەر ئەمشەو سەریش بەم

لە "مەم"ی هەژاری ناو "بۆتان"

وا "جەمیل" بە پێوە وەستاوە

بەژن سوور

هەر ئەڵێی هەناری گوڵ کردووی

گوێ ئاوە

به ژوور دا چەند جارێك دێو ئەچێ
ئیستێكو لەبەردەم دۆلابی
ـ "سەردەمێ دۆلابی حاجەتی موبەقو،
ئیستاكە كتێبا"ـ ئەوەستێ.
ئەوەتا دانەویو لەخانەی دووەمدا
سەروو خوار ورد گەڕا دەستی برد
دیوانی "بێ كەس"ی دەرهێنا
هەر وەكوو یەكەم جار
مەلۆتكەی جگەری تاقانەی هەڵبگرێ
بەو جۆرە هەڵیگرت
لەسەرخۆش چاوانو ڕوومەتی
دیوانی هەڵمژیو ماچی كرد.
ـ بۆ ئەڕۆی ئەی ئاسكە سوورەكە
بۆ ئەڕۆی!
بۆ ئەڕۆی ئەی مانگی
كاكۆڵ ئاڵ بۆ ئەڕۆی؟!
بەم شەوە بۆ ئەڕۆی
بارانەو ڕەهێڵە
دە توخوا هەر ئەشرۆی
گولاڵەی زامێكی سەرسینگت
لەلای من جێبێڵە.
ـ بەنگ نابێ عەشقێكی ڕەوەندەو

**به تەنیا لە ماڵێ لانادا**<br>
**بەنگ نابێ خەمێکی کێویی یەو**<br>
**بەتەنیا لە شاخێ لانادا.**<br>
**پێخاوس بە دوایدا ڕائەکەم**<br>
**نایگەمێ.. تیشکێکەو.. نایگەمێ**<br>
**ـ بارانەو ڕەهێڵە**<br>
**تەڕ ئەبی ـ جەمیل ـ گیان**<br>
**تەڕ ئەبی!**<br>
**وا ئیستە گەیشتە بەر دەرگا**<br>
**ئیستێك‌و بۆ ساتێ ڕاوەستا.**<br>
**ئاوڕی دایەوە، سەرێکی هەڵبڕی**<br>
**مانگی سوور لە شەوی**<br>
**ڕەشپۆشدا پێکەنی**<br>
**ئەوساکە دەستی برد،**<br>
**لەپەنا دیواردا**<br>
**چەترەکەی هەلگرتم**<br>
**بێ خشپە، لەسەر لا**<br>
**بە درزی کراوەی دەرگادا**<br>
**تێپەڕی‌و..**<br>
**بەتەنیا جێیهێشتم!.**

1983

## ڕووبار

دڵنیابن! شیعر خوێنمە
ڕەنگە بۆ پەستیی شاژنێك
بۆ دڵ تەنگی پادشایەك
بۆ ترسی دوای خەو زڕانی
کچە میرو شازادەیەك
بە دڵۆپێ چەند دڵۆپێ
زەردەخەنەی خوێنی شیعرم
وەکوو سامالْ
دڵی پاشا ڕوون کەمەوە.
وەکوو هەتاو
پەستیی شاژن ڕابماڵم
وەك گوڵە باخ
ترسی شازادەی نەنووستوو
گەشکەمەوە..
بەڵام هەر ئەوەندەی جارێ
چووم و خوێنی شیعرم دانێ
دڵنیابن لەو ساتەوە

وشەم.. ئەمرێ.

ڕستەم.. ئەمرێ،

بەستەم.. ئەمرێ.

کەچی هەمان خوێنی شیعرم

بەم ڕۆژگارە

ڕووبارێکەو هەژاری کورد

برینی لەشی پێشمەرگە

کیژی پێ پەتی ناو کێڵگە

یەکە.. یەکە

هەر جۆگەیەو لێی هەڵ ئەگرن.

کەچی تا بێت:

مێوی بیرم هێشووی وشەی

زیاتر ئەگرێ.

باڵی بەستەم، بڵندو بەرز

ئەفڕێو ئەفڕێ.

دڵنیابن! شیعر خوێنمە.

دڵنیابن ئەو ڕووبارە

مادەم سەرچاوەکەی "سەر"ی

ئەم گەلەیە

نە کەم ئەکاو

نە وشك ئەکاو

نە ئەشمرێ!

1983

# چەند چوارینەیەك

شیعری سرود

"بۆ شەهیدانی قڕگە"

ئەو شەوەی قڕگە بوو بە گۆمی خوێن
بناری گۆیژەم سوور سوور هەلگەڕا
شاری هەڵمەتو قوربانیو بەڵێن
بزە لە لێوی سەد ساڵەی بڕا.

* * *

لە جێی هەر قەترە خوێنێکی ڕژاو
تۆڵەی یەك بە دە ئەسێنینەوە
لە جێی هەر گوڵە باخێکی سووتاو
تۆوی هەزاران ئەچێنینەوە

* * *

ئەوان هێشوویەك ئەستێرەی شین بوون
بۆ دواڕۆژی کورد ئەجریوانەوە
ئەوانیش کێردی نامەردیو قین بوون
بۆ سەربڕینیان ئەبریسکانەوە.

* * *

بەرێگەی خۆردا بەرەو سەرکەوتن

کاروانی سووری ئەم کوردستانەین

ئێمەی نەترساو لەشەوی مردن

هەر ئەبێ ئالآی سەربەستی هەڵکەین

1983

# شەهید

شەهید: نەمرە وەکوو شاخ

وەکوو بەفر، وەکوو درەخت

وەکوو بەهارو گوڵەباخ.

شەهید ئاوە

تینوێتی زەوی ئەشکێنێ.

پەنجەو دەستە

ئازاری خاك ڕائەژەنێ.

سۆمای چاوە

کام دوا ڕۆژ دوورە ئەیبینێ.

شەهید باڵای

بەقەد باڵای کوردستانە

دڵی ئازادیو بەیداخی

لووتکەی هەڵۆیستی

ئینسانە.

1983

# چەند کورتە شیعرێ

## 1ـ دوێنیٚ‌و ئەمرۆ

وەکوو هەتاو"زین" لەکویٚ بیٚ
سێبەری "مەم" لەویٚ بووە.
زەردەخەنەی گوڵ لە کویٚ بیٚ
ماچی هەنگی خۆشەویستیی لەویٚ بووە.
مانگی ئازادیی کوردستان لەکویٚ بووبیٚ.
خەرمانەی خوێنی شەهیدان لەویٚ بووە.
دوێنیٚ‌و ئەمڕۆش
سەنگەری سووری پێشمەرگە
هەڵمەتی هەڵۆی هەرێم‌و کەرت‌و بنکە
لە کویٚ بووبیٚ
شیعری منیش
وەك نارنجۆك
وەکوو گوللە
لەویٚ بووە.

## 2ـ دەنگدانەوە

ئەی خەڵکینە

ئەگەر دوێنێ

هەڵبەستێکم بوو بێ بە گوڵ

من دابێتم لە بەرۆك‌و یەخەی کەسێ

ئێوە خۆتان ئاوی شیعرو گوڵتان داوم

ئێوە خۆتان خۆشەویستتان نیشانداوم

ئەگەر ڕۆژێ

من گۆرانیم و سروودم

بووبێ بە ئاگرەکەی نەورۆز،

بەمەشخەڵ‌و لە سەربان‌و

هەیوانتانا هەڵگیرسابێ.

ئێوە خۆتان شەپۆلی دەنگ‌و ئاوازی

هەڵچووی من بوون.

ئێوە خۆتان خۆشتان کردووم.

ئێوە مێژوو بوون.. من سەردەم.

ئێوە تیشك‌و من ئاوێنە.

ئێوە ڕێگاو منیش هاودەم.

ئەگەر ئەمڕۆش

شیعرێکی من بووبێ بە تیر

نیشان: هەژاری ئەم گەلە ناوێتیەوە

کەوانم: دەربەندی شاخە.

بۆیە شیعرم
پڕ بە هەموو کوردستانم
هاوار ئەکا:
من دەنگدانەوەی دەروون‌و
زەنگی هەست‌و
خورپەی دڵی
گەلەکەمم.

## 3ـ ئەسپی ئەیلول

چواردە نەورۆز
تەمەنی ئەسپی شۆڕشی
ئەیلولم بوو.
لە نەورۆزێکدا خەنجەرمان
بە چاوی ڕاستیا داچەقان.
نەورۆزێکی تر هاتین‌و
کلکمان بڕی.
ئەسپی یەك چاو
لە نەورۆزی حەفتاوسێدا
حیلەی: گڤەی دەم زریان بوو
یاڵی: ئاڵای سەوزو سووری
لووتکەکانی کوردستان بوو.
بەڵام نەورۆزی حەفتاوپێنج

نەك هەر چاوی

نەك هەر كلكی

نەك چوارپەلی

لەبەردەمی گشت دنیادا

هەر گۆشاوگۆش

سەرمان بڕی!

1981

# دووڕیان

گەر بە دەنووك كۆتری سپی
گەڵا زەیتونی بۆ هێنام.
ئەگەر كوردستان پێ كەنی
ئازادیی لەسەر لوتكەوە
خۆی نیشاندام
شەهید وتی: من دڵنیام
ڕووبار وتی: ڕوونە ڕێگام
درەخت وتی: نەڕنراوە قەدو باڵام.
شەقامی شار
كانیی لادێ
لەبەر ئاوێنەی ئاسۆدا
گوڵە باخیان دا لەڤژی
بووكی ئاشتیی.
ئەوسا منیش بۆ هێلانەی
كۆتری سپی
تەنها هەر دڵم شك ئەبەم

پێشکەشی کەم

ئەی سەربەستی!

ئەگینا نەو کوردستانم

ئەگینا نەو شەهیدانم

نەو. نەو. نەو. نەو

چەك هەر چەکە

شان هەر شانە

کوردستان هەر کوردستانە

سەنگەریش هەر

هەمان سەنگەر

* * *

لە ئیستەدا

لە نێوانی ئاشتیو شەڕدا

من زامنی تفەنگێکی داخراوم

لە نێوانی گوڵو گڕدا

من مەلێکی هەڵکوڕماوم

ئەگەر دەرگا لەسەر دەنگم

پێوەدرێ

گەر ئازادیم باڵی بکرێ

لە ئاسمانی کوردستاندا

سەربەست نەفڕێ

چرکەیەکەو:

من زامنێکی کراوەی

تفەنگێکی تەقێنراوم

من ڕەشەبام

من برووسکەم

من لافاوم.

* * *

وەکوو زریان پشوو ئەدەم

بەڵام نانووم

وەکوو هەڵۆ هەڵ ئەنیشم

بەڵام لووتکە قەت بەرنادەم

دەستیان هێنا تەوقە ئەکەم

بەڵام دەستم قەت نافرۆشم.

وەك نارنجۆك لەسەر کەمەر

دائەنیشم

بەڵام هەرگیز..

لێوی بێ دەنگی ناکرۆژم.

وەك چۆن هاژەی

چەمو.. کەنار.

باڵندەو.. دار

جووتە دڵدار

لە یەکتری وەڕس نابن.

منی قوربانییش لە شۆڕش

لە عەشقی خاك

لەخاکی یار

**وەڕس نابم.**

★ ★ ★

**وەکوو سیروان ماندوو نابێ**

**ماندوو نەبووم**

**وەك چۆن پێ دەشتی گەرمیان**

**لەبەر هەتاو بێزار نابێ**

**بێزار نەبووم**

**من ئەو داستانە گەورەیەم**

**دوای ئاشبەتاڵ**

**لەدایك بووم.**

★ ★ ★

**ئەوسا کە چەکی هەڵاتوو**

**لە کڕنووشداو لەسەر چۆك بوون**

**من ژمارەم پەنجەکانی**

**هەردوو دەست بوون**

**هەندێ پەنجەش**

**بێ نینۆك بوون.**

**بەڵام ئیستە زەریایەکم.. نزارێکم**

**ژمارەی گەڵاو شەپۆلم دوایی نایە**

**من ئەو نەورۆزە پیرۆزەم**

**کلپەی گیانی ئەم میللەتەم لە گەڵدایە.**

1984

# بانگ

"با"ی ئەوین لە "ماردین"

کە تۆوی لاوکێ ئەفڕێنێ

شاخەوشاخ

دێ بە دێی بادینان ئەیهێنێ

بۆ ئەوەی:

لەوەردی حەیرانی سۆرانا بیچێنێ.

"با"ی ئەوین کە لەسەر ئارارات هەڵئەکا

پاڵ ئەنێ بە هەوری گەردنی چیاوە

بەرەوخوار

ئەیداتە پێش خۆیی‌و بە پرتاو ڕائەکا

ئەیەوێ زۆر زووتر

بگاتە سەر "کەلار"

تاوەکو تینوێتی گەرمەسێر بشکێنێ‌و

لەسەر ئەو بەخوڕەم دابکا.

"با"ی ئەوین، کە لەسەر مەزاری

گوڵ گوڵی مەم‌و زین

فوو ئەکا بە کونی شمشاڵی "خانی"دا
ئەوساکە هەر شیعرەو باڵ ئەگرن
هەرداو هەرد.. دۆڵاو دۆڵ
بە پۆل دێن
تا زووتر بگەنە ئاسمانی "خاكو خۆڵ"
ڕەشبەڵەك دەسبگرن لە دڵی "نالی"دا.
کە لە "وان" بای ئەوین
شەهیدێ ئەبینێ ناوەستێ
دەس ئەباو
لە قژوکاکۆڵی قوربانیی کرمانجم
لە باخچەی خۆرەتار
گوڵی خوێن ئەچنێو
لەوێوە بە باوەش
بۆ ماڵە پێشمەرگەی
ناو "کۆیە"ی ئەهێنێ.

⋆ ⋆ ⋆

ئەی خاکی جنراوم!
گوێم لێتە بانگ ئەکەی
گوێم لێتە زریانی ئازاریو هەڵ ئەکەی!
ئەی هەکار!
ئەی سەری خوێناوی کوردستان!
من بازووی لەشی تۆم، تەوێڵتم

چاو.. چاوە
گلێنەی ڕاستت بم، چەپت بم
چاو.. چاوە
هەردووکمان دووباڵی مەلێکین.
دوو سەری یەك پردی چەمێکین.
دوو برۆی پەیوەستی، ڕوخسارێ.
دوو ڕوخی  ڕووبارێ.
ئەی باکوور!
باکووری هەناسەی "بەتلیسی"
ئەی بەفری گڕگرتووی
سەر سنوور
ئەو وەختەی لەوێوە بزمارێ
بە سنگتا داکوتن
لێرەوە! خوێن لەبەر
شارەکەی من ئەڕوا!
گەر پرچی ڕەزێکت لەوێوە هەڵکێشن
لێرەوە زریکەی شەپۆلی سیروانم
سەر ئەکا
ئەی باکوور!
باکووری سێدارەو زیندانی مانگی ئاڵ
ئەی "مەمۆ"، ئەی "چەتۆ"ی
داستانی برسێتیو نانی تاڵ.

ئەو وەختەی کەلەپچەی ئەستەموول،
کەلەپچەی ڕژێمی گورگە بۆر
دەستو پێی گۆرانیی
"دەرسیم"ت ئەبەستێ
ئازادیت ئەداتە بەر سوونگی
درەختی باخانت ئەکوژێ
ئەستێرەت سەر ئەبڕێ
ئەو وەختە! نە ئیستە
باکووری برینم!
باکووری ناوچەوان بە بەفر داپۆشراو
ئەی مێژووی سك سووتاو!
لە نێوان لوتکەوە
دەستی سەوز درێژکە..
جڵەوی ئەسپەکەی شۆڕشی "حسەین"و
"عەزۆ"تم لێ بگرە
هاوارکە:
پڕ بەدەم ئەشکەوتو ناو گەلیت هاوارکە:
ڕێم بدەن.. ڕێم بدەن!
کاروانی چرامو بەرێوەم
هیوام و بەپێوەم
هاوارکە! لەبرای ـ ئەزبەنی ـ و پێی بڵێ:
من هاتووم بۆ ئەوەی

خوێن بدەم بە کەژی ڕەنگ زەردو

بە پەیژەی لاشەما

ئازادیی سۆران‌و بادینان

پێکەوە سەرکەوێ.

* * *

وەختێتی!

پێشمەرگەی کوردستان وەختێتی..

ئەم خاکە ئەنجن‌و زامدارە

هەر سێ شت خواستێتی:

یەکەمیان: یەکێتی!

دووەمیان: یەکێتی!

سێهەمیش: یەکێتی!

وەختێتی!

مەفرەزە.. مەفرەزە..

وا ئێمە خۆمان بەست

وا ئێمە دوو هەزار، چوار هەزار

دە هەزار دەستمان کرد

بەیەك دەست.

وا ئیستە بەپێوەین

ئامادە. ئامادە. ئامادە.

ئامادەین وەك ئەوسای

سەر ڕێگەی داستانی"بێتواتە"

ئەی ڕیزی مەشخەڵان

کوڕانیـ کۆمەڵەـ !

مەسافە. مەسافە. مەسافە!

وەك ڕێچکە پشکۆکەی

ئەوساکەی

ناو شەوی "ئاڵوەتان"

ئامادە.. ئامادە.. ئامادە..

مەسافە.. مەسافە.. مەسافە

⋆ ⋆ ⋆

ئەی باکوور

باکوری برینم

ئەی مانگی گیراوی ناو چنگی تاریکیی

بادینان! ئەی لانکەی سترانی دێرینم

هۆ برای زازۆیی‌و کرمانجم

من وادێم ڕێ مەگرن لە کلێپەی

نەورۆزی ئامانجم

ڕێ مەگرن لە چەپکی گوڵ سپی

ئاشتیی من

ڕێ مەگرن لە تەوقەی ئەوینی

دەستی من!

ئەوەتا وا گورگی سەرکەوشەن

گورگی بۆز.. گورگی ڕەش

بێ کڵاو، کڵاودار، ڕیشنیان
لمۆزیان لە خوێنی ڕژاومان وەرئەدەن
بە هەڵپەی کەڵبەی تیژ. قەپاڵیان،
ماسولکەی لاڕانو سەرشانمان ئەپچڕن
گورگنو ناپرسن
بۆ ئەوان گۆشت گۆشتە
سۆران بێو بادینان
کورد کوردە!
ئەی برای زازۆییو کرمانجم
وا هاتووم ڕێ مەگرە لەتیشکی
ئاواتو ئامانجم
من هاتووم لە گۆڕی هەڵدێرو نشێوتا
مۆتەکەی سەرسنگی ناکۆکیی بنێژم!
من هاتووم برینی دەربەند و
لوتکەی شاخ سارێژم
من هاتوم بەیداخی بەفرینی
خۆزگەمت بۆ هەڵکەم.
ئەی برای زازۆییو کرمانجم
من تیرەو، ئەمو ئەو، تاکە کەس ناناسم
فەرهادم ئەم ڕەنجە هەر لەبەر
"شیرین"ی ڕەنجدەران ئەکێشم
من تەنها بۆ چاوی کوردستان

دێوانەم، عاشقم، دەروێشم!

★ ★ ★

ئەی برای، سەنگەر جیا

ئەی برای ئەودیوی

دیواری من نەبین

وەرەوە سەنگەرێك هەڵکەنین

سەنگەرێك بەو پاچە هەڵکەنین

کە پاچی"چیمەن‌و "حەسار"م

هەڵیان کەند.

سەنگەرێك تا ئیستە ئەسووتێ‌و

دوا جاریش

بەخوێنی "سەی کەریم" گڕی سەند.

براکەم! گەر چەمێك

لەمپەڕ بێ‌و لێکمانکا

سەدان چەم، زێ‌و ڕووبار

بانگ ئەکەن: یەکگرین!

براکەم!

گەر دەشتێك دڕك‌و داڵ لێکمانکا

سەد دەشتی گوڵجاڕی ئەم خاکە

بانگ ئەکەن: یەکگرین.

براکەم!

گەر ئاشتیم گوڵی گرت

گوڵێکی گوڵدانی چاوم بە

ژێ یەکی کەمانی مژدەم بە

گەر دەنگی سەربەستیم هەڵیکرد

باڵێکی گۆرانیو بەستەم بە

گەر گڕیش کەوتەوە

براکەم! وەرەوە

پێکەوە گڕبگرین

پێکەوە لە شایی خوێناویی شۆڕشدا

دەستبگرین

1984

# کوڕی بابە گوڕگوڕ

ڕێگە چۆڵکەن.. هەستنە سەرپێ!
وا ئەسپێکی سپیی یاڵ سوور
لە پێدەشتی کەرکوکەوە
ئەحیلێنێ‌و بۆ ئێرە دێ!
ئەی ئەسپەکەی تەوێڵ مارۆی گەرمیانم!
ئەوەی بەفرو
گڕو شەپۆلی ناسیبێ،
ئەوەی شمشێری برووسکەو
باو بۆرانی کێوی دیبێ
تۆ ئەناسێ!.
ئەی ڕەشەبای لە پاشکۆدا خۆر سوار کردوو!
ئەوەی جارێ
گوڵاڵە سوورەی چاو ڕەشی
ـ ڕەحیم ئاواـ و
منداڵانی سەر قۆچکەتاشی "لەیلان"و

کێڵگەی برسی ـ دوزـ ی دیبێ
تۆ ئەناسێ!
* * *
کۆبنەوەو هەستنە سەرپێ
سەر هەڵبڕن!
بازێك شەلاڵی خوێناوەو
تۆزێکی تر
بەم ناوەدا تێ ئەپەڕێ!
ڕوەو قەندیل
بەسەر هەورازی شەختەدا
نزم ئەفڕێ
هەتا ئەگاتە سەر لوتکەو
ئەچێ لەوێ
لە پەڵە خوێنی "نازم" دا
بە هێواشی ڕائەکشێ
* * *
ڕێگە چۆڵکەن.. هەستنە سەر پێ!
زریان: گڤەی ون کردوەو بۆی ئەگەڕێ.
گەرمیان کوورەی کاوەیەو جۆشدراوە
تەماشاکەن:
هەرچی گردۆڵکەی پێدەشتی لەش جنراوە
وەکو دایکانی وڵاتم

**بنچکی ڤژو ئەگریجەی گژو گیایان**

**لە ملیاندا ئالۆزکاوە!**

★ ★ ★

**مامە ڕیشە!**

**ئەی پڵنگی چنگ بەگڕی گەرمیانم!**

**بەیتی تازەی توحفەی ئەمڕۆی کوردستانم**

**لە مالآنی گوند بە گوندی هەڵقرچاوا**

**تۆ قوتیلەکەی بەر هەیوانی.**

**داسی درویّنەو، هەتاوی**

**سەربانیژەی زستانانی.**

**مانگە شەوی. هێشوی ڕەزی.**

**هاژەی چەمو**

**وژە وژی دارستانی.**

**ئاگری شوانی.**

**وەکو باران**

**وەکو کانیی**

**وەك دەغڵو دان**

**خۆشەویستی.**

**تۆ کوڕی بابەگوڕگوڕی**

**داستانێکی سەدەی بیستی!.**

1984

# مزگێنیی

بۆ هاوڕێم عومەرعەبدوڵلا

دەساڵ بوو. هەوری سەر "دابان"م
ژانێکی گییر خواردووی نەبار بوو.
وەك کچی دەزگیران دیل کراو
بناری دابڕاو لە لوتکەم:
خەمێکی بێ دەنگو
مەلێکی بێ جووتو بێ یار بوو.
دەساڵ بوو درەختی گەردانەی شەدەڵەم
بەیانیان، نیوەڕوان، ئێواران
کە نیگای گەلآیان
بەرەو ژوور هەڵ ئەبڕی
بەتەنها گەردنی خوێناویی چیایان ئەبینی
هەر تەنها پێوەنی
هەورازی یەخسیرو
دەستو پێی ڕێ ڕێ بووی
کەژانی چاو سەوزیان ئەبینی.
دە ساڵ بوو، دە قفڵی ژەنگ گرتوو

لە زاری هەتاوی سەر بەفر

لە قوڕگی ئەشکەوتو

لە دەمی شەپۆلی ڕووبارم درابوو.

دە ساڵ بوو بە کوللەی بەعسییان

چواردەوری خەرمانەی ترۆپکو

گوڵجاڕی ئەوینم گیرابوو

یاساغ بوو هەللاجم

پێکەنێ و دەسبەرێ

بۆ قژی ناو ڕەزی سورداشم

یاساغ بوو.. کەژاوەی تریفەی سەر دابان

داگەڕێو بچێتە ژوانی

کانیاوی مێرگەپان .

یاساغ بوو.. قەدەغە.. یاساغ بوو

سەرگەڵوم گۆرانی بڵێتو شەدەڵەم گوێ بگرێ

یاساغ بوو وەك شیعرم، گوڵی سوور

باڵاکاو پێ بگرێ!

دە ساڵ بوو. دە ساڵ بوو. دە ساڵ بوو

ئەم دڵە هەنارەم

بە چنگی ڕەبایە ئەگوشرا

دە ساڵ بوو، نواڵەی ئەم سنگەش

پێ خوستی پۆستاڵ بوو

* * *

فەرمانی شەهیدە، درەختی ڕێ ووتی:
کوڕانی مەڵبەندی یەك‌و دوو. ها.. دەستم
فەرمانی شەهیدەو شاخ وتی:
کوڕانی یەکێتی.. سەرکەونە سەر پشتم!
وا ئەڕۆن! سێ ڕێچکەن، بەبێ دەنگ
دیواری نیوەشەو کون ئەکەن.
وا ئەڕۆن! سپاردەی باڵندەی کوژراوو
کارێزی خنکاوی کوردستان
بۆڵای خۆر سەر ئەخەن!
سەرکەون! بەرد وتی: من هێزی قاچتانم!
سەرکەون! با وتی: من وزەی دەستانم!
سەرکەون ! باز وتی : من تیژیی چاوتانم
سەرکەون! نان وتی: من توێشوی ڕێتانم!
سەرکەون! سەرکەون!
گەل وتی: من ورەی ناوگیان‌و
من گوللەی چەکتانم.

* * *

چوار سەعات! چوار سەدە، چوار نەوەی داهاتوو
ئەبێتە سرودی سەردەمی.
چوار سەعات! خوێنی من، خوێنی خاك
داستانی دابان‌و هەللاجی
پێشمەرگەی ئەنووسی.

ئەی دنیای کەڕو لاڵ! ئەزانم نامبیسی.

بەڵام من گەلێکم

تا دوێنێ شۆڕشم پزیزك بوو

ئەمڕۆکە بلێسەم

وا هاتووم بە سنگی ڕووتەوە

بۆ گوڵی ئازادیم،

ژێر لوغمو ناو لوولەی تفەنگو تانكو تۆپ ئەگەڕێم.

عەشقێکم بەبێ دەنگ ئەسووتێم

تا ئەمرم

گۆرانی بۆ بەفرو

بۆ گوڵو هەژاری کورد ئەڵێم.

★ ★ ★

دوژمنان!

لای ئێمە خوێنی دڵ وەك ئاوی مەعدەنیی

سەر مێزی بەردەمتان نافرۆشرێ!

لای ئێمە خوێن، هەورەو بارانە،

خۆی بۆ خۆی ئەبارێو دائەکا.

لای ئێمە ئازایی ناکڕرێ!

زریانەو خۆی بۆ خۆی هەڵ ئەکا.

لای ئێمە "نۆطە"ی سنگ بۆ خەڵات

وەك سۆمای هەردوو چاو

هەر گوڵی کێویەو

هەر ماچی هەژاری

دێ سووتاو!

* * *

مزگێنیی!

دەوەنی گرمۆڵەو خەمباری سەر "دابان".. مزگێنیی

مزگێنیی! ئەی کانیی لاپاڵی لێڵ کراو،

ڕوون بەوەو، مزگێنیی

مزگێنیی! شۆڕەبی گریاوی هێشتاکە چاو تەڕی،

شەدەڵە! هەڵسەوە.. مزگێنیی.

پێکەنە! ئەی وردە شەپۆلی

ناو جۆگەی ترساوی بێ خوڕە

وەرەوە کەناری ئەمبەرو مەترسە!

ئەی هەللاج!

ماچیکە! ئەو بەفرەی ئیستاکە بەسەرتا ئەبارێ

پێکەنەو بۆ سورداش بە دوو دەست

گوڵی خوێن هەڵبڕە.

کێ وتی چەکی من نووستووە؟!

کێ وتی نێرگزی چاوانی شەهیدم بیر چووە؟!

کێ وتی.. با"دابان" بدوێنێ!

با دەشتی دامێن‌و با قیری سەر جادەی

لێرەوە تا "دوکان" ببینێ!

* * *

من ئەمویست لە هێرۆی گوڵ سپی
کراست بۆ بدوورم کوردستان!
ئەی سورداش ئەی بوکە سوورەکەی
پار نەورۆز.
خۆ زانیت! تا سەیران
سێبەری بن داری کۆتەڵو تابین بوو،
سەرچۆپیی ئەوینت من ئەمگرت.
ئیستاکەش ئەی سورداش،
کە کۆتریان سەر بڕیم
کە ڕقم گڕی گرت
هەر هەمان عاشقم
سەیرکە، ئەم جارە
سەرچۆپیی نەورۆزت
بە خوێنم ئەگێڕم!

* * *

پێشمەرگە!
تۆ خورپەی ئەم دڵە شەیدایەی هەڵبەستمی
تۆ خامەی تۆ پەنجەی بزوێنی دەستمی
ئیستاکە کێم هەیە تۆ نەبی
کەسم تۆی
بەستەم تۆی
هەستم تۆی

تۆ نەبی شیعری من وەك پۆڕی خوراوە.
تۆ نەبی چیرۆکم وەك مەلی بێ دانو بێ ئاوە.
تۆ نەبی شانۆی من ئەبێتە تابووتی ئەکتەرم.
تۆ نەبی ژێو تەلی کەمانم پچڕاوە!
پێشمەرگە.. پێشمەرگە!
ئەگەر تۆ ئەتەوێ هۆنراوەم..
وەك دەغڵی پاش باران
خەیاڵم کەروێشکەی تیا بکا!
ئەگەر تۆ ئەتەوێ دیوانم
وەك لوتکەی باوەشی خۆرنشین
زەردو سوور هەڵگەڕێو
باوەشت پیا بکا!
ئەگەر تۆ ئەتەوێ هەناسەت، هەنگاوت،
برسێتیت، بخەمە ناو دوو توێی ڕستەوە
بۆ ڕێوبان بیانکەم
بەهاودەم
بیاندەم
لەیەخەی کەژو چەم
ئەگەر تۆ ئەتەوێ کەشکۆڵم
بکەیتە سەرینت
ئەمبەرو ئەوبەری سەر دێڕم
ببێتە دووربینت.

**وا منیش ئەمەوێ داستانی دابان و**

**هەللاجی زۆرترم گوێ لێ بێ**

**تا منیش هەڵبەستی سبەینێم**

**ببێتە قەنناص و**

**سەردڵی شاعیری دەرباری داگیرکەر**

**بپێکێ!**

سێروان 1985/2/21

# ڕوانین

لەپەنجەرەی چاو خەوالّووی ـ ژوورـ مەوە
وەك بالّندەی بەر هێلانەی حەپەساو!
سەرنج ئەدەم لە "ئاسۆس"ی
برۆو برژانگ، ڕدێن سپی
ناوشان پانی، مل باریکی.. هەلّکشاو!

★ ★ ★

لەسەر کاوان"با" ی بزێو و پەلەکەر
هەللاجێکی شێتۆکەیەو تووڕەیە
شی کردنەوەی لۆکەی بەفری لەو.. کەلە
دەنگی چەکەی ناو بەناوی
درنگەیەو دمەیە
"درنگ، درنگ. دم. دم. دم"
بۆ بەرەو خوار وەك بخلیسکێ
بە چرکەیەك ئەگاتە گوێم، لێرەیە.

★ ★ ★

پەڵە هەوریش، کوڵنجەی بەر
دارستانی کاکۆڵو قژ ئاڵۆزکاو
هێشتا تەڕەو لێی ئەتکێ
دڵۆپی ساردی بەفراو.

★ ★ ★

لە گوێ چەمیش، لەشی درەخت
بێ کراسن، ڕووتو قووت
لەسەرەوە بە ئەڵقاوئەڵق ڕاوەستاون
سەیریان ئەکەن شاخی هاوسێی کڵاو قووچ.
لە سەرماندا گۆپکەی لێویان
گۆ ناکاتو ئەلەرزن
تۆزێکی تر ئەم نسێیە
ئەم سێبەرە جێدێڵن
هەر کە گزنگ گرێی زوقمی
دەستو پلو قاچو قوولی کردنەوە
ئیتر ئەوسا..
یەکە یەکە بۆ بەر هەتاو ڕیز ئەگرن.

★ ★ ★

پێشمەرگەیەك، هەگبە بەکۆڵ، ڕیش هاتوو
تیسکەی تفەنگ، سمۆرەیە، ڕەوتی گورج
بە باریکە ڕێگەی گردا شانەوشان
بەپاژنەی پێ بەفری شەوێ خرچە خرچ

**ئەشکێنێتو ئەچێتەوە بۆ "سێروان"**

**ئەی پێشمەرگە! ئەی هاوڕێی برسێتیی!**

**لەپێش مندا "گۆران" وتی: تەبیعەت**

**هەرگیز هەرگیز بێ ڕووناکیی ئەنوێنێ**

**ئەگەر ئازیز زەردەخەنەی شیرینی**

**وەکوو گوڵاو بەسەردا نەپرژێنێ.**

**منیش ئەڵێم ئەی پێشمەرگە!**

**ئەی هاوڕێی هەژاریی**

**کوردستانم، قەڵەمەکەم، یارەکەم**

**نە بەختیار، نە سەربەرزن، نە جوانن**

**بێ چەکی تۆ.. ئەی هاوڕێی ئازادیی!.**

سێروان 1985/3/3

# هەڵگوردی "پ . م"

ڕێی هەکارە
ڕەشایی هەر.. ڕیزی پێشمەرگەی وەریوی
ناو کرێوەو بەفرانبارە
قەدو باڵای ئەم دڵدارە هەژارانە
بوون بە ئاوێنەی سەهۆڵو،
مەمکی بڕاوی شیرینو خاتوو زینی
کوردستانیان تێدا دیارە.
ڕێی هەکارەو ئەمان نانن
نان لە برسا بەلادا دێ.
ڕێی هەکارەو ئەمان ئاون
ئاو تینوێتیو وا ئەخنکێ.
ڕیز ئەوەرێ بەڵام ئەڕواتو ناوەستێ
هەر هەورازەو هەر ڕەوەزەو هەر قوتکەیە
بە خێڵی مەرگ
ڕێ تەنراون
هەر لادێ یەو هەر شارۆچکەو هەر پەنایە
بەهەزار داوی باریکی تەڵەی سنوور

ورد چنراون.

★ ★ ★

ڕێی هەکارەو

لەناو بەفرا ڕیزە هێشوو

دەنك.. دەنك.. هەڵ ئەوەرێن

وەك دەوروپشت

وەکوو سروشت

چاویش تەنیا سپێنەیە!

دەنگ: بەستوێتیو

تەنها ڕێگەش، ئەم ڕێ یەیە.

★ ★ ★

لەناو ڕیزدا حەوتەم دلْدار

لاواز ئەلْێی توولْە بی یە

ناوچەوان پان، برۆ تەنك

کەوانی یە.

وەکوو بەهێ ڕەنگی زەردە

چاوەکانی دوو وەنەوشەی

ڕەشو سیسە

سمێلْیشی قەترانی یە.

گوپەکانی تێك قووپاوە.

وەك پەلگە گیا لێوی باریك،

پێلْوی کەمێك هەلْئاوساوە!

ئەم "پ.م"ی شاخو هەردە

لەشار ناوی محەمەد بوو، نانەوا بو

بەڵام وەختێ کە حەسارۆست

وتی وەرەو بوو بە دۆستی

لەبەر خاتری چاوی جوانی

لەبەر دڵی مێرگی سەوزو دارستانی

ناوی گۆڕی

ئەم دڵداری شاخو هەردە

ئیستە وا بۆ ساڵێ ئەچێ

ناوی تازەی ئەو "هەڵگورد"ە

★ ★ ★

ڕێی هەکارە..

ڕەشایی هەر.. ڕیزی پێشمەرگەی وەریوی

ناو کرێوەو بەفرانبارە

وا "هەڵگورد" یش وەك قوڵنگی

بەر شەوارە

چاوی ڕێشکەو پێشکە ئەکا

سەری وەك بێژەنگ ئەسووڕێ.

هەڵگورد ئاسکی لاق زامدارە

تەکانێك ئەداو ئەچەقێ.

هەناسە بڕکێی کەوی سنگ

باڵ لێك ئەداتو هەڵئافڕێ.

چۆلەکەی دڵ بەئاستەمێ

نووزەی لێ دێ.

هەڵگورد وەکوو شەپۆلێکی

هیلاك.. ماندوو

چۆن ناگاتە ئەوبەر ئاوو

لەنیوەی ڕێگەدا ئەمرێ.

ئیستە هەڵگورد باڵای چرای

وردە وردە بەلادا دێ

ئیستە هەڵگورد لەسەر بەفر

نەمامێکی بێ پەڵو پۆو

ڕاکشاوەو

بەتەنها چاوی ئەبینێ!

* * *

رێی هەکارە

ڕەشایی هەر لە دوورەوە

پادگایەکی سەر سنووری قوللە دیارە

ڕیزی برسیی.. ڕیزی دڵدارانی ماندوو

گەڕانەوە سەر هەڵگوردی نیوە مردوو

وتیان: ئەژیت،

ئەو پادگایە

ئاگری تیایە.. نانی تیایە

هەڵت ئەگرین هەتا نزیك

دەرگای ئەوێ

بۆچی بمریت ئەی هاوڕێ؟
هەڵگورد بزەیەك بە ئاستەم
کەوتە سەر لێوی لەرزۆکی
ئینجا وتی:
ـ براینە! بەجێم بێڵن
لەم بەفرەدا بەجێم بێڵن
من لێرەدا  ئەڕوێمەوە
ساڵێکی دی سەردانم کەن
ئەمبینن چۆن بە پێوەمو ئەشنێمەوە
ئێوە ڕێگەی کەڵ ژیانتان نیشانداوم
لووتکەمو ناچەمێمەوە!.
براینە بەجێم بێڵن.
ئەگەر بەهارێ هاتنەوە
ئەمبینن من
گڕی نەورۆزی ئەم یاڵەم.
ئەگەر هاوینێ هاتنەوە
ئەمبینن من
دەغڵی بەپیتی ئەو ساڵەم
براینە!
مەوەستن ڕێگە تەواوکەن
من با نەگەم، ئێوە بگەن.

* * *

**بەفر ئەبارێ**

**ڕیز.. ڕیز.. ڕیز.. ڕیز**

**بەسەر لەشی ساردوو سڕی**

**ئەم دڵدارە تەنیایەدا**

**بەفر ئەبارێ.**

**پەنجەی کلوو چاوی ئەم عاشقەی لێك ناو**

**هەر بۆ ئەوەی سەرمای نەبێ**

**ئەوا ئیستە**

**توێژاڵ.. توێژاڵ**

**دای ئەپۆشێ.**

**ئەوا ئیستە**

**هەر بۆ ئەوەی ئەم دڵدارەی لێ زیز نەبێ.**

**بەتەواوی گرتیە کۆشی.**

**بەفر ئەبارێو کڕێوەیەو**

**ئێستە جێگەی ئەم هەڵگوردە**

**ژووری هەناوی جۆش خواردووی**

**کوردستانو دڵی کوردە.**

سێروان 1985/2/8

# کـــەڵ

بۆ هاوڕێی شەهید عبدالخالق معروف

لەهەر کوێوە بڕوانیتە پاردەی قەڵا
هەر قەڵایە
لەکام لاوە سەر هەڵبڕی
گوڵەبەڕۆژەی چاوی ئەو ئەتبینێت‌و
هەنگاوهەنگاو لەگەڵتایە.
کێ ئەتوانێ خۆی لە نیگای بەرزە تیشکی
هەڵگورد ونکا؟!
کێ ئەتوانێ بەفرو باران لە زستان‌و
گوڵ لە نیسان قەدەغەکا؟!
ئەتوانن هەورێك بکوژن.
خوێنی شلێرێك بڕێژن.
ئەتوانن دەستی دار گوێزێ ببڕنەوە
قاچی کتێبێ بشکێنن
چوار مێخەی شیعرێ بکێشن.
بەڵام شیعرێ حیلەی ئەسپێکی ڕەسەن بێ

شیعرێ بژیو
بۆنو بەرامەی قەڵەمی ڕاستیی لێ بێ
هەورێ بزێو کوڕو کچی
ڕەهێڵەی ئاسمانی ببێ
هەرگیز بەوان دروست نابێ.
لە دەروونی ئەهرەمەندا گوڵ ناپشکوێ.
لەسەر تەوری جەللادەکان
کۆتری هونەر هەڵنانیشێ
لەسەر کورسی سوڵتانەکان
دادپەروەریی دانانیشێ.
چۆن لەچاڵە خەڵووزاندا
هێرۆی سپی سەر دەردێنێ
چۆن بایەقوش بۆ ئارامو دڵنیایی
درەختو ڕووبار ئەخوێنێ؟!
ئەوەی هەرگیز
هەرگیز.. هەرگیز
دەنووکی داڵەکەرخۆرەی بەعسییانو
تووله مارە سەر سپیەکانی مزگەوتی
مەلای خەتێ
قەت نایگەنێ
ڕەگی دارگوێزی ژیانی ئەم گەلەیە
هەورە تریشقەی سەنگەرو

قەڵای سووری
هەزاران "عبدالخالق"ی پێشمەرگەیە.
* * *
ئەم کوردستانە، کوانووە
کەڵە پشکۆی قەت لێ نابڕێ
گەر پەنگری هاوارێکی ئەو دامرکێ
دەیان پەنجەو قەڵەمی تر
ئاگر ئەگرێ!
ئەی دوژمنانی ڕوناکیی!
هەتا دوێنێ عبدالخالق چرایەك بوو
چەند شەقامێ لەسەر سەریان هەڵیان ئەکرد
کتێبێ بوو
یەك دوو شارێ ئەیخوێندەوە..
بەڵام ئەمڕۆ عبدالخالق
شەقام نییە
دێو شار نییە
ڕێبوار نییە
گوڵ ئەستێرەی زامی ئەوی
لەسنگو بەرۆك نەدابێ
ماڵێ نییە لەم وڵاتە غەمگینەدا
ڕێی ماڵی وشەی نەزانێ.
ئیستە هەموو کوردستانم

وەکوو چاوەکانی قەڵا
بەکتێبە خوێناویەکەی
نیسانی ئەوا ئەڕوانێ

★ ★ ★

میری شەهیدانی هەولێر!
ئەی حەیرانی سووتە مەڕۆی
برین بگێڕ!
ئەی هاوڕێی بەهرە ڕەنگین.
گوڵ خەندەرانی پێکەنین.
لە هەواری قەندیلەکەی ناو دڵمانا
سنەوبەری چوار وەرز سەوزی.
تۆ سروەکەی سەری ڕەشی.
تۆ ئەنتێنی هەرە بەرزی
سەر چیای ئیزگەی شۆڕشی
تۆ بڵندگۆی
دەنگدانەوەی دڵی ئێمەی
رادیۆی ناو دەستی پێشمەرگەی
ئەو ڕیکۆردەرەی
هەموو ڕۆژێ سروودەکەی
شۆڕشی نوێمان لێ ئەدەی
پەیتا.. پەیتا
ئاگردانی پشکۆی خۆتو

**نەوەی پشکۆی ئەم کوردستانە**

**خۆش ئەکەی!**

سێروان 1985/4/10

# گوڵ باران

هێشا شیعرم بەهارانە گوڵ بارانی
باڵای شارباژێڕی ئەکرد.
لەتەوقە سەری چوارتاوە
دائەنەوی‌و
کڕنووشی بۆ سورکێو ئەبرد!
بە کلوچکی پەنجەی دابان
وەکو هەللاج
هێواش.. ورد.. ورد
چاوی ئەستێرەی سیوەیل‌و گمۆی ئەڕشت!
هێندە نەبوو
تازە پیری شەوکێڵ ئەچوو
تاجی خوێنی "عەلی‌و سالار"
بنێتە سەر سەری کەوتوو.
هەر دوێنێ بوو
لەتیرێژی برینەکانی گۆیژەوە

دایکی سەروقژ خوێناویی
سلێمانیم ئەدی.. ئەی وت:
لەئاگردامو ئەسووتێم
ئەشسوتێمو گۆرانی بۆ
کوڕی ئەو کێوانە ئەڵێم.
هێندە نەبوو
شیعرەکانم لەقەترە خوێنی "زینانە"
ملوانکەیان ئەهۆنیەوە بۆ گەردنی
دڵداری کەڵی شیروانە.
هێندە نەبوو.. قەرەچووغم
لەبەر ئاوێنەی پێ دەشتا
ڕائەوەستاو گوڵەباخی سەرکەوتنی
لەپەرچەمی مەخمور ئەدا.
هێندە نەبوو
بەتەشوێی ڕقی پیرۆزم
دۆڵەڕەقەم
وا داتاشی
تا بوو بە تابووتی قوڵی
مەرگی پواز.. مەرگی ستەم.
ئەوا ئەمڕۆش
وەکوو دوێنێم
وەکوو ئیستەم

لە دۆڵی ئاكۆیانەوە

ئەبمە مانگی

خوێنی سەر كۆڕەكو هەڵدێم

ئەبمە دڵۆپە بارانو

سەر بەزامی ئەرخەوانیی

تینووی "مەحمود"ەوە ئەنێم.

ئەمجارەیان من پاشاكۆرەی پێشمەرگەم

هاتوومەوەو

سنگی ئەسپم ناوە بە سنگی قەڵاوەو

ڕووەو ڕەواندز بانگ ئەدەم.

ئەمجارەیان

هەرچی كەژی لەش جنراوە

هەرچی كانیی دەم بەستراوە

هەرچی هەوری سك سووتاوە

لەتەكمانو بەرەو خۆرەتاو، تاو ئەدەم

بەمارەیی خوێنی خانزادی كوردستان.

ئەی سەربەستیی بە تۆ ئەگەم!

* * *

ئەی گەلەكەم! ئەی سروودی

ڕیز بەستووی ڕیزی ئازادیی

شۆڕشەكەت لە خۆت ئەچێ!

شیعرم نەبیست.. شیعرم نەدی

ئەی شۆڕە شۆڕشی هەژار
شۆڕشێکی دیکە هەبێ
وەك لەشی تۆ.. وەك کەپرەکەم
وەك گیرفانم.. ڕووتەڵە بێ!
تۆ دارگوێزێکی بە تەنیا
هەر خۆت بۆ خۆت سێبەر ئەکەی
تەنیا.. تەنیا
وەکوو دایکم‌و ژوورەکەی
وەك ئەو ژوورەو
تاقە قەنەفە شڕەکەی!.

* * *

کوردستانم
ئەی دڵی چوار کەرت کراوم!
هەر وەکوو چۆن شیعرم نەیبیست
شیعرم نەیدی
دڵێ هەبێ
وەك چۆلەکەی گوندەکانم
وەك دڵی تۆ بێ هێلانەو
کەچی ئاوایش لەبەر نێزەی
ڕەشەبای هەر چوار وەرزدا
هێشتا مابێ‌و بژی‌و بفڕێ‌و
وەك قەڵەمم

بە پێیشەوە ڕاوەستابێ.

* * *

ئەی گەلەکەم!

هەرچی گێلاسی شیعرمە

بیگوشمە ناو دەرونتەوە

بەقەدەر خوێنی شەهیدێك!

گۆنات سوور هەڵناگەڕێنێ!

هەرچی ڕووباری شیعریشمە

بیخەمە سەر دەشتی لەشت

بەقەدەر خوێنی شەهیدێك

تینوێتی ڕێگەت ناشکێنێ!

ئەی شەهیدانی وڵاتم!

هەرچی وشەی جوانو نازداریشم هەیە

هەڵیان چنم.. چەند بەرزبن

هەر لە خوار ئەژنۆتانەوەن

بۆیە ئەڵێم

چاکتر وایە ئێوەیان دی

سەر دابخەن!

بەرگەڵو 1985/7/11

# نەفرەت

دوو سەنگەرە
دوو تفەنگە.. دوو ڕابەرە
دوو مردنو دوو ژیانە.
یەکەم: ئازادیی لە کوێ بێ
ئەم سێبەری باڵای ئەوە
باڵندەی دڵی هەژاران بۆ کوێ بفڕێ
ئەم ئاسمانی ئەو دڵەیە
ئەم هێلانەی ئەو مەلەیە
قۆڵ بەقۆڵی خەمی جۆگەو شاخا ئەکا
لەگەڵ باراندا دائەکا
بۆ سەربەستیی گوڵەگەنم
شەوانە ئەم
ئێشکی کێڵگەی نووستوو ئەگرێ.
ڕۆژانە ئەم
داسی ڕەنجە
ئارەقەی زەوی ئەڕێژێ

ـ کەم ئەژی بەڵام کەڵ ئەژیـ

وەختێ ئەمرێ

دارستانی گەل ئەینێژێ.

دووەم: وەکوو ئەمیستاکە

تابووت تاشی ئازادییە

گەرووی ڕزگاری لە کوێ بێ

ئەو دەمی نێزەو سونگییە

من هیچ ناڵێم

ئەوە لەشی کوردستانم

خۆت بیبینە

پەنجەرەی گەورەی چوار تاکی سەر برینە!

ئەوە باڵی مەلەکانم

ئەوە گوڵی باخچەکانم

ئەوەی نییە

هەڵفڕینە

ئەوەی نییە

گەشانەوەو پێکەنینە!

من هیچ ناڵێم.. ئەمیستاکە

تەماشاکە:

لەنیشتمانی دەغڵدا.. نان چۆن ئەمرێ!

لەنیشتمانی نەوتدا.. چاوی چرام چەندە کزە.

تلّپەی پرتەقاڵی گوشراو

ئەوە وێنەی ئەو دڵەیە.

كۆتەی قەساب

ئەوە لەشی ئازادیخواز.

تۆپەوانەو دەمی گییرە

ئەوە كەللەی مەمو زینی ئەم گەلەیە.

دوو سەنگەرە

ئەوەی لە دووەم سەنگەرا

ڕەنگ بۆ مەرگی خاك ئەڕێژێ

وەختێ ئەمرێ

دارستانی ڕووتەو هەژار

لە زەلكاوا ئەو ئەنێژێ!

* * *

دوو سەنگەرە

دوو تفەنگە.. دوو ڕابەرە

دوو مردنو.. دوو ژیانە

وا تفت كردە برینی كوردستانو

وا جێت هێشتم..

وا مەمكی دایكی خۆت بڕیو

وا ڕۆیشتی

بەڵێ تەنها یەك هەنگاوە

یەك تەوقەیە

بەڵام ئەو تەوقەو هەنگاوە

پلووسکی ئابڕووی تکاوە.

وا ڕۆیشتی

دەستیشت خستە ناو دەستی

دووەم سەنگەر

ئەوساش وەکوو کەڵەشێری

بەزیوی پۆپنە خوێناویی

لەسەر دارو پەردووی ماڵی

ڕووخاوی خۆت هەڵئەنیشی

لەو ساتەوە.. تۆ ئەو گسکەی

ئەبێ لەسەر

تەنەکەی خۆڵ  دابنیشی!.

ڕۆیشتیتەوە!

تۆ ئیستەکە ئەو خڕکە بەردە گڕوێیەی

لە بنارم بوویتەتەوەو

جنێو بە لوتکەی خۆت ئەدەی!

ئەو خەنجەرە ژەنگاوی یەی

لە کێلانی خۆت ڕائەکەی.

تۆ ئەو چەکەی

قۆناغی خۆت ئەسوتێنیو

سکی ژنی خۆت داغ ئەکەی.

تۆ ئەو کەسەی

کفنی سوری هاوڕێ یەکەی

خۆت فڕانو.. ڕۆیشتیتەوە

هەرچی زامی لەشمان هەیە

وەکوو بەتانی شەهیدان پێچاتەوەو

ڕۆیشتیتەوە!

تەسلیم بە کێردی سەر ملی

باوكو برای خۆت بوویتەوە.

یەك هەنگاو بوو

بەڵام حەیای تیا تەواو بوو.

یەك تەوقە بوو

بەڵام هەزاران پەنجەی قرتاوی

منداڵانی کوردستانی

لەگەڵدا بوو.

ڕۆشتیتەوە!

هەر پردێك بوو پەڕیتەوە

شەو دانەهات

کە پرد گڵاویی لەشی خۆی

لەبەر شەتاوی ڕووباردا

دەرئەکردو، ئەشتەوە.

یەك هەنگاو بوو

بەڵام ئەو چەکەی تا دوێنێ

مل کەڵ بوو وەك

دوندی بەرزەك

ئیستە وەکوو خۆت گوێی تەپە

ئیستە پەنجەو پەلەپیتکە

لەرزۆك.. لەرزۆك

ئیستە تفەنگی ترسنۆك

ئەویش وەك خۆت

چۆتە سەر چۆك.

* * *

یەك تەوقە بوو

ئیتر ناوت بوو بە جامێکی بن ڕەش‌و

ماڵ بە ماڵ زرنگایەوە

لە ڕۆژێکدا ناوی پێشووت

لەسەر قەدی دار بەڕووەکەم.. پووکایەوە.

ئیتر وەك گۆڕەوی چلکن.. دڕاو

وەك کەفاوی دوای ڕیش تاشین

وەکوو "دای . بی"!

تۆ تورِ درایت‌و تۆ ڕێژرای!

ڕۆشتیتەوەو دوای تۆ مەقەر

دارو بەردی هاتنە قسەو

وتیان: نەفرەت!

پێخەفەکەت

کەس تیا نانوێ‌و ئەڵێ: نەفرەت.

توولە ڕێی ئەوبەر گردەکە

**گەڵا گەڵای درەختەکە**

**هاژە هاژی ڕووبارەکە**

**بناری کێو تا لووتکەکە**

**خۆڵ‌و تۆزی پێدەشتەکە**

**مەڵبەندو تیپ**

**مەفرەزەو کەرت**

**نەك کەڕەتێ هەزار کەڕەت**

**هەموو ئەڵێن: حاشا.. حاشا**

**حاشا لەوەی**

**لەو وشەیەی.. لەو گوللەیەی**

**شیری مەمکی شاخیان فرۆشت**

**سەری گوڵەباخیان بڕی**

**چاوی درەختیان هەڵکۆڵی**

**نەفرەت**

**نەفرەت**

**نەفرەت**

بەرگەلو 1985/7/12

# ئـــــارام

ئەوە بۆچی ئەم ئێوارەیە "تەنگی سەر"
ئەڵێی ژنێکی پرچ زەردی گۆنە ئاڵەو
دەستی ناوەتە ژێر چەنەی کەل‌و
غەمگین.. غەمگین ئەڕوانێتە
گەواڵە هەوری چاو تەڕی ملەی ئەوبەر؟
ئەوە بۆچی ئەم ئێوارەیە "با"ی کەژان
زۆر تووڕەیەو قژی "دێ لێژە"و "مێوڵێ"ی
جووتە خوشك ڕائەکێشێ‌و وا بە پرتاو
خۆی بەدەرگای لەسەر پشتی
هەردوو دەربەندا ئەکاتو
دەس ئەکاتە ملی تەنها تاقە یاری گەلاڕێزان؟
ئەوە بۆچی ئەم ئێوارەیە کراسی
بەری هەموو درەختەکان
بەری بەندەن. بەری بنار، بەری ڕووبار
لەیەك ئەچن‌و وەك یەکن؟!
ئەوە بۆچی ئەم ئێوارەیە نان‌و گوڵ

له وڵاتی هەژارانا سەریان ناوە بە یەکەوەو

بەڕێ کەوتوون

ڕیز ڕیز هەموو

چرای سوورن و

بەرەو ئەم مەڵبەندە هاتوون؟!

ئەوە بۆچی وەك قەڵەمێ لەسەر کاغەز بەجێ مابێ و

شاعیرەکەیان کوشتبێ و

ژوورەکەیان لەسەر شیعر داخستبێ

ئیستە ئاوا ئەم کێڵگانەش

ئەم گوندانەش

ئەم خەڵکانەش

وەکوو ئەشکەوت

دڵ و دەروون تارو مارن؟

وەك دارستانی دار بڕاو.. بێزارو پەست؟

وەکوو ڕقی شەپۆلی دوای بەگیر هێنان

هەوری دەم و چاو بە سامن

بێ ـ ئارام ـ ن؟!

★ ★ ★

هەرەس هات و ئەسپی ئەیلولی داپۆشی

کەشتیەوان و کەشتیی گەورەی

بۆ ناو سکی خۆی هەڵلوشی.

هەرەس هات و هاژەی چەمی حەفتاو پێنجی

لەقوڕگی گەلی‌و نشێوو هەردا بڕیی.

ئەو لوتکانەی لە هەورا بوون

چوونە ژێر باڵی داڵەوە

مۆمیٚ نەما

یەکیٚ نەما

بچیٚ بە پیرِ کوردستانی ئازارەوە!

پلەی پەیژە هەمووی شکا.

هەر بەشانی خۆمانەوە

تا دوا چەکیش

ئەتك کرا.

ولآتە دەستگیرانەکەم

ڕووتو قووت بوو

بە بەر چاوی خۆمانەوە

دەس بۆ قوتکەی مەمکی ئەبرا!

* * *

دنیا عەبایەکی ڕەشی گرتبۆوە

وەختیٚ چراوگەکەی سەری ئارام.

گوڵ ئەستێرەی سەری ئارام

رانكو چۆغە شڕۆڵەکەی بەری ئارام

دەرکەوتن‌و لە ڕەوەزی کەلانەوە

شاسوارەکەم چووە سەریٚ

تا بگاتە ئەو دالآنەی

بارانی سووری شۆڕشیان

تیا ئەبارێ!

⋆ ⋆ ⋆

با سەیوان کورتە باڵاش بێ

بەڵام لە هەناوی ئەودا

دەیان هەڵگورد سەر دەردێنێ.

کانیی هەیە کونی چاوی زۆر بچووکە

بەڵام بەتەنها تینوێتی

بێشەیەکی چڕ ئەشکێنێ.

خۆ بولبولیش زۆر بچووکە

کەچی دەنگی دڵی کەژێك ئەبزوێنێ.

گەنمە قەندەهاری چۆنە

ئارام وابوو.

وەك سەوزە گیای شەونماویی بەهارانیش

زمانی خۆش، دڵێکی تەڕ

بە لەش‌و لار بچکۆلە بوو

لاوازو لەڕ

بەڵام بە بیر، بەگیان، بەکار

شاخی بەرزو هەنگی شانەو

خۆشەویستی ئەم گەلە بوو.

دەرگای سنگی

وەکوو کتێبخانەی گشتی

لەسەر پشتو کراوە بوو
بێ گرێو گۆڵ، ژینی سادە
وەك کاسەی دۆ، کەوچکی دار، شانەی تەختە.
ڕووح سووك، موو ڕەش، زیتو هێواش
دوو دانی پێش
نێوانیان شاش
نیگای کزو چاویلکەدار
بەڵام ڕێی مێشکی پڕشنگدار.
ئارام.. ئارام
ئەوەندەی داسی دروێنەی گەرمیانم
بە ئارام بوو
لەگەڵ دوژمنی هەتاوو هەژاریشدا
چەکوشێکی زۆر بەسام بوو.

* * *

ئەوسا سەردەم وەکوو گوێزان دەمی تیژ بوو
دەرزی تۆو بوو ئەکرا بەکێڵگەی برینی
ئەم خاکەوە..
هەموو بستە ڕێو فوتکەیەك
ڕم.. بازنەی چواردەوری بوو
هەموو هەنگاوو چرپەیەك
سێدارەیەك چاوەڕێی بوو.
لەناو شاردا مردن پۆلیسی شەقام بوو

لەسەر هەموو دووڕیانێك ڕاوەستا بوو.
لەناو دێ دا مردن پەپووی وێرانە بوو
لەسەر کۆتەرەی سوتماکی دارو پەردووم هەڵکورمابوو.
وەختێ ئارام گۆمێکی مەنگی بچووکی کوردستان بوو.
بەغدا لافاوێ بوو چاو سوور
پانو پۆڕ بەقەد عێراق بوو
وەختێ ئارام دەمانچەیەك بوو زۆر کەڕەت
جووتەی ئەکرد!
بەغدا بەیەك دەست دەبابەو
دەیان فڕۆکەی هەڵ ئەگرت.
وەختێ ئەو سیامەندی چاو کزی "خەج"و
هەژاران بوو
سیامەندە پێشمەرگەکان
وەکوو پەپوو سلێمانکە
کەوی سپی
شوورو بەور
ناوبەناوێ، تاكو تەرا، یەکە یەکە
دەرئەکەوتن.
ئەو شەوگارانەی کە ئارام
تاق تافکەرەی
داری زەردو قەرەداغ بوو
نەك درەختێكو دوو درەخت

قۆپپیش خەوی لێ کەوتبوو!

★ ★ ★

ئەو ساڵانەی ڕۆژەکانی

وەکوو دەمی تەورو مشار

بڕندە بوون

ئەو ساڵانە لەناو بێژنگی خۆیاندا

هەر خەریکی تەتەڵە بوون

زۆر هاتو چوون

بەڵام کامیان وەکوو ئارام

توانی ئازار هەڵبمژێ

توانی بە پێوە بوەستێ

هەبوو.. زوو تلیسایەوە

هەشبوو، وەکوو ئەم شاخانە

هەر مایەوە.

★ ★ ★

ئەم بەیانییە "تەنگی سەر"

بۆنی مەرگی تازەی لێ دێ

چوار دەوری ـ دێـ

داڵ گرتوویێتی

وا قیڕەیان ئەگاتە گوێ.

ئەم بەیانییە تەنگی سەر

لە پۆڕێکی گیراو ئەچێ

لەناو چنگی داوو تۆڕدا

هەر زیقەی دێ.
سات لەدوای سات
ڕەنگی شاخو
ڕەنگی باخو
ڕەنگی ماڵان.. هەڵئەبزرکێ!
ئەوە تەقەی قاچی مەرگە
تا بێ تەقەی گەورەترەو
وردە وردە بۆ ئێرە دێ.
ئەوە زەنگی دەستی مەرگە
کە لێ ئەدرێ
دارو دیوار
ماڵو منداڵ
مەڕو بزن
ڕەشە وڵاخ
هەموو شتێ.. ئەپەشۆکێ
ئەوە تەقەی قاچی مەرگە
ئەوە زەنگی دەستی مەرگە
لەناو دێ دا تەنها ئارام
بیری گەشو دڵی مەنگە.
* * *
زەمان وەکوو کیسەڵ وابوو
سەعات بە وێنەی مێروولە تێ ئەپەڕی

ئارام وتی:

"لەبەر من با

داڵ "دێ" نەخوا

ئەچمە دەرێ"

ئەمەی وتو بەناو تەلبەندی چەقۆدا

کەلەبەرێك، کە تەنها هەر تفەنگێكو

لەشی وەك ئەمی پیا بچێ

چووە دەرێ.

پشت لە داڵو

ڕوو لەو ئەشکەوتە تازەیەی

کە هەر ئەمشەو

ناوی نەهێنیی لێ ئەنێ

ئەوا ئیستە

ڕێگە ئەبڕێ.

⋆ ⋆ ⋆

بەدییان کرد

چاوی داڵی سەر قەرەوڵ

وەختێ پەلەپیتکەی جووڵان

ئاگر فڕیو

لەو دوورەوە

باڵی هەڵۆی سووری شکان!

⋆ ⋆ ⋆

داڵ "عاصی" بوو

بەسەر سەری ئارامەوە ئەخولایەوە

دەمی برین وەك گوڵەباخ

ئازارێ بوو ئەكرایەوە.

برین مابوو.. برین ویستی

هەر بەپەنجە گەورەی قاچی

تفەنگ بێنێتەوە قسە.

داڵ ئەمجارە

دەنووكی گوللەی لە سنگی

ئارام چەقان

بۆ ئێجگاری چاوی لێك نا

ئەو مرۆڤەی

دوای مردنیش

تەمەنێكی نوێی خستە سەر

عومری ژیان!

* * *

ئەی تەنگی سەر!

لەم یادەدا قەڵەمەكەم

كراسی سووری شیعرێكی

ئاو دامانت ئەكاتە بەر.

هەموو شەوێ

لەناو خەونی فرمێسكاویی ژوورەكەمدا

خۆم ئەبینم

وا بوم بەكۆترە شینكەیەك

لەگەڵ هەوری ئاڵدا ئەفڕم

هەتاكوو ئەچمە سەر "دابان"

لەوێشەوە بەرەو "كەتوو"

ئینجا شەق ژن باڵ لێك ئەدەم

بەرەو كۆڕەك و ئاكۆیان

نزم بەدەم فڕینەوە..

لەهەر لایەو دوو سێ گوڵێ

هەتا ئەبن بە چەپكێ

ئەیبەستمە باڵ.

بەرز بەرز ئەفڕمەوە

هەوری پێش خۆم ئەگرمەوە

هەر خۆم تەنیام

ئەی تەنگی سەر ئەگەمەلات

ئەوسا لەسەر ئەو مەزارە

ئەنیشمەوە.. ئیتر ئارام

دێتە دەرێ و ئەگاتە لام

عەینەكەكەی دائەگرێت و

دەست ئەخاتە ناو دەستمەوەو

چەپكە گوڵم لێ وەرئەگرێ و

لە دواییشدا

**ئەم لاو ئەولای**

**ئەم شیعرانەشم ماچ ئەکات.**

بەرگەڵو 1985/7/19

# تاجی خوێناویی

بۆ هاوڕێم هاشمی کەریمی

ئەی گوێچکیلەی ڕاستی.. دڵم!
ئەی پەنجەرەی ڕۆژهەڵاتی زامەکانم
ئەی کوردستانی ئێرانم!
لە وڵاتی جبەی ڕەشا
سیامەند بوو شیعری تازەم
گەڕا بە شوێن چاوی خەجا
شیعری شەیدای باڵای "ورمێ"
ویستی دەستی
گوڵێ بگرێ
ئازادانە پێ بکەنێ!
ویستی دەم بنێتە دەمی،
کانییەك ڕوون، گەش هەڵقوڵێ
زۆری پرسیی
هەموو گەڕاو زەردەخەنەی هیچی نەدی!
خەجم مانگە

مانگی گیراوی زیندانی ناو ئێرانە.

خەجم

وەکوو سێوە لاسوورەکەی باخی "بۆکان"

ملی لارەو چاو پڕ لەئاو

وەکوو ـ زاوابووك ـ ی سابلاخ

هەنیە ڕنراو.. قژ ئالۆزکاو.

ئیستە گولان

وەك ڕوومەتی ڕەنگ پەڕیوی

منداڵانی هەموو ئێران

پەستو سیسو بێ تریقەن

چاوەڕوانی بارانێکی

تازە ئەکەن.

ئیستە کانییم

وەکوو نیگای کیژەکانی

شاری سنە

لێڵو پێڵن

ڕوون نابنەوە، تا ئەو ڕۆژەی

کوندەپەپووی مێزەر بەسەر

ئەم وڵاتە جێ ئەهێڵن

* * *

ئەی پارچەیەك لە جگەرم!

ئەی تاجی خوێناویی سەرم!

هەرچی جبەی ئاخوندەیە کۆی کەنەوە

وەکوو پەردەی شەوی تاریك بیگرنەوە

لە "خانە"وە

هەتا سەقز

بیدەن بەسەر لەشی تۆدا

چرای برینی شەهیدان ناشارنەوە،

بەر لە زریانم ناگرن

من درەختی ئەم ژیانەم

تۆ لەولاوە من ئەبڕیتو

لەولای دیکە من دێمەوە

ئازارێکم چەشەی تەور

تا بمبڕێ من سەر لەنوێ

بنچ قایمتر ئەڕوێمەوە

ئەی ئاو کوژان !

هەرچی تاڵە مووی ڕیشێکی ئاخووندەیە

بەیەکەوە گرێی بدەن

وەکوو گوریس

لە "بانە"وە

هەتا سەردەشت

درێژ درێژی کەنەوە

ئەوساش دەمی هۆنراوەمو

تفەنگەکەم نابەستنەوە!

* * *

ئەی چەکەکەی شانی ڕاستم!

پاردەی قەڵای خۆرهەڵاتم!

پشتاو پشتی زنجیرەی "شا"

لە "کۆڕش"ەوە هەتا قاجار

هەموو ڕۆژێ گوڵیان ئەکوشت

خوێنی کەژو هەردیان ئەڕشت

بەڵام دوا جار

گوڵ نەفەوتا

کەژ هەر نەمرد

ئەوەی کە مرد شا، سوڵتان بوو

ئەوەی، ژیا ئەوەی هەر ما

کوردستان بوو!

* * *

ئەی سەنگەری پڕ هەتاوی ڕۆژهەڵاتم!

گوڵاڵەی سنگی شیرین و

مەشخەڵی دەستی فەرهادم

مەلا وتی: تەلیسماوییم.

دیوارێکی گوللەبەندی زۆر ڕقاوییم.

بەڵام سبەی نا دووسبەی

کە سێڵاوی پەنگ خوراوەی نیشتمانم

ڕژایە سەر

سەر شەقام و گۆڕەپانم.

ئەوسا ئێران

جبەی ڕەشی خۆی دائەدڕێ.

ئەوسا ئیتر بەخەج ئەگەم

بە منداڵو گوڵو کانیی،

لێو بە خەندە هەمووی ئەگەم

ئەوساش تاریکیی ئەزانێ

گەر تەلیسمێ هەبێو نەشکێ

هەبێو نەمرێ

هیچ نەیبڕێ

بەتەنها هەر خۆری گەلە

دڵی گەلە

هێزی گەلە!

1985/7/15

# بەیـــــان

گوندێك هەیە
ڕووتەڵەیە.
کۆتری سپی دەمو چاوی
باڵکراوی ژێر پەچەیە.
لە دوورەوە
ئەڵێی خاڵێکی بچوکە بە لاملی
ـ مەریوانـی باشوورەوە.
زۆر دەمێکە لەم گوندەدا
هەر برسێتیی جێ نیشتەیە
ئاو تینوێتیو
"با" هەناسەی کسپەکەرەو
ڕێبوارێکی بە پەلەیە.
بۆ باڵندە هەژارەکان:
خەم بەتەنها تیا شین ئەبێ
ئەگەر گوڵێکی تیا بڕوێ
ئەویش لێوی بێ خەندەیە.

وەکوو خانووە تەنەکەکان

وەکوو دوکانی سەر کۆڵان

وەکوو کۆڵکێشی ناو سنە

لەناو ئاپوورەی ئێراندا

لەژاوە ژاوی ژیاندا

ئەم گوندە پشت چەماوەیەش

ناونیشانو جێگەی ونە.

* * *

لەم گوندەدا پێش چەند ساڵێ

کیژێ هەبوو

وەك هەرمێ کێویلە وابوو

وەك کارژۆڵەی قاچ قوڕاویی

هەڵئەبەزیو دائەبەزی.

قژی ئەتوت ڕێحانەیە

لەش سپیو سۆڵ وەك مراویی

چاوی وەکوو ترێ ڕەشکە

بۆن خۆش وەکوو پونگەی گوێ ئاو

سرك.. سرك

وەکوو ئاسك.

بەڵام لەناو خەڵۆزانی هزرا

وەك قوتیلکەی ڕەش داگەڕاو

ئازاری بوو پرتە پرتکەر

شەو تا بەیانیی ئەسووتا.

مۆڕەی خەنجەر

تیلەی چاوی بە غەزەبی

باوك. برا. خزم. ئاشنا

هەموو ڕۆژێ ئەم گوڵەیان ئەژاکان و

وەکوو کەرویشکی ترساوی دەرکی لانە

ناوە ناوە سەر دەرهێنەر

ئەیانکردەوە بە کوندا.

* * *

ئەم کیژەمان وەکوو چاوی

بیری زیت بوو.

گشت شەوگارێ

لەژێر لێفەی کون کونەوە

بەقەد ژمارەی ئەستێرەی

شەوی هاوینانی ناو دێ

هەنگی پرسیار لەناو سەریا

ئەوروژان و

تا بەربەیان

نەیان ئەهێشت چاو لێك بنێ!

ئەم بۆ ئەژی؟ ئەو بۆ ئەمرێ؟

ڕەنج بۆ ئەخورێ؟

ئەم بۆ دیلە؟ چۆن ڕاپەڕێ؟

بۆچی ژنو مانگا زەردە
بۆچی ئەمو مامرە کونج
لەماڵەوە، لای پیاوی دێ
ڕێزیان وەك یەك لێ ئەگیرێ؟

★ ★ ★

ئیستە ئێران
وەکوو جبەی ئاخوندەکان، ڕەش ئەنوێنێ
تاران پایتەختی سێدارەو
مزگەوتێکی گەورەی مەرگە.
قیڕەی مەلای قەلەڕەشکە
لەسەر منارەی هەزار ساڵ پێش ئێستاوە
بانگ بۆ تاریکیی ئەداتو
لە میحرابی بەر قاچیشدا خوێنی ئازادیی ڕژاوە.
پەنجەرەی بەر هەتاوی بیر
کلاوڕۆژنەی هەموو تیشکێ
بەڕیشی تۆپزیی ئاخوون.. ئاخنراوە.
ئیستە ئێرانی ئاخوندە
پاپۆڕێکەو پڕ لەتاوان
خوێن بارکردوو
ڕووی کردۆتە قیبلەی جادوو
بایەوانی ئەم پاپۆڕە کەتەو زلە
چارۆکەی عەباو مێزەرە.

ئیستە ئێران بەقەد هەموو
دەنکە تەزبیحێکی دەستو نزای مەلا
بەقەد ژمارەی دەم ویردی ناوی "الله"
لەرۆژێکدا
لەسەر تاتەشۆری جەنگو
لەتابووتی شارو گوندا
کە چاوی پرسە ئەگێڕێ
هێندە خوشکی
هێندە دایکی
هێندە رۆڵەی سەر بڕراوی
خۆی ئەژمێرێ!

* * *

ئەوەتا وائیستە هەردوو
کەڵەگای شەڕ
کەڵەگای سەر کوردستانم
کەڵەگای سەر دەغڵو دانی هەژارانم.
لەناو پەرژینی کۆتانی
بە چەقۆ دەور گیراودا
لەبازنەی داخراوی بێ رێگادا
شاخ خوێناویی
پشت خوێناویی
ڕم لە قەپرغە هەڵچەقاو

یەکتر دێنن یەکتر دەبەن
لمۆز شکاو.
ئەوەتا وا جەرگی پارە پارەی گەلم
ئەڵێی بێژنگی بەر خۆرە
چۆڕەی خوێنم
چۆڕاوگەیەو
دنیا شۆڕە!.

* * *

ملی ئازادیو ملی شاخ وەکوو یەکن
قەت کەچ نابن
هاوڕێکەم!
ئەم ئێرانە کەڵەگەتە قاچ شکاوە
هاتە لامو لای منەوە بۆ یەکەم جار
پەیژەم بۆ کرد
تا سەرکەوێتە سەربانی
ئەو زامانەی
بەسەر حەوشەی
هەردوو لاماندا ئەیڕوانی.
یەکەم جار من پاچم دایە
یەکەم چەك من کردمە شانی
یەکەم جاریش من ماچم کرد
من برا بووم برای ڕاستیی

هەر بەم پشتە زامدارەی خۆم
یەکەم شەهیدیم گرتە کۆڵ.
ئەی کوردستانی موقەددەس!
ئەی لەیەك کاتا دایەنی
ئازاری خۆت
ئازاری خەڵك.
ئەی ئاواتی پەرەوازەم!
لەیەك وەختا
تۆ پەنایتو پەناهێندە.
تۆ زامیشیو دەرمانیشی.
تۆ شەوگاریو ڕۆژگاریشی
تۆ قوربانییو ژیانیشی.
★ ★ ★
کچە هەناری لادێیی
باڵای کرد و وا پێگەیی.
ماکەوەکەی خاڵ لە ملم
کەوتە چینە
لەسەر گڵە سووری دڵم!
ئیستە کەنیشکی ئەو دێیە
دێتو ئەڕواو قسەی پێیە
قسەکانی لەلای هەندێ
وەك شەمامە هەڵئەگیرێو

ناوبەناوێ بۆنیان ئەکرێ!.
لەلای زۆربەش ئەو قسانە
وەکوو دڕك لەبنی پێ هەڵئەچەقین
بۆ پەزی نەریتو دابی، کۆنە ساڵە
بە زیان بوون
بۆ ئەوەی ژن وەکوو ماین
وەك نێرگەلە
وەکو دەڵەك
سەیر نەکرێ
نەژیو نەمرێ
ئەو قسانە لەناو دێداو لەلای مەلا
وەك تلیاكو گۆشتی بەراز
قاچاخ کرا!
⋆ ⋆ ⋆
ئێران زەریایەك بوو ئەکوڵا.
بەرامبەر شەوی ئاخوندە
بێشەڵانی مەشخەڵ بەسەر ڕاوەستابوون
ئاگر مەوجی ئەدایەوە..
تووڕە بوونی دارستانی ڕووتەو هەژار
لە ئیمامی تەوری ڕیشدار
هەتا ئەهات هەڵی ئەکرد
هەتا ئەهات زیادی ئەکرد!

بەرە بەرە ئاگرە سوورە

ئەتەنیەوە..

بەسەر پردی کوردستاندا

هەر شیرین بوو هەر فەرهاد بوو

ئەپەڕیەوە..

ئەمجارەیان کچ هەر گوڵی

پێخە نەبوو

هەر خەزاڵی لەش‌و لاروو

سێوی بەردەستی لاس نەبوو.

گوڵدانێکی ناوماڵ نەبوو.

ئەمجارەیان شیرین هەبوو،

قوڵنگ بە دەس

ئەمجارەیان خەزاڵ هەبوو

لە سەنگەرا

ئەچۆوە بەگژ ئاگرا.

⋆ ⋆ ⋆

بەیان، بەیان، بەیان

لەناو ئەشکەوتی شێداری

خۆر نەدیوی دڵی خەڵکا،

ئەو پرشنگ بوو هەردوو چاوی.

لەناو گوندا

دەنگی ئەدایەوە ناوی:

بەیان، بەیان، بەیان

لەو ڕۆژەوە کە شانە هەنگی پێشمەرگە

دەوروبەری ئەو گوندەیان کرد بە شیلە

ئیتر هەر هەنگ بوو نێرو مێ

بەسەریەوە ئەنیشتنەوە!

لەو کاتەوە ئیتر "بەیان"

وەك پەڕەسێلکەی دڵداری

زەوی وباران .

وەك کەنیسمەی باڵ ڕەنگاوڕەنگ

تینوو بۆ خوێندنێ سەربەست.

وەك سوێسکەی عاشقی بەرد،

وەك قەقنەسی عاشقی گڕ

لەسەر درەختی ناو "دێ" وە

ڕۆی.. هەڵفڕی

هێلانەکەی خۆی گواستەوە

بۆ سەنگەری

ئەو مەچەك‌و تفەنگانەی

لەناویاندا هەر بەتەنها

ترس ئەگری!

لەپەنجەرەی هەتاوەوە

چووە دڵی هەژاری ڕەنج

سووتاوەوە.

لەناو کەوانەی داسەوە

خۆی هەڵدایە باوەش زەوی.

بوو بە پێڵووی چاوی گەنم.

بوو بە پەنجەی دارو درەخت.

بوو بە دێراو بوو بەجۆگە.

ئینجا چووە لای تفەنگێ

کە لەسەر ئاسۆی دوا ڕۆژم

رزگاری ئاو.. رزگاری خاك

لوولەی ئەو بەگڕ ئەینووسێ!

* * *

منداڵی دێ وەکوو نوقڵی ترش‌و شیرین

"بەیان" یان لا خۆشەویست بوو

هەموو جارێ کچانی دێ

وەکوو چرا

لە دەوری کۆئەبوونەوە

ڕازی نەهێنیی ناو دڵیان

لا هەڵئەڕشت

لە دواییدا یەکە یەکە

بۆ هەندێ بەرز، هەندێ چرپە

ڕێی ڕۆشنی دیاری ئەکرد.

لای دڵانی سادەو ساکار

وەك سەرچاوە وەك سەوزە گیا

بەیان چەندە خۆشەویست بوو
لای سك تێرو مل هووڕی "دێ"یش
جێی توانجو
جێی پلارو
جێگەی تانەو
سەرزەنشت بوو.

٭ ٭ ٭

لەئیستەوە ئیتر بەیان ئەو کچەیە
تاریکیی ماڵ،
شەوی درێژی کۆیلەیی،
وەکوو پرچی زیادو تەمەڵ
هەمووی ئەبڕێ!
شێری مێیەو لەناو لانەی
ئازادەوە دێتە دەرێ.
وەکوو چیام سەر هەڵئەبڕێ.
لێشاوێکەو ئەو دیواری
نامۆییە ڕائەماڵێ
کە دەمێکە، زۆر دەمێکە
لەم کوردستانە دیلەدا
بەر لەتیشکی نیوەی خۆرم
نیوەی حەقیقەتم ئەگرێ.
لەئیستەوە ئیتر بەیان

ئەو بیرە شاربەدەر ئەكا

كە ژن ئەبێ

هەر لەسەر جێو هەر لەماڵدا

بژیو بمرێ.

نەء وا بەیان

وەك باوبۆران

شاخ ئەسپێتیو سواری ئەبێ.

بەسەر "زین"ی بەفرینەوە

ئاوزەنگی ئەدا لە سكی بن بناروو

گزنگ ئەكا بە چەپكو

بۆمان دێنێ!.

لە ئیستەوە ئیتر بەیان ئەو كچەیە

چەك بەدەستو شەرواڵێكی لەپێ دایەو

پێشمەرگەیە.

* * *

ئەی ژنانی وڵاتە قژ سووتاوەكەم!

بەیان زەنگە

گوێی لێ بگرن!

بەیان دەستڕێژی ئازادیی

ناو ئێوەیە

سەر هەڵبڕن.

بەیان دەمی ئەو پاچەیە

شەوە زەنگتان ئەڕوخێنێ
دەنگ هەڵبڕن.
بەیان ئەو دارو خشتەیە
دنیای تازە پێك ئەهێنێ
چاو هەڵبڕن.
بەیان لوولەی ئەو چەکەیە
مەرگ ئەمرێنێ
کوان؟! ڕاپەڕن!

* * *

بەر لە ئێوە ئەی بەیانو ئەی کچانی
ئەودیو ژوورم
ئەی دڵخوازانی ڕووناکیی!
ئەی ئەوانەی بۆ یەکەم جار
بەر لە کۆرپەو ساوای خۆتان
لەناو گێژەنگی ئاگردا
شیری مەمتان
کردە ناو دەمی ئازادیی.
بەر لەئێوە
ئەی کچانی سەنگەری سوور!
هەر ملوانکەم ئەکردە مل کچی شیعرم
هەر مێخەك بەنگو کرمەکم
ئەهێنا بۆ کچی شیعرم

هەر سووراوم ئەدا لەگۆنەو ڕوومەتی

کچی شیعرم

بەڵام وەختێ ئێوە هاتن

وەك برووسکە،

داتان لە هەواری شیعرم.

لەو رۆژەوە ئیتر منیش:

چەکم خستۆتە سەر شانی کچی شیعرم

فیشەك لغم هێناوە بۆ کچی شیعرم

بەرگی خاکیم کردۆتە بەر کچی شیعرم

کاسکێتێکم کردۆتە سەر کچی شیعرم.

* * *

ئیستە بەیان هەر هاوڕێی گوندێ نییە

بەتەنها هەر مەریوانم

شارۆچکە خنجیلانەکەی

سەر شەقامی دڵی نییە.

ئیستە ئێرانو کوردستان

شاخو پێدەشت

ڕووبارو باخ

کارگەو کێڵگە

لەدەواری ئەو دڵەدا

هەموو جێگەیان بۆتەوەو

هێشتا جێگەش زیادی هەیە!

ئیستەش بەیان بۆ چاوی کزی هەژاران.. چاویلکەیە.
ئەگەر ئەوان مەرەزەبن.. ئەم جۆگەیە.
گەر ئەوان پەڕە کاغەز بن.. ئەم وشەیە.
ئەگەر ئەوان چاپخانە بن.. ئەم پەنجەیە.
گەر ئەوان چەكو تفەنگ بن.. ئەم گوللەیە.
ئیستە بەیان هەموو شەوێ
لەنۆرەدا ئەستێرەیەو ئێشك ئەگرێ
ئامادە باش!.
بۆتە ئاشنای بۆتە خزمی زۆر نزیکی
ئەو کتێبانەی کە هەر وەك لایتەکەی
دەستی، شەوان
ڕێگای بەر پێی ئەدۆزنەوە
هەتا فیکری هەڵ نەنووتێ
لەو قۆرتانەی
بیبەن بەرەو قاچ خلیسکان!
* * *
بەر لە چەند ساڵ لە ناو گوندا کەمێ نەبێ
قۆخی دڵیان ئەگۆڕێوە لەگەڵ بەیان
ئیتر هەموو قسەی ئەویان
بە زەردەواڵەو بەکوللەو
بە جزووی دووپشك ئەزانی
بۆیە وتیان

ئەم کچەمان

ئاوەکییە بەم گوندەمان.

بۆیە مزگەوت بانگی هەڵدا

ئەوو شەیتان

لەیەك بەرگان.

بەڵام بەیان بەقەدەر شاری کرماشان

دڵی گەورەو فراوان بوو

بەڵام بەیان لەتینوێتی ئەم گوندەدا

هەر باران بوو

لە سووتانی ئەم گوندەدا

ڕیزە سەتڵی،

ئاوی ئاگر کوژێنەوەی سەر ماڵان بوو.

لەزامداریی ئەم گوندەدا

ماشینە شێوە سپێکەی

خاچی سووری ناو ئێران بوو.

بۆیە ئیتر وردە وردە

کەمی ناو دێ

بوون بە زۆربە!

★ ★ ★

ئەوا ئیستە بەیان لەژێر دار توویەکدا

لەسەر بەردێ دانیشتووە

لای خۆیەوە چەکەکەی هەڵپەساردووە

هەر لەسەر ڕان

هێور هێور
نامەیەكی دوورو درێژ
ئەنووسێ بۆ ماڵی خۆیان!

★ ★ ★

نامە گەیشتە دایكو باوك
وەكوو گۆنە نامەش تەڕ بوو
لە پێشدا هەواڵ سرپە بوو
وەك كزە با بێ گڤە بوو
ئیتر ماڵان
جووت جووت یاخود یەكە یەكە
ئەهاتن بۆ نامەی بەیان
ئەهاتن بۆ هەواڵێكی
كچە سەربەستی پێشمەرگە!
نامە وەكوو گوڵە زەردی
دەم عەتر ڕێژ
وەك بۆنی مۆردی سەرەڕێ
گەیشتە لووتی هەموو دێ
نامە وەكوو یەك پەرداخ ئاو
بۆ زۆر تینوو
چۆن دەستاو دەستی پێ ئەكرێ
چۆن ئەگەڕێ
ئاوایش نامەی پەڵە پەڵە

بەفرمێسك تەڕ
نامەی بەیان
لەدوو ڕۆژدا وەكوو نامەی
كۆن بووی گیرفان
چرچ كەوتە دەم‌و چاوی
لەشی ڕێ ڕێ.
ئیتر ئەوەندەی نەما بوو
تەواو بدڕێ.
كە هەواڵ بوو بە ڕەشەبا
لەبەر ماڵدا
خەڵكی وەستان بە قەتارە.
كە ئاوێنەی نامەی بەیان
شەوقی تیژی دا لەچاوی
حەپەساوی سەر منارە
ئەوسا مەلای مزگەوتی دێ
وەك قەلەموونی شلەژاو
بە ناچاری ئیتر هەستاو
بە دەنگی خۆی
لەبڵندگۆی مزگەوتەوە..
نامەی "بەیان"ی پێشمەرگەی
بۆ خەڵك‌و خوای گوند خوێندەوە!
* * *

وا دەستەیەك

بەرگ خاکیی، خوێن قوڵپ دەر

شانو لامل ئارەقاویی

لەهەڕەتی ژیانداو

جیایان ناکەیتەوە لەیەك.

بەهەنگاوی گورج تەکاندەر

یەك لەدوای یەك

ڕەوە ئەسپێکی کێوینو

ڕێی مەرگی سوور ئەگرنە بەر.

بە پێدەشتی سوژن ڕێژدا ئەدەنە غار

چەمی سەرکەش جلەو ئەکەن

چۆك بە دەربەندو هەورازو

کلکەی سەر چیادا ئەدەن

تفەنگی شان، کۆڵی پشتیان، قۆناغ قۆناغ

ئەبەن هەتا جێگەی پرسیار، جێگەی سۆراغ

بە هەر کوێیەکدا ڕەت ئەبن

زەردەخەنە ئەچێ بە پیر لێویانەوە

سوورە گوڵ بەرەو بەرۆکیان

نان بۆ پشتێنەکەی پشتیان

هەژارانیش بۆ ناو دڵیان!

* * *

پادگانی سەر ئەو ملەیە

بۆتە دوومەڵی سەرشانی ئەم ناوچەیە

لەدیمەندا وەك مڵەیە.

دەستەی دڵداری چاو تینوو

پەنجەی تۆڵەی سەر تفەنگیان بە پەلەیە

هەر ئەوەندەی چاو بترووکێ

لەپڕێکدا دەست ڕێژ وەکوو

باران و هەورە تریشقە

بەسەر بەرازی پادگاندا دائەبارێ

شریخەی چەك.. ناڵەو گرمە

بۆ سەعاتێ دوو سەعاتێ

ژیان لە مڵە تاڵ ئەکەن

لەچەند لاوە بەرازی خیش زامدار ئەکەن.

⋆ ⋆ ⋆

ئیستە دەستە لەسەر ڕێگەی گەڕانەوەن

بەرەو بنکەی لێوە هاتوو..

ماندوو.. ماندوو..

وەك دوا شەپۆلی کەناری لە گوڕ کەوتوو

تینوو.. تینوو.

وەك قڵێشی لەشی زەوی گەرما بردوو.

دوو بریندارى ناودەستە

یەکێ بە شەلە شەل ئەڕواو

ئەویتریان سەرشان پێکراو

خوێنی قاچو ئەو سەرشانە

هەتا ئێستەش تکە تکە

دائەدەنە سەر جامانە!

کانیو ئاوو سێبەری کڕ

بوون بە ئێزگەی حەسانەوەی

پشکۆو ئاگر

لەوێ کە خۆیان کردەوە،

بۆ کزە با.

دەمیان خستە دەمی کانیی.

ئەوسا دەرکەوت

قژ درێژێك

سنگ بەرزێکیان

سەر دەستەیە

ئەویش "بەیان"ی برووسکەی

ئەم گەلەیە!

⋆ ⋆ ⋆

بەیان وابوو

برایمۆکی هەژارانی ئەم وڵاتە.. یاری ئەو بوو

دەستێ کورتەكو شەرواڵی کوردی شڕۆڵ

بەرگی بووکێنییەکەی ئەو بوو..

ڕیزە فیشەکی ناو قەدی.. هەیاسەکەی پشتی ئەو بوو.

ئەستێرە سووری پێنج گۆشە.. ملوانکەکەی ملی ئەو بوو.

قوڵفی نارنجۆکی دەستیی.. موستیلەکەی پەنجەی ئەو بوو.

خۆڵو بارووت.. بۆنو پۆدرەی لەشی ئەو بوو.

بەیان وابوو

ئەو سێبەری باڵای بیری کەڵەگەت بوو

چاوی گەشی منداڵانی لە دڵدا بوو

ئەو دەنگدانەوەی هاواری سەربەستیی بوو

مێژووی نزیك، مێژووی دووری لەگەڵدا بوو

بەیان وابوو.

کچە پێشمەرگەی سەعاتو دوو سەعاتی

ناو چیمەنو سەیران نەبوو.

دە بینووسە!

بە مەرەکەبی ئەو خوێنەی شەهید دایمیٚو

وا لە شووشەی چاوی مندا

دە بینووسە!

چەند مەزنە

بەیان ڕابەری کۆمەڵێ برووسکە بوو

ئەوان پیاوو هەر ئەو کچ بوو!

★ ★ ★

بەڵام کەی بووە شیعری من

بێ ئاخو داخ شەوێك بنوون؟

کەی بووە کەی لەدوای ماچی هەموو گوڵێك

بە زماندا هەڵنەچەقێ دڕکێك، چقڵێك؟

کەی بووە کەی لەناو ماڵی شیعری خۆمدا

لەیەك ژووردا

وشەو وشەی دایك باوكێ

دووانەی نووكێ

دووانەی سكێ

لەخانەوادەی یەك ئازار

لێرەو لەوێ

لەبەر چاوی تیغی گەورەی لەسەر ملم

لەبەر چاوی شیری گەورەی

ڕاوەستاو لەسەر سەرم

ئەو خوێنی ئەم

ئەم خوێنی ئەو

نەكەنە كاسەی ڕۆژگارو

لەپرسەدا نەیگێڕن بۆ هەموو گەلم؟!

* * *

هەزار ساڵەو هەتا ئەمڕۆ

تەورەكان هەر كوردستانم ئەبڕنەوە

لەت لەت لەت لەت.. لەتم ئەكەن

كەچی منی لەتە برین

لەتەكەی تری خۆم ئەخۆم

كەچی منی ئازارو ژان

بەسەر جەستەی ئازارەكەی ترما ئەڕۆم

من ئەو برینە گەورەیەم

ئەبمە چەقۆو دیسانەوە

هەمان برین کەرت کەرت ئەکەم

ئەو کەرتانەش دیسانەوە

ئەبنە چەقۆی تازە ترو

ئازارەکەم وردتر وردتر

وردتر ئەکەم!

* * *

گەر دوو زامی لەشی باخێك

دەس لەملی ئازارەکانی یەك نەکەن

چۆن برینی گوڵی باخچەی

دنیای دوورتر سارێژ ئەکەن؟

گەر دوو کەناری ڕووبارێك

باڵی فڕینی باڵندەی یەکتر بکەن

بۆ باڵندەی زەریای دوورتر

چۆن هێلانە دروست ئەکەن؟!

گەر دوو ئاگر

گەر سێ ئاگر

گەر چوار ئاگر

هەموو نەبن بەئاگرێ

بەکڵپەیەك

گڕ لەدیوی هەژارخۆری ئەم کوردستانە بەرنەدەن

چۆن هەژاری ئەم دنیایە

چۆن ڕووباری ئەم دنیایە

چۆن باڵندەی ئەم دنیایە

لەچنگی دێوی گەورەتر قوتار ئەکەن؟!

⋆ ⋆ ⋆

لێرەو لەوێ

تەور تەورە

لێرەو لەوێ

خوێن یەك خوێنە

تەماشاکەن

نەخشەی گوڵینی ئەم لەشە

ماڵی گەڕەکی قوربانیی

یەکە. یەکە

ژووری زامی نەجۆو ئاوارەو سوڵتانی

ژووری برینی شەماڵو مامە ڕیشە

وەکوو ماڵیان

دەرگای دڵیان لەسەر یەکە.

⋆ ⋆ ⋆

ئەو وەختەی چاوی بازێکی لای موعینیم

هەڵ ئەکۆڵن

سۆمای چاوی هەڵۆیەکی لای سوڵتانیم

تاریك دایەت!.

ئەوکاتەی دەمی شیعرێکی من ئەبەستن

تۆ هەناسەت بۆ نادرێ.

ئەو دەمەی "بەیان" ئەکوژرێ

یەکە یەکە لەیەك وەختا لای هەموومان

خۆرێ، مانگێ، گوڵێ ئەمرێ

بەیان، بەیان، بەیان

ئەو تفەنگەی دەستەکەی تری خۆم کوشتی

ئەو شیعرەی هەر قەڵەمەکەی خۆم بوو کوشتی

ئەو شەپۆلەی ڕووبارەکەی خۆم خنکاندی

ئەو درەختەی بروسکەی خۆم سەری بڕی

بەیان، بەیان، بەیان

* * *

هەتا دوێنێ "دێ" کەی بەیان

ناونیشانو شوێنی بەیان

بزر بوو وەك مرواری ناو بنی زەریا

بەڵام ئەمڕۆ دێ کەی بەیان

"بەرقڕوی" لای مەریوانم

بوو بەهەموو نەخشەی ئێران

بوو بەچاوانی کوردستان

بەیان، بەیان، بەیان

ئیتر بەیان هەر بەتەنها

دار گێلاسی مەریوانو ئێران نییە

كانی سنەو بۆكان نیە

ئەمڕۆو سبەینێو داهاتووش

ئیتر بەیان كیژۆڵەكەی دایە گەورەی كوردستانە

ئیتر بەیان لە ئیستەوە

ئەستێرە سوورە گەشەكەی

هەژارانی گشت جیهانە!.

بەرگەلو 1985/7/18

# قیبلەنما

کوردستانم برینێکە، برین: لقی داربەڕووە.
واز لەو برینەم بهێنن، لێی گەڕێن با
پەڵو پۆی سووری بهاوێ‌و
سێبەر بۆ ئازادیم بکا!.
من هەر چاوی دارستانی گڕتێبەربووی
خۆم شك ئەبەم
ئێشکم بگرێ.
من هەر خوێنی لەبەر ڕۆیشتوی ئەم شاخانەی
خۆم شك ئەبەم
هەڵگیرسێت‌و پێشم کەوێ!.
واز لەم برینەم بهێنن
زەریام شەوەو، قیبلەنمای ملم مۆمە
بایەوانی ئەم کەشتیەیش هەر چارۆکەی سەری خۆمە
هەر خۆم.. هەر خۆم.. هەر خۆم
من خوا نیم‌و ئەوەتەی هەم هەر تەنیام‌و

کوردستانیش باوەشی عەشقی دایکێکە
وەکوو مێژووم سك سووتاوەو چاوەڕێمە!.

* * *

واز لەم برینەم بهێنن
چەشەی چەقۆ، چەشەی پشکۆ، چەشەی خوێ یە
ئەم برینە!.
پەنجەرەیە، ئەستێرەیە، ئەسپی سووری غار کردنمە
ئەم برینە.
هەر ئەو بە تەنیا شك ئەبەم
لەجێی ئاڵا ئەوەم هەیە
من هەڵیکەم!.
هەر ئەو برینە شك ئەبەم
بۆیە جارێك چەتری ڕەهێڵەی سەر سەرمەو
هەڵی ئەدەم.
جارێکی تر دەمی ئەستێرکی چاوانمەو
بەری ئەدەم!.
هەر ئەو برینە شك ئەبەم.
هەر ئەو خوێنە:
فرۆکەمە
دەبابەمە
بازۆکامە
کاتیۆشامە..

لە ئاتشگەی مەرگی سووری خۆمدا تەنها
من هەر سوجدە بۆ ئەو ئەبەم!.

* * *

کێ دەنگی کرد؟! کێ هاتە سەر تەرمی کانییم؟!
لەناو مێژووی هەڵقرچاوما
کێ بوو قومێ ئاوی کرد بە دەمی
سنەوبەری سەربڕراوما؟!
کە ڕووباری لەشیان کوشتم
کام ئۆقیانوس خۆی گرژ کرد؟
پردی کام جێ دەسی گرتم؟
کە هەرمێی مەمکیان هەڵکەندم
کە شەمامەی دڵیان گوشیم
ڕەشەبای کام لا هەڵیکرد؟
کێ ورتەی کرد؟
کێ؟ کێ؟ کێ؟
کە پرچی ڕەزیان هەڵکێشام
کە چاوی گوڵیان دەرهێنام
وەکوو ئاغزە جگەرە
توێکڵە شووتی
پێیان پیا نام!
کورسی کام پایتەختو یاسا
لەقەی بۆ کرد؟

کێ دەنگی کرد؟

مووی سمێڵی کام ڕژێم بوو

جووڵەی بۆ کرد؟

تووکە سەری کام گەورە پیاو

تووکە بەری کام گەورە ژن

بۆ من بزووت؟!

هەر دوو لایان

هەر سێ لایان

هەر چوار لایان

یەك لەدوای یەك،

هەرچی هەستا بە خوێنی من دەس نوێژی گرت

بە خوێنی من ڕۆژووی شکان

خوێنی منی دا بە نەوت!

یەك لە دوای یەك

هەرچی هەستا کاسە سەرمی کرد بە تەپڵەك

هەرچی هەستا چەرمی سکمی

کرد بە جانتای دیبلۆماسیو

ئینجا سرەوت!

هەرچی هەستا ئێسکی منی کرد بە پەیژەو

بە پێپلیکەو

خۆی پیا سەرکەوت!.

لە بازاڕی ڕۆژهەڵاتو ڕۆژئاوادا

کۆیلەی پێست سپی بووم‌و

من بۆ کێ نەبووم بە دەسکەوت؟

کێ گۆشتی کوت کوت کراوی

ئەم لەشەی منی بەر نەکەوت؟!

★ ★ ★

کوردستانم برینێکە، برین مانگە

واز لەو برینەم بهێنن

با لە کەلی ئەوینەوە

گەش گەش هەڵبێ.

با گەورەبێ، با تریفەی پەل بهاوێ.

بەرەو باکووری ئازارم

بەرەو باشووری شەوگارم.

دەبا هەڵچێ، برین هەڵچێ

وەکوو سوورە چنار هەڵچێ

وەکوو لاولاو با لە قەفی زنجیرمەوە

خۆی بپێچێ

هەر ئەو برینە شك ئەبەم پەنجەرەم بێ

کڵاو ڕۆژنەی ئەم سەرەم بێ.

نەوتی چرای لەشیان دزیم.

من چیم هەیە لە دووکەڵی شیعر زیاتر!.

قژی کەژو هەردیان بڕیم

من چیم هەیە لەئاگرو کڵپە زیاتر!.

ئاوی سەرچاوەیان کوشتم
دارو درەختیان کوێر کردم
لە کوختەکەی دڵی خۆیشما کرێچی بووم
دەریانکردم!.
پشیلە بووم.. بۆ بەرەو خوار
خستمیانە گوێنیەوەو سەریان بەستم.
مەیمون بووم‌و ورچ بووم‌و پەتا بووم‌و
لەوێش دەوریان بە دڕکەزی‌و تەلبەند گرتم.
من چیم هەیە لەپەتی سێدارە زیاتر
لە ئۆردوگای دیل بەولاوە
لە ژمارەی شەهید زیاتر؟!
من چیم هەیە؟
من هەر ئەو خوێنە شك ئەبەم
کە سوراویی لێوی بەردو
گۆنەی پەلکە گیای پێ بکەم!
من هەر ئەوینێ شك ئەبەم
ڕقی پیرۆز ئەخاتە بەر
پەلە پیتکەی تفەنگەکەم!.
من ئەو برینە شك ئەبەم.
برین مانگەو برین ئاگر
من چیم هەیە لە خوێن زیاتر؟!

بەرگەڵو 1986/2/20

# شایی شەهید

مەپرسن چۆن؟
کە دڵ ئەبێ بە سوێسکەو "سلێمانی" بە هێلانەی
ئیتر شیعریش ئاسمانێکەو پۆل پۆل وشەی
سەوزو سووری تێدا ئەفڕێ!
مەپرسن چۆن؟ کە ئەم سەرە گڕگرتوەیش
ئەبێ بەپەڵە هەورێکی نزمو نەویی سەر "ئەزمڕ"و
بەدەم گینگڵی ژانەوە، گرمەگرم
بۆ بەرەوخوار دائەگەڕێ
بەسەر شەقامو ماڵاندا دائەبارێ
ئیتر شیعریش سەرچاوەیەکەو قوڵپەقوڵپ
لەم بناری چاوانەوە هەڵ ئەقوڵێ!
مەپرسن چۆن؟ گەر خەم نەبێ بە بروسکە
گەر ئەوینی وەنەوشەیی چاوی ئێوە،
نەبێ بە ڕێگاو تروسکە
چرۆی ئەم زامی شیعرانەم

لەم بەستەڵەکی سنگەدا

چۆن ئەپشکوێ؟!

دەنگ چۆن ئەبێ بە ڕەشەباو

شەپۆل چۆن لە گیانما ئەنوێ؟!

مەپرسن چۆن؟

نەء.. مەپرسن!

ئیستە لای من

هەموو ڕۆژێ

لە نێوان چاوانی "گۆیژە"و

گەردنی "پیرەمەگرون"دا

خۆشەویستیم: کۆترەشینکەی پێشمەرگەیەو

نامەی دوا شەهیدی پێیەو

شەقژەنێتی دێتو ئەچێ

مەپرسن چۆن؟!

ئیستە لای من

هەموو شەوێ

خۆشەویستیی "سلێمانی"

مانگی سوورەو

لەناو بەفری شیعرەکانما

ورد ورد هەڵدێ!

مەپرسن چۆن؟ نەء.. مەپرسن

شاعیر وەکوو پەڕەسێلکەی کۆچەر وایە

هەرچەند وەرزێ بۆ "شەم"ی یار ئەجریوێنیٚو
ئیتر ئەویش ئاوازێکەو چاو لێك ئەنیٚ!
مەپرسن چۆن؟!
داستانی پێشمەرگە ئەڵێ:
رێی سیامەند بۆ لای خەجێ
بەناو گەرووی زۆر نەهەنگ دا تێ ئەپەڕێ
وەرزی عاشق سواری وەکوو
"فەرخ" و"مەم"و "مامەڕیشە"و "نەجۆ"ی ئەویٚ!
ڕەنگە باڵی زۆر هۆنراوە
زۆر گۆرانیی
لەم زستانەدا هەڵوەرێن.
ڕەنگە قژی زۆر ئەرخەوان
زۆر شۆڕەبی
وەکوو پرچی کچی شارم
بەم کرێوەیە داڕنرێن.
ڕەنگە زۆر چناری عیشقی هەڵچووی
بەردەم وەك حوجرەکەی "نالی"
هەر بەپێوە هەڵپڕوکێن!
ڕەنگە مەمکی زۆر "حەبیبە"م
بەم دیواری شەوگارەدا دابکوترێن.
ڕەنگە زۆر گەڕەکی دڵم
ماڵی چاوم

ژووری دەروونو هەناوم

کاولاش.. کاولاش..، تەخت کرێن!

ڕەنگە.. ڕەنگە.. ڕەنگە

بەڵام نیگای "گڵەزەردە"

چرایەکە وا بەدەستی شەهیدەوە

دووسەد ساڵە

ماڵەوماڵ ئەکاو ئەگەڕێ

دووسەد ساڵە

ئەم چرایە نە پێڵوی گڕی ئەتروکێو

نە کز ئەبێو

نە ئەشمرێ!

* * *

حەڤدەی "کانون"

لە گیانەڵاوی پایزدا، پێش دواکۆچی باڵندەی پار

بەیانیەکی خۆرەتاو، بەیانییەك، ڕوومەتی گەش، وەکوو منداڵ،

پێئەکەنیو سوورمەی شەوقی ئەدا لە شاری بن بنار.

بەیانییەکی خۆرەتاو، کزەبای سارد، وەکوو تەرزە

هەناسەی گردی سەیوان بوو

وەکوو هەموو بەیانییەك

ئەمرۆیش شارم، شاژنێکی شڵەژاوی نیگەران بوو

تاوانی حل بەڵەك.. بەڵەك

لەسەر پیادەڕەوی شەقام

لە پێشوازی ئەو ڕۆژەدا
دەستیان ئەکردە مل سونگیو
تاقیان لێئەدا بۆ مەرگ
تاوانی جل بەڵەك بەڵەك
دەست لەسەر چەك
لەشی شیعریان ئەپشکنیو
گوڵیان ئەخستە ژێرپێیان.
بەیانیەکی خۆرەتاو
بەسەر شمشێری شەقامدا
یەك یەك، دوو دوو، قوتابیان
وەکوو قەڵەمی ڕەنگاوڕەنگ
هەنگاوی خێرای وشە بوون
هەنگ بوون ئەفڕین
بەرەو شانەی پۆلی مەکتەب!

⋆ ⋆ ⋆

مانگی پژانو هەڵوەرین،
حەڤدەی کانون، بەیانیەکی خۆرەتاو
لەژێر زەمینی شێداری بن شارەوە
لە زیندانی خونخوارەوە
سێ جوانویان هێنایە دەر
سێ جوانوی تۆڕ
لە مێخ یاخی

چاو ئاگرین

پشت داخ کراو

یاڵ خوێناویی

لەناو تەندووری تانکێکدا

سەر بەرەوژوور

ئەیانبردن بۆ سەربڕین.

⋆ ⋆ ⋆

مانگی پژانو هەڵوەرین، حەڤدەی کانون،

لەڕۆژێکی خۆرەتاودا

لەبەردەمی مەکتەبێکی حەپەساودا

لەپاڵ دیوارێکی نزما، ڕایانگرتن

ئەرخەوان بوون

روویان کردە "پیرەمەگرون"

سێ ئاسك بوون

سێ ئاسکی "سلێمانی"

سێ جوانوی وەرزی قوربانیی.

سێ گۆرانیی.

سێ دارنەمام.

"سەردار" لقی دارچواڵە بوو

یەکەم بەهار بوو گوڵ بگرێ

"هیوا".. ئەتوت کانیەکەو پێ ئەکەنێ

"ئارام".. بێچوە هەڵۆی چاوتیژ

ئەیویست بەر لەوەی پەڕ دەرکا
بەرەو حەساروٚست هەڵفڕێ!
لە پاڵ دیوارێکی نزما ڕایانگرتن
شریخەیەكو دووانو سیانو چوارو دە
تفەنگ.. خۆرەتاو ئەکوژێ!
تفەنگ.. خوێنی گوڵەگەنم
بەسەر شەقامدا ئەڕێژێ!
تفەنگ.. چاوی ڕۆشنبیری هەڵئەکۆڵێ
تفەنگ.. تفەنگ
سێ پەڵە خوێن، سێ کێڵگەی سوور
لەژێر سێ داری ئەلکتریکی بەر مەکتەبا
بۆ گڵۆپو بۆ ڕێبواران بەجێ دێڵێ!.

* * *

حەڤدەی کانون، بەیانیەکی خۆرەتاو،
لە گیانەڵاوی پایزدا
بەر لەوەی ساڵ پاڵتۆی زستانە لەبەرکاو
گۆچانەکەی هەڵگرێتو دەستی لەرزۆك هەڵبڕێتو
بە ئێجگاری ماڵ ئاوایی لەم دنیایە هەمووی بکا.
بە سیانزە ڕۆژ، پێش ئەوەی ژیان هەمدیسان
ساڵێکی تر مارە بکا!
لەو ڕۆژەدا، شاخەکانمان، لە لوتکەوە
بەرەو مێژوو

بازیان هەڵدا

تا بزانن کێن ئەوانەی لەو ساڵەدا

لەوڵاتی شەهیداندا

ئەبن بە خۆر

ئەبن بە مانگ

ئەبن بە شا.

* * *

حەڤدەی کانون، بەیانیەکی خۆرەتاو

لەگەڵ دەنگی باڵەبانی چیای سووردا

لەگەڵ هۆرەی خاكو خۆڵی شارەزووردا

دەم بە گوڵو لێو بەخەندە

"سلێمانی" سێ زاوای خۆی کردە پەردە!.

حەڤدەی کانون، بەیانیەکی خۆرەتاو، لەناکاودا

لەبەردەمی مەکتەبێکی حەپەساودا

لەبەردەمی مەکتەبێکی قژ ژاکاودا

شایی سێ زاوای ئێمە بوو

ڕەشبەڵەکی شەهیدان بوو

ئاهەنگی عیشقو سووتان بوو

لەناو یارانی قوربانیی ئەم شارەدا

لەو رۆژەدا کێت نەئەدی!

لەو رۆژەدا کوردستانم چاوی گێڕا

لە ئاپورەی زەماوەندا

**ئەوەی لە دووسەد ساڵەوە خوێنی دایەو**

**خۆی پێبەخشی**

**لەوێ ئەیدی!**

★ ★ ★

**حەڤدەی کانون، بەیانیەکی خۆرەتاو،**

**زەماوەندێکی گەورەبوو**

**شایی سێ کوڕی ئێمە بوو**

**زاوا سیان بوون**

**بووك سیان نەبوون، سێ گوڵاڵەی شەرمن نەبوون**

**سێ ڕێواسی ڤاچ خەناویی کەلیخانی کوێستان نەبوون**

**ئەوان سێ زاوای جل سوور بوون**

**بووك سیان نەبوون، سێ کیژۆڵەی**

**سێ ناسکۆڵەی وەکوو هەرمێ کراس سپی**

**سێ وەنەوشەی سوخمە شینو**

**سێ ماکەوی خاڵدار نەبوون.**

**زاوا سیان بوون، بووك سیان نەبوون**

**بووك هەر هەموو کچەکانی سلێمانیو کوردستان بوون!**

**بووك هەر هەموو کەنیشکەکانی گەرمێنو**

**کیژی زۆزانو کوێستان بوون.**

**ئەوان سێ زاوای ئەسپ سوار**

**سێ زریان بوون**

**بەڵام یارو دەزگیرانی گوڵ بەدەستیان**

هەزاران خەجو شیرینو پەری خان بوون!.

ئەوان سێ شاخی زاوا بوون

بووك سیان نەبوون

ڕوبار.. بووك بوو

بەفر.. بووك بوو

باخچە ..بووك بوو

شیعر.. بووك بوو

لەو ڕۆژەدا ئەوان زاواو

كوردستانم تازە بووك بوو!.

⋆ ⋆ ⋆

مەپرسن چۆن؟ كە شیعر ئەبێ بە دڵدارو

"سلێمانی" بەجێ ژوان!

ئیتر منیش چاوەڕوانیم درەختێكەو

لەسەر شەقامو كۆڵانو بەرماڵانی ئەو شارەدا

ئاگر ئەگرێ!

مەپرسن چۆن؟! نەء.. مەپرسن

ئیستا لەناو "سەرچنار"ی ئەم دڵەدا

زەماوەندی شەهید گەرمە

ڕەشبەڵەكە، سێ پێییە، شێخانییە

ئەم ئاهەنگە

نە حەوت شەوە نە حەوت ڕۆژە

تا مایینی ئازادی بووك نەگاتە جێ

**مانگ بۆ زاوام دانەبەزێ**

**ئەم شاییە دوایی نییە!**

**زەماوەندی شەهید گەرمە**

**هەموو ڕۆژێ**

**هەموو شەوێ**

**شیعرێکم برا زاوایەو**

**تارا خوێنەو**

**دەسەسڕی سەرچۆپی کێش**

**کلّپەی سەرمە!.**

بەرگەڵو 1986/2/12

*لەحەڤدەی کانونی دووەمی 1985دا ـ ڕژێمی وەحشی عیراق ـ لەناو شاری سلێمانیداو بەبەرچاوی خەڵکەوە سێ لاوی کوردی گوللەباران کرد. ئەم قەسیدەیە بۆ ئەوان وتراوەو بۆ یەکەم جاریش لە ئیزگەی "دەنگی گەلی کوردستان"ەوە بەدەنگی خۆم پێشکەشی ئەو شەهیدانەم کردو خوێندمەوە.

## تەقینەوە

ئەوە، چرکە چرکی سەعاتی خوێنی چاڵمەی
کامە گوندی سەربڕراوە.. ئەگاتە گوێم؟!
ئەوە، زریکەی کام دارستانی بێوەژنەو
ڤیژەی کام کچە شەپۆلی ڕاونراوە
لەودیو چەپەری تەمەوە
ئەگەنە گوێم؟!
ئەوە هەنسکی کام کانیو پەلکە گیایە؟!
ئەوە گمە گمی کۆتری دڵی دایکە؟!
یان شەقە شەقی پەنجەرەی کام ئازاری
ڕوو لە بایە
یاخو نووزەی گوڵە گەنمێکی خاکە؟!
ئەگاتە گوێم؟!
بەم کازیوەی بەیانییە
هیچ پەڵەهەورێ مردووە؟!هەتامنیش زەردهەڵگەڕێم
هیچ باخێ جوانەمەرگ بووە ؟!هەتا منیش هەڵبوەرێم

هیچ شیعرێ گڕی گرتووە؟! هەتا منیش هەڵبقرچێم
بەم کازیوەی بەیانییە
کە خێروشەڕ
وەك دوو ئەسپی ڕەش‌و سپی
هێشتا لە مێخی تاریکیی نەکراونەوە،
بەرنەدراون
کێیە ئەگری؟!
بە شمشاڵی کام برینە
ئەم درەختە قژنانە وەکوو دەروێش
ئازاری گیان ڕا ئەژەنن؟!
لە کەناری فرمێسکاویی کام ئاسۆوە
خەم هەڵئەفڕێ؟!
لە شەقامی چۆڵ‌و هۆڵی کام شارەوە؟!
لەپەنجەرەی ڕەنگ پەمەیی کام ماڵەوە؟!
شەهید ئەبێ بە ڕەشەباو
دەنگ هەڵئەبڕێ؟!
بەم کازیوەی بەیانییە
نینۆك‌و چنگی کام بازە
وەکوو ئەڵماس شووشەی بەژنم ئەبڕێتەوە؟
تووترکی کام دەنگ‌و باسە
ڕوومەتی خەوی نارنجیم ئەڕوشێنێ؟
بەم کازیوەی بەیانییە

کام هەواڵی دارەوانە
چۆتە سەرلقی گێلاسی لەشی سوورمو
دەنك.. دەنك، ئەموەرێنیٚ؟

* * *

ئاسمان وتی:
ئەوە زەوییە وا ئەزیٚ.
زەمین وتی:
ئەوە شاخە ئەڵێیماینی ئاوسەو
ژان بە جوانووی شۆڕشەوە ئەگریٚ.
شۆڕش وتی:
ئەوە خاکە ئەحیلێنیٚ.
ئەوە ئاوە ئەڤیژێنیٚ.
ئەوە شەقامە وەك دەستم ئەبزوێتو
وەکوو سەرم ئەگرمێنیٚ.
ئەوە خەمە نەوتاویەکەی ناو کەرکووکە
بۆتە شاپڵێتەی پێشمەرگەو
ـ شارە ڕقی ـ تیپەکانم ئەوروژێنیٚ.
شاخەو ئەزیٚو بێشەی ئەبیٚ.
خوێنەو ئەزیٚو مێژووی ئەبیٚ.
هەموو ساڵیٚ لەم وەرزەدا
لەم کازیوەی بەیانەدا
بوومەلەرزەی بابەگوڕگوڕ

كوڕی وەکوو "مامە ڕیشە"و "دارا"ی ئەبێ

هەموو ساڵێ لەم وەرزەدا

لەم کازیوەی بەیانەدا..

ـ ڕەحیم ئاواو ئیمام قاسم ـ

=دوو زاوای کەواو سەڵتە لەبەری ڕەشتاڵەن‌و

جرید بازی‌و ئەڵڵاوەیسی‌و قەتاریانەو

بەدەم قریوەی خوێنەوە

بووکیان ئەوێ!

* * *

هاتم بۆلات جۆگەیەك بووم شوێنت کەوتم

لامداو خۆمدا بەدەم ڕوبارتەوە

ڕووبار کردمیە قەڵبەزەو

قەڵبەزە کردمیە تاڤگەو

لە چاوتەوە ڕژامە ناو هەناوتەوە

لەوساکەوە بەژنی شیعرم

بەقەد تاڤگەکەی "بێ خاڵ" کەڵەگەتە.

لەو ساکەوە کە برِبڕەی پشتی شیعرم

بووە بە شاخ

قەڵەمم بۆتە پێشمەرگە

من‌و چیای ئاسنگەران

ئاسنین‌و دەسمان چەك‌و

چەکمان دەسە.

* * *

هاتم بۆلات وەك پاساری، وەكوو نالیی
عاشقێكی ڕووتەڵە بووم
تەنیا بوومو تەنیا نەبووم
ئەوەی پێم بوو.. ئەوەی هێنام
هەندێ گۆرانیی سەر شانۆی دەم بەستراوو
هەندێ گوڵدانی ناو هۆڵی بێ هەتاوو
هەندێ شیعری بۆینباخی ڕەش لەملو
شەقامی عەینەك لەچاو بوو.
لەو ڕۆژەوە گەیشتمە لات
شیعرم وەكوو شاخی باڵات
وەك چاوی چەكی سەر لوتكە
بەرز ئەڕوانێ
گۆرانیم شاهۆی كۆسارتەو
پڕ بە گەرووی دەربەند، گەلییت
شەقژنێتیو ئەچریكێنێ
نەك گوڵدانێ
هەرچی دەشتتە
هەرچی هەردتە
هەرچی دۆڵتە.. گوڵدانمن
چاوی تیژی هەڵۆكانت
ئیستە چاومن.
لەو ڕۆژەوە گەیشتمە لات

گوڵە مێلاقەیە شیعر و

گزنگی دەمەو بەیانییش

وێنەکێشێکی قژ زەردەو

بە فڵچەی خۆر

سەر سنگی ئەسپم سوور ئەکات.

★ ★ ★

عاشقێکی ڕوتەڵە بووم تەنیا بووم‌و تەنیا نەبووم

ئەرخەوانم.. بەڕێگاوەم

کتێبخانەم.. بە ڕێگاوەم

بە ڕێگاوەم وەکوو گوڵجاڕی سەرترۆپك، تەوێڵم سوور.

لە ئەشکەنجەدا پشکووتووم

لای بوتڵ‌و پانکەو کێبڵ‌و

ئوتوی کارەباوە هاتووم!.

پەڵە پەڵەی

لەشی شین‌و لەشی مۆری ڕەنگ کراوم

جاجمی ماڵە ڕەوەندە

نیگاری گوڵی سێ گۆشەو..

نیگاری گوڵی چوار گۆشەی

بەڕە کۆنی ماڵە کوردە

من ئیستاکە:

بەم برینە شینانەوە

بەم برینە مۆرانەوە

لە دار شاتووی تەکێنراوی لاڕێ ئەچم.

بەڕێگاوەم: دارستانی شیرو شمشێر

دەشتی دەرزی، گردی پشکۆ، گۆمی ئاگر

ئیستگەکانی ڕێو بانم بوون..

من چیم هەبوو

چیم پێ نەبوو

بەتەنها هەر

خۆشەویستیت توێشوی پشتو

خۆشەویستیت گورزی دەستو

خۆشەویستیت بۆ تەنگانەی.. هەڵکڕوزاو،

تاڵە مۆکەی گیرفانم بوو.

کاڵەو پێتاو: چەرمی ڕقی جیڕو تووڕەی

هەنگاوم بوو.

بەرە ژان.. منداڵ ئەهێنێ.

هەوری تاڵ.. باران ئەهێنێ.

ڕێی نەهاتیش، هات ئەهێنێ.

بە ڕێگاوەم ڕێگەی نەهات ڕێی گەردەلوول

ڕێی باوبۆران ڕێی دڵدارە..

بەڕێگاوەم یاڵی ئەسپی خوێن تێوەچووم

ناونیشانمەو بریقەی دێ

ناونیشانمەو ئەشنێتەوەو

بەڕێوەمو گەرمەی غارە.

* * *

هاتم بۆلات عەشق سەری کۆچ کردنی پێ هەلگرتم

هەروەکوو چۆن عەشقی گەرمیانو کوێستان

سەر بە باڵندە هەڵ ئەگرن.

لێژایی خاك.. بە شەپۆلو

غار بە ئەسپو

"با" بەهەورو

نان بە برسیو

گولاو بە هەنگ

سەری شەیدا بوون هەڵ ئەگرن.

هاتم بۆ لات عەشق سەری کۆچکردنی پێ هەلگرتم

دوو ڕیانی مەرگو ژین بوو

هاتمو قەلای مێردانی شەوێکی تووش

کرێوەی مەرگی سپی بوو

تۆفی وەرزی پێنجەمین بوو

بارێزەی کێویی ئەوین بوو

بەرد کەوتبوە دانە چۆقەو

کێو پەنجەی پێو

با دەستەکانی تەزیبوو.

تۆفی وەرزی سەربەستی بوو.

خاك دایك بوو بەکۆڵەوژی سوتماکی دەستەکانی، پرچی سپی ئەڕنیەوە،

شارو شارۆچکەو دێهاتم وەك

ئاوێنەی گەورەو بچووك

لەدڵما وردوخاش ئەكران.

پیرەدارو نەونەمام بوون لەڕەگەوە

بە ڕیشاڵی ناو خوێنمەوە هەڵئەكێشران.

كۆڵانو شەقام مار بوونو

لە گەردنمەوە ئەئاڵان. قەف قەف قەف قەف

تێم ئەئاڵان. بە پشتێنەكەی پشتی خۆم لەقاچەوە لەباسكەوە لەملەوە

شیعرەكانم هەڵئەواسران. بەغدای مشار.

بەغدای تەوری "أبوطبرة"

ڕۆژێ نەبوو. شەوێ نەبوو. ساتێ نەبوو. دارچناری وشەیەكم

پەراسویەكی زمانم

نێرگەیەكی كۆنە مێژووم. تازە مێژووم.

كرِكرِ كرِكرِ.. نەبڕێتەوە

"بەدرەو جەسان" دوو ئاسكی چاو خەواڵووی مێرگەكانی پێ دەشتم بوون.

چییان لێهات؟!

بۆ كام ژەمی میوانێكی شازادەبوو؟!

بۆ قاوەڵتی كام جەنەراڵ؟ كام پاشا بوو؟

سەربڕرانو كەوڵ كران؟

"كفری"م كۆتری پەڕ لەپێی باوە شاسوار،

بووبە پارووی نەرمە قووتی واشەی بەغدا.

شەنگار، خانەقین، شێخانم،

هەناری مزرو مێخۆش بوون،

لیمۆی ترشولالەنگی بوون.

مەمكی پڕتەقاڵی شەم بوون.

یەك لەدوای یەك بۆ شەربەتی بەردەم سوڵتان،

هەتا تلۆپەی خوێنی منو ساوای منو خاكیان تیابوو

گوشران. گوشران. گوشران

هاتم بۆلات. هاتو نەهات دووڕیان بوو

هاتمو قەڵای مێردانی شەوێكی تووش

ڕێی نەهاتی كوڕی زریانو بەفرم بوو

تۆیش پەری خانی گیرخواردوی

قوللەی قافو وڵاتی دێوو درنج بووی

ڕەنگت نەبوو.. من هەر زریكەم ئەبیستی

دەڵەدێوی گردی ڕەشم بۆ ئەكوشتی

بەسەر ئاوی شینو زەردو سوورو مۆردا

یەك لە دوای یەك

ئەڕۆشتمو پردی عەشقم بۆ ئەبەستی.

⋆ ⋆ ⋆

هاتم بۆلات لەیەك وەختا وەرزی ڕاپەڕینی خاكو

جمانو هەڵسانی شیعرو تەقینەوەی كانیاوو

شۆڕشی بەفرو باران بوو

لەیەك كاتدا وەرزی تووڕەبوونی كێڵگەو

هەڵپڕژانەوەی قەڵەمو گێژەڵووكەی خوێنی جادەو

پەنگ خواردنەوەی ئازیزان بوو.

لەیەك دەمدا پێكدادانی زامو چەقۆو

قوربانیی‌و پەت‌و سێدارەو بەندیخانەو تیشکی خۆربوو
دوو دوو وەرزی زۆرانبازیی
نێوان مەزدەو ئەهرەمەن بوو!
ڕەش‌و سپی
تاریك‌و ڕوون
پێشمەرگەو جاش
شیعری مەردو شیعری نامەرد، جنگ نانە جنگ، پێکدادان بوو
بۆ شیعری مەرد.. وەکوو ئیستەو وەکوو دوێنێ
کێرد لەسەر مل پاسەوان بوو.
سوڵتانی کۆشك دەست بەشمشێری زێڕین بوو
لە کەژاوەی ئاوریشمیندا
لەناو هۆڵی ئاوێنە بەندی نگیندا
شیعری خەساوی لێو کوتراو.. دەوریان ئەگرت
جادووگەر بوون سیحرباز بوون لەبەر دەمیا
ئاردی شیعریان ئەکرد بە کۆتری تەقلەباز
کۆتریان ئەکرد بە کەروێشك‌و
کەروێشکیان بۆ ئەکرد بە باز.
لە پایتەختی شیعری قووتوی بەعسیاندا
مەگەر دەگمەن تاك‌و تەرا
کام شاعیر ما.. ئەتکی دیوانی خۆی نەکا!
کام شاعیر ما.. کچی شیعری مەربەدی خۆی
لەیەکانەی ئەم ڕژێمە مارە نەکا!

**کام شاعیر ما.. لەتەنەکەی ئەو شیعرانە**
**قەعدەیەك بۆ منداڵو نەوەی سوڵتان**
**دروست نەکا!.**
**ئەی خەزاڵی وشەی سپی.. وشەی ڕووسور!**
**دووڕیان بوو.. دووڕیانی هەڵگیرسانو کوژانەوە**
**هاتم بۆلات..**
**ئەی خەزاڵی شیعری سەرلق نەچەماوە**
**ئەی شیعری تۆڕ!**
**ئەوە منم ئەوە "لاس"ی دێوانەتە**
**تەماشام کە**
**لەڕەشەبای ئەو ڕۆژەدا**
**نەك هەر دەستم بە کڵاوی قەڵەممەوە نەگرت**
**نەك هەر دەنگم قوماتەی ناو ژووری ترسی**
**چەند شیعرێکی دوودڵ نەکرد..**
**نەك هەر نەبووم بە شاعیرێ**
**وەك سمۆرەی کلۆرەدار.. سمێڵ لەرزیوو.**
**بچمە کونو سڵ کەمەوە لە سێبەرو**
**لەترپەی پێو کۆکەی ڕێبوار.**
**نەك هەر نەبووم**
**بە ستوونی سەر جادەیەك.**
**یان بە سنووقی پۆستەیەك.**
**یان بە کورسی چایخانەیەك.**

نەء! درِم دا بە زەمانی قەمەو سونگی
هاتمو یەخەی رِەشەبای شەوگاری تووشم بۆ گرتی
هاتمو گوللەی گرِداربوو وشەی یاخیم..
چراخانی ناو کەشکۆڵی
شیعری سوورم بۆ هەڵکردی.
وەکوو شەپقەی یاسای درۆی ئەم رِژێمە
وەك بێرییەی ئەم رِژێمە
وەك بارۆکەی سەرە کەچەڵو گەرِەکەی
ئۆتۆنۆمی ئەم رِژێمە
قەڵەم کڵاوی هەر توورِدا..
دەنگم بەردا. دەنگ هاژە بوو. دەنگ گڤە بوو
دەنگدانەوەم بوو بە دەنگی
سەر شەقامو
ناو بازارِو
ناو ئەشکەوتو
گەوەی چیا.

* * *

ئیستە وەرزی زەنگ لێدانی شیعری مەردە.
وەختی خرۆشانی پوورە گوللەو
پوورە وشەی شار و هەردە.
ئیستە سەردەمی جۆشدانی کوورەی خوێنو گوانووی لەشە.
وەرزی گۆپاڵە بارانە. وەرزی رِووبەرِوو بوونەوەی

چاوی ئێمەو چاوی گەشی شەهیدانە.

وەرزی نارنجۆکی شیعرو

تەقینەوەی دینامێتی حەرفی فەرهەنگو زمانە.

ئەی خەزاڵی کراسو کەوا خوێناویی

قژ هەڵکەنراو!

لەم زەمانە بێ عارەدا

لەم زەمانە بێ بنەدا

لەسەردەمی ئەم تەتەرو ئەم بەربەرو فیرعەونەدا..

لەسەردەمی سەربڕینی

نانو گوڵو کانیو ساوای

کوردستانی سەر صەلیبو قەنارەدا

لەم وەیشوومەی جیهانەدا..

ئەگەر شیعر وەك ڕەشەبای سلێمانی تیژ هەڵنەکا.. شیعر نییە.

شیعر نەبێ بە "دابان"و بە "زینانە" .. شیعر نییە.

شیعر نەبێ بە ئار.بی.جیو بەمەفرەزەی حەرفو وشەو

نەچێتە سەر مۆڵگەکانی جاش قەڵەمو

سەر ڕەبایەی شیعری سوڵتان.. شیعر نییە.

ئەم وڵاتی خۆڵەمێشە

ئەم نیشتمانی ئازارە

"مامەڕیشە"ی شیعری ئەوێ

نەجۆی چیرۆكو سوڵتانی شانۆ نامەو

"کابان"ی گۆرانیی ئەوێ.

شاراو خەرمانی زمانم وا گڕ ئەیخوا
شیعری بەر مانگە شەو چێکا؟!
خانزادی دایك
خانزادی یار
خەجی لادێ
شیرینی شار
لەسەردابی قادسیەیەی ئەم شەوەدا
بون بە دۆشەکی ئیسفەنجی ژێر قەعقاعو
پەشتەماڵو خاولی حەمام
پاڵەوانی چیرۆك چێکا؟!
شانۆ سووتا ئەکتەر چێکا؟! جووڵە کوژرا
دەرهێنەری شانۆ چێکا؟!
دوو ڕیانەو نابێ بە سێ
کە ئاویان کوشت ماسی شیعر بۆ کوێ ئەچێ؟!
کە دارستان ئاگری گرت.. داری بێ لایەن کامەیە
تا نەسووتێ؟!
دووڕیانەو نابێ بە سێ..
وەکوو پێشمەرگە ئیستاکە وەختی شەهید بوونی شیعرە
بۆچی باڵای کامە شیعر؟!
بۆچی نیگای کامە شیعر؟!
لە باڵای ئەو شەهیدانە
سەوزترو بەرزترو یان جوانترە؟!

**وەکوو خائین ئیستە وەختی کوشتنی شیعری خائینە.**
**بە ڕێگاوەم، ئیستە هەڕەتی جۆشدانی خاكو خۆڵە**
**خوێن ڕابەرە**
**بوومەلەرزەی بەرەژانی قەندیلێکی تازە ترە**
**بەڕێگاوەم، شیعر لێرە بۆتە چیاو**
**ئیستاکە ناوی "کۆڕەنگە"و**
**وشە بە وشەم سەنگەرە**
**ئەی خەزاڵی وشەی ڕوو سوور**
**گەر شیعر بۆتۆ نەسوتێ**
**بۆچی شیعرە؟!**

1986/7/23

*یەکەمین دەقی تەواوی ئەم قەسیدەیە لە هاوینی 1986 دا لە ڕادیۆی "دەنگی گەلی کوردستان"ەوە خوێندرایەوە ,دواتر لەکاتی چاوپێداگێڕانەوەدا هەندێ کۆپلەی کەوتەوە بەر مۆنتاج کردنەوەی هونەریی و بەو شێوەیە ئیستە لەچاپ دراوە.

## سەفەری ئەوینو شۆڕش

کاتێ ڕۆیشتم، چاوی ـ کانون ـ
هێواش.. هێواش
شەقامی هەینیی ڕۆژێکی خۆی تەڕ ئەکرد.
ڕۆژیش پاڵتۆی سامێکی گەورەو ئەستووری
لەبەر بەیانیی خۆی ئەکرد.
شپرزەییم.. وەك بنسکە سابوونێکی
لووس وەهابوو
لەناو لەپی دەستی عومرا دەرئەپەڕیو
خۆی نەئەگرت.
ترسێکی سارد
وەك ئەو ڕۆژە
لەهەناوما هەڵئەلەرزی.
ترس گەرمی نەبۆوە تا،
لەدواییدا
بە ئەوینت دامنەپۆشی!.

٭ ٭ ٭

که من ڕۆیشتم، ئاسمان پرووشەی خەمێکی

تازەی ئەکرد.

وەکوو گەڕەك

وەکوو ماڵم.. وەکوو ژوورم

"با"یش بێدەنگ بوو.

وەکوو دەستم لە گیرفانما

چۆلەکەی دڵت نوستبوو.

خەوی خۆڵەمیشیی تاریكو ڕوون

لە ڕوخساری ئاگردانی ساردەوە بووی

تۆ نیشتبوو.

که من ڕۆیشتم.

⋆ ⋆ ⋆

ئەبێ بڕۆم

ڕێگەی سەفەرم درێژە..

درێژ بەقەد خەمی کوردستانو کەزیی ڕەشتو

هەموو پرچی عاشقانی ئەم دنیایە.

درێژ بەقەدەر خەیاڵی نامۆکانو بێ کارانی ئەم دنیایە.

ئەبێ بڕۆمو پێت نەڵێم ماڵ ئاوابێ.

ئەمە سەفەری عەشقێکە تەواو نابێ

ئەمە سەفەری ئەوینو کۆچی باڵندەی شۆڕشە

ئەم سەفەرە:

شەمەندەفەری برینەو

هەزاران ئیستگەی سواربوونو دابەزینی لە ڕێدایەو

جانتای نییە!

دەمێ تەرزەو دەمێ پشکۆو دەمێ زریان

لەسەر لەشی هەڵئەدەنو جلی نییە!

ئەبێ بڕۆمو پێت نەڵێم ماڵ ئاوابێ!

زەمانی لێك دابڕینی:

پەنجەو دەستو

چاوو برۆو

دەمو لێوە، زەمانی لێك دابڕینی ئازیزانە!

تۆیش وەکوو شیعرم ئازیز بووی

تۆ شیعرمو شیعریش تۆ بووی

هەردووکتانم بەجێ هێشتو پێم نەوتن بۆ کوێ ئەچم!

تۆم لە ناو خەوی پەمەیی ئەو ڕۆژەتا

بەجێ هێشتو

شیعریش لەناو تاقی برینێکی شارا.

لێم ببوورن

ئەفسوسو ئاخ

لێم ببوورن.

گومان کرمی ئەم سەردەمە کرمێیەیە.

گومان مەکۆی تەونی سەری، قەت نەسرەوتی

ئەم ڕۆژگارو سەدەیەیە

لێم ببوورن.

ئەفسوس‌و ئاخ..

شیعرمان دی وشەو حەرفی خۆی لە کونی زیندان توندکرد.

شیعرمان دی دەمامکی هەڵئەبەست‌و پێش چەقۆی،

سانسۆر ئەکەوت‌و ژمارەی خانووی ڕستەی خۆی

بۆ نەیاران دیاریی ئەکرد!

لێم ببوورن.. ئەفسوس‌و ئاخ!

ئازیزمان دی خۆی لەناو دڵی ئازیزدا حەشار دابوو

کەچی ئەویان دڵی بردوو ختییە ناو مشتی چەقۆوە

ئەفسوس‌و ئاخ!.

* * *

وتم: عەشق هەڵگیرسانی بەژنی بەرزی

لەکۆچێکی درێژدایە.

سۆمای چاوی خۆشەویستیی

لەوڵاتی تاروماری ڕێگەدایە.

فڕینی گیانی فریشتەیش

لەشەقەی باڵی سۆزدایە.

وتم نابم بە زەریا گەر

شەپۆل نەکەم بە سەرینم.

نابم بە شاخ ئەگەر بنار

قاچم نەبێ

نابم بە باخ گەر باڵندە

ئاشنام نەبێ

نابم بە وڵاتی ئەوین

گەر پایتەختم..

ئازارێکی ئاوەدانو گەورە نەبێ

بۆیە ڕۆیشتم!.

* * *

هەرچەند شێوەی دوورە یادت

ناوبەناوێ

پەناهێندەی ساتە وەختی

هەرێمی خەوی زڕاومە.

بەڵام ئیستە نەڕەنگی تۆو نەڕەنگی خاك

لەیەکتر جوێ ناکەمەوە

شێوە تێکەڵ

دەنگتان تێکەڵ

وەکوو ئاوی دووئاوانێ.

هەرچەند چاوی دوورە یادت

ناوبەناوێ پەناهێندەی ئاوێنەی خەونی نێو چاومە

بەڵام ئیستە نە چاوی تۆو

نە گوڵێکی چیای ژوورسەر

نە باڵای تۆو نە درەختێ

نە بزەی تۆو نە گزنگێ

لەیەکتر جوێ ناکەمەوە.

بۆنتان تێکەڵ

خوێنتان تێکەڵ

من نازانم تۆ لە خاکدا توایتەوە

یان خاك لە تۆدا توایەوە؟!

من نازانم؟!

دوورکەوتمەوەو نزیکیشم

وەکوو هەوری سەرکێوانو خەونەکانی منداڵیمان

دوورکەوتمەوەو نزیکیشم

وەکوو خوێنی کۆنو تازەی شەهیدانمان

ئیستە لەناو تەنووری زامو سەفەردام

کەشتیەکم لە گێژەنی مێژوودا ئەخولێمەوە

سەوڵم بازووی هەتاوێکە

قەت شل نابیٚو

بە دەوری چاوی تۆو چاوی

ئەم خاکەدا ئەخولێمەوە..

بچمە هەرکوێ هەر نیشتەجێی خۆشەویستیی

سەوزی ئێوەم

بچمە هەرکوێ هەر باڵندەی هێلانەکەی

عەشقی ئێوەم.

چارەنووسی ئەم سەفەرەم

چارەنووسی سنەوبەرو شیعرتانە

چارەنووسی ئەم کەشتیەم

چارەنووسی بەندەرتانە.

گەرهاتمەوە خەونی شەهیدو منداڵی ئەهێنمەوە

گەر هاتمەوە خاك دێتەوە، یار دێتەوە،

گوڵ دێتەوە.

ئەوسایش ئەم سەفەرە ئەبێ

بە بەیتی عیشقی ئازادیی كوردستانو

بست بەبستی

ئەم جیهانە گشت ئەگەڕێ.

بەرگەڵو 1986/7/7

# سۆراخ

به دارستانێکدا ڕەت بووم
سنەوبەرێ هاتە سەر ڕێم
هەواڵی هەوری لێ پرسیم
وتم بەڕێوەیە بۆلات
سەعات نابێ لای لووتکە دیم.
زۆر نەڕۆیشتم
چڵە گوێزێ یەخەی گرتم
وتی نازانی کزە با بۆ کوێ چووە؟!
دوو ڕۆژێکە من نەمدیوە..
وتم لای بەفر نووستووە
خۆم لەوێ دیم.
چەند هەنگاوێکیترم نا
دار زەیتونێکی ڕەشتاڵە
دەستەکانی بۆ هەڵبڕیم
وتی: تکایە بوەستە!

قومریەکی گەردن شینی چریکە خۆشت نەدیوە؟!
وتم: ها.. ها لەو قەدپاڵە
چۆتە دڵی شوانێکەوە
هێندەش نابێ کە کردوێتی بە هێلانە.
کە لەو ڕەت بووم
شۆڕەبییەك پەرچەمی سەرچاوی لاداو
وتی ماسیە پانکەیەکی کراس پوولەکە لەبەری
کەمێ جرپنت نەدیوە؟!
وتم.. ئا.. ئا.. ناسیمەوە
ئالەو باخچەیەی سەرەوە
لەبەلەمی گەڵا هەنجیرێکی پاندا
من خۆم دیمن
دەمی خستبووە ناو دەمی
ماسیە سوورەی ئەو گۆمەوە.
لەو تێپەڕیم
دارگێلاسێ هاتە سەر چەقی ڕێگەم و
وتی ئەرێ تاق تافکەرەی عاشق
ئیستە گیرۆدەی کام عەشقەو
لەکام گەڕەکی ئەوین و
لەکام لایە؟!
چرپەیەکم بە گوێدا کرد
دەستێکم کرد بە گیرفانی بەر باخەڵما

تازەترین ناونیشانی ئەوم دایە.
کە دارستانم بەجێهێشت دوورکەوتمەوە
تەورێکم دی بەڕاکردن قاچ قوڕاویی،
هەناسە سوار , بەرەو ڕووم هات
کە منی دی وەستاو وتی:
چەند درەختێکی یاخی بووم لێ وون بووە
زۆر گەڕاوم
ئەم باخ ئەو باخ
ئەم ماڵ ئەو ماڵ
تۆ نەتدیون؟!
هەر ئەوساتە بڕیارم دا
ببم بە کوێر
ببم بە کەڕ
ببم بە لاڵ!

# ئاگر

زستان لە گیانەڵادا بوو

لەدوا پێخەفی ئێوارەی، ناو فوراتا ڕاکشابوو.

کە تاریك بوو، لەبەر دەرگای ماڵەوەدا

"میرۆ" ئاگرێکی کردەوە

بیست سی پۆستاڵ

چوونە سەریو

دووکەڵێکیان بۆ هێشتنەوە!.

میرۆ هەستاو ئاگری بردە ناو حەوشەوە

دووسێ بۆری مل هوڕ مل هوڕ

دەمیان بەردایە سەر حەوشەو

ئاگرەکەیان کوژاندەوە.

میرۆ ئاگری بردە سەربان

لەخوارەوە

سەد خاکەناز قۆڵیان هەڵکرد

خۆڵیان هەڵدایە سەرەوەو

ئاگرەکەیان کوژاندەوە.

میرۆ ئاگری بردە ژووری، کونی ژووری

سەد پاچ زیاتر

یەس، یەم، یەس، یەم!

دەوری گەڕەك و ماڵیان گرت

میرۆی ماسی بە تۆڕ گیراو

بە قژ کێشیان کردە دەری

یەس، یەم، یەس، یەم

سەد پاچ زیاتر بۆ سەرەوە

ژووریان ڕووخان

ماڵیان ڕووخان

ئاگرەکەیان کوژاندەوە.

سێ زستانی تر مردن و میرۆ مابوو

زیندان گڕی عەشقی میرۆی

پێ کپ و خەفە نەکرابوو.

ئەمجارەیان میرۆ ئاگری

بردە خوێنی

شاروشارۆچکەو گوندەوە

ئاگری بردە ژووری دڵی

زۆر خەج و سیامەندەوە.

لەبەردەمی ئەژدەهاکدا

دڵی میرۆیان دەرهێنا!

بەڵام ئاگر ئەم کەڕەتە وا کەوتەوە:
پۆستاڵ سووتاو
ئاو ئەسووتاو
خۆڵ ئەسووتاو
پاچ ئەسووتا
ئەو هەر ڕێگەی لەبەردەمی
چەکوشێکی زۆر گەورەدا، ئەکردەوە!

ستۆکهۆڵم 1988/2/15

# دەرگا داخراوەکان

عومرێکی دوورو درێژە
درێژ.. درێژ هێندەی پرچی
سپی داپیرەگەی مێژووم.
هێندەی کۆڵانانی تەنگی
خەمی شارۆچکەو نێو شارم.
کە بیدەیتە دەم یەکتری.
عومرێکی درێژ.. درێژ
لێرەو لەویّ
لەم لاو.. لەولا
من سکاڵای ڕاستیی بوومو
من مەزبەتەی سزاو هاوار
عومرێکی درێژ.. درێژ
زامەکانم بە شەلەشەل
ڕازەکانم بە پێی پەتیو سەری قۆتی
تەمتەمەنو ئەخولێنەوە.

ئەم کۆشك ئەو کۆشك، قاپیو قاپی

بە خواجە بێداری مشتم

یەك بەیەك ئەقلێشێننەوە!

لەم لاو.. لەو لا

من لەوەختو لە ناوەختا

لە دەروازەی ئەم جیهانە هەموویم دا

لە دەرگای سوور

لە دەرگای سەوز

دەرگای سپی

لە پەنجەرەی کۆنگرەی شین

کۆنگرەی مۆر..

ڕەنگدار، بێ ڕەنگ، هەموویم دا

بەلاشیپانی ئەوەوە

بە شووشەی چاوی ئەمەوە

هەزار جار لەپی خوێناویی

قیژەو زریکەی خۆم پیانان

لەشەقامی سیڤەرەوە پیاچومەوە

تا مەزاتخانەی خوێنەکەم لە لۆزان دا

پیاچوومەوە

بەڕیز لێم دان

لە چەپەوە، لە ڕاستەوە

لە دەرگای ناوەڕاستەوە

پیاچوومەوە

بەڕیز لێم دان!

بە هەردوو دەستی بڕاوی

دیجلەو فوراتەکەم لێم دان!

بە هەردووقاچی بڕاوی

کرمانجێکی ژوورو لێم دان

بە کەللەی سەری بڕاوی

کرمانجێکی خوارو لێم دان

لێم دان.. لێم دان!

برینێکی دارەوان بووم

برینێکی شاخەوان بووم

بە دیواری گوێزانیاندا هەڵ ئەزنام

لەسەر دیوارەوە بەمشت.. بە هەردوو مشت

هەر بیلبیلەو هەر گلێنەی هەڵکۆڵراوی

شارو گوند بوو.. بۆم هەڵڕشتن.

وەك دروشمێ لەسەر سەرم

پێستی سووتاوی کون کونی

کێڵگەو منداڵانو گوڵی

ئەم وڵاتە هەڵقرچاوەم بۆ هەڵکردن.

ڤیژەم ڕووا

بوو بە دارستانی ئازار.

خوێنم بەستی، بوو بە زرێباری دنیا

بەردی لاڕێ..

کەوتە قسەو هاتە سەر ڕێو

هەنگاوی نا!

ئینجا درەخت لەسەر قاچێ، هەنگە شەلێ

ڕای ئەکردوو بەسەر خوێنا بازی ئەدا

وردە.. وردە

بۆکرووزم گەییە لووتی

مانگی دەسکردوو کەپووی خوا

کەچی ئەوسایش

درزێ نەکەوتە دەروازەو

درزێ نەکەوتە پەنجەرەو

لەو سەرەوە، لەم سەرەوە

لەم باڵقۆنو لەو تارمەو نهۆمەوە

نە قژنێ، نە سەر ڕووتاوەو ورگنێ

بەلا چاوێ

بۆ تەماشایەك.. ئاوڕێ..

سەرێکیان خوارنەکردەوە

ملێکیان لار نەکردەوە..

ئای لەم دنیا سۆزانییە!

بەلای ئێسکی گڕ گرتومدا چەند تێپەڕیو

بە تەنافی قەنارەمدا دەرپێکەی خۆیشی هەڵنەخست!

ئای لەم دنیا سۆزانییە

تا کۆمەڵەی دۆستی ئاژەڵ.. مافی حەیوان

تا ئەوانیش لە کۆنگرەو لەسەر لیستەی

حەپە حەپو مڕەمڕوو زیکەزیکی ناو خۆیاندا..

هەقی سەگو هەقی مشكو

هەقی پشیلەو ئاژەڵی.. کوردستانیان

ناونووس نەکرد..

تا ئەوانیش باسیان نەکرد!!.

# ڕاهاتن

ملم وتی:

زۆر دوور نییە، هەر پێرێ بوو

لەگەڵ پەتی سێدارەدا ڕاهاتم‌و

تا وام لێهات

بەر لەوەی ئەو شۆڕبێتەوە

من لە پێشدا ڕام ئەکێشاو یەخەم ئەگرت

من لە پێشدا خۆم هەڵئەداو

ئەچوومە ناو ئەڵقەیەوە.

تا وای لێهات

ڕۆژ لەدوای ڕۆژ

ژووری ئیعدام هەر وەکوو گورگێکی دڕ

دەستەمۆ کرد.

تا وای لێهات

وەك وەردییان

پەت بێزار بوو.

وەك پۆلیسی دوای نیوەشەو

پەت شەكەت بوو.

تا وای لێهات، بەرە، بەرە

ئەو لە پێش مندا ئەنووستو

شەو درەنگان

من ئەچوومە سەر دارەكەی

هەڵم ئەسان، ئەم وت: وەرە!.

زۆر دوور نییە، هەر پێرێ بوو

لە پێشدا ئازار كێردێكی

زۆر دەم تیژ بوو

لەبەر دەستیا كەروێشك بووم‌و ئەمزریكان!.

لە دواییشدا وردە وردە

بە خوێنی خۆم كولم كردوو

ئینجا من خستمە باوێشك دان!.

بۆ ناونیشان:

ئەوە هەموو ژێر زەمین‌و قاوشێكی "ئەبوغرێب"

ئەوە هەموو سەردابێكی توونی بابای

بەغدای تاوان.

لەوەیش زیاتر

ئەوە "موسڵ"و گردێ ورەی كەڵ ملەكان!.

زەویم وتی:

زۆر نزیكە هەر دوێنێ بوو

لەگەڵ ناڵەو گرمەی ڕەشی

ناپاڵم دا ڕاهاتمەو

وەکوو نەهەنگی برسێتیی

وەکوو بیرونی تینویەتی

سامی ئەو دێوەیشم شکان!.

ئەویش منم:

ئەوە.. دەنگم.

ئەوە.. ڕەنگم.

ئەوە.. باڵای دەنگو باسم.

ئەوە.. گوێچکەی سووکی شاخم.

تەماشام کە:

نە گوێی دارستانم کەڕ بوو.

نە ڕووبارم زراوی چوو.

نە سەنگەرم لەرز گرتی.

لەدواییشدا

لاشەی بۆمبا

بۆ منداڵانی زۆر گوندی بێ خەندەی من

بوون بە ئەسپی گەمەو یاریی.

مێژوم ئەڵێ:

بۆ ئەمرۆکەیش

لەگەڵ ئەم ژەهرەدا ڕادێم

ڕادێم.. ڕادێم

**وەکوو ئاسمانو وەك چیا**

**هەوا.. منم**

**ئەو لە مندا ئەتوێتەوەو**

**چەند پێچ بخواتو سەرکەوێ**

**چنگی ناگاتە گەردنم.**

**کە گوڵێکم هەڵئەوەرێ.**

**گوڵێکی ترم ئەپشکوێ.**

**ژێیەکی دەنگم ئەپچڕێ**

**ژێیەکی تر ئەبەستمەوە.**

**وەکوو پێرێو دوێنێو ئیستە**

**گفتێکەو داومە بە گوڵو بە منداڵو**

**بەو بەفری خۆشەویستی یە**

**ئەوەی لەگەڵیا ڕانەیەم**

**ڕام نەهێنێو قەت ڕانەیەم**

**هەر یەك شتە:**

**ئەویش تەنها ژێردەستییە!.**

1977

## سلاو گوڵە کێویلەکانی شۆڕش سلاو!

وا ئەمساڵیش بە فەرەنجیو پەستەکەوە، ملپێچ لەمل
گاڵۆك بەدەس، لە زەردومای شاخانەوە
پیرە زستان
دەراڵ، دەراڵ، گەوە، گەوە
دائەگەڕێو دێ بۆ لاتان.
لە ئیستەوە بە هەڵلەرزینی ڕووبار
پەنجەی گۆنەکردووی داروو
کۆکە کۆکی "با"دا دیارە
ئەمساڵ بەفر وای تەمایە
ئەو کەوتنەی لێی کەوت ئیتر،
ئەو شانەی دایدایە سەرتان
تا نەورۆز هەڵێنەسێنێ
بەری نەدا بەر پەنجەرەی کورتە بالآی ژوورەکانتان.

* * *

سێبەرتانمو لە لایشتان نیم

بەڵام کۆترە شینکەی چاوم

بەدەم قوڵپەقوڵپی گمەی سۆراخەوە

باڵی تەڕی لە لاملتان هەڵئەسوێت‌و ئەتانبینێ:

لەم وەرزەدا

بەرلەوەی بوولێڵ بازداتە ناو دەربەندو

جۆلای شەوبێ‌و تەونی تاریکیی بچنێ

ئەتانبینێ:

دوو دوو سێ سێ

هەردوو دەستتان لەناو گیرفانی شەرواڵداو

شان کووڕ کردوو

قژ بژ، قژ بژ.

تیاشیاندایە بە قەدەر نیوەی قەڵەمێ، ڕیشی هاتوو

دێن‌و ئەچن

بە تیزماڵکی جێگەی پیاسەی

سەر سەربانی پەستراوەدا

کە بەهاریش گیای لێ ناڕوێ

دێن‌و ئەچن. دێن‌و ئەچن.

لەو ئێوارە وەختانەدا

کە لای ئێوە هەتاو زووتر جێ چۆڵ ئەکا

بۆ سێبەر و

لە ڕەوەزی ئەوبەرەوە

ناوبەناوێ چاوشارکێتان لەگەڵ ئەکا.

لەو ئێوارە وەختانەدا

دێنو ئەچن، دێنو ئەچن

وەك بەرگی بەر یەك ئازاری ڕەنگ خاكینو

بەڵام وەك گوڵی خەندەران

قۆڵتان لە قۆڵی یەكدایەو پێئەكەنن.

دێنو ئەچنو لەناو ڕاڕەوی قسەدا:

"بەشە نەوتو ئاردو نیسكو نۆكی مەقەڕ

گڵەبانو مۆرەی ئاو دز.. مەترە نایلۆن

بۆری شكاو.. سۆندەی تەقیو

هتدو.. هتدو.. هتدو..

لەزۆر شوێندا یەخەی پیاسەتان بەر نادەن

سەری سۆراخو مشوری هەبوو نەبووی

ئەمسالێشتان پێ بائەدەن..

ئاوەڕۆی دەنگتان ئەگۆڕن

دێنو ئەچنو لەپڕێكدا ئەوەستنو بێ دەنگ ئەبن

زیت زیت زیت زیت

بۆ ڤڕەی دوور گوێی ڕاهاتوو هەڵئەخەنو

لەیەك ساتدا بەیەكەوە

بەرەو ئاسمانی پایزەی خۆڵەمیشیی

لەپی دەستێك ئەكەن بەچەتری تەماشاو

سەر هەڵئەبڕن!

* * *

ـ ئێرە ئیستگەی

"دەنگی گەلی کوردستان"ە

سڵاو! سڵاو! سڵاو!

ئەی ئاریەلەکانی لوتکە

ئەی شەپۆلەکانی ئاسمان

سڵاو! سڵاو!

ئەی ڕادیۆکەی سەر ڕەفەی چاو

ئەی بانگی ڕۆژی دووجارەی

سەر منارەی باڵای شەهید

سڵاو! سڵاو!

من دەنگتانم‌و لەلایشتان نیم

گوێچکەم لێرەیەو بیستنم لەلاتانە:

هەموو ڕۆژێ قریوەی سەرچۆپی هەواڵ

حیلەی ڕەوە ئەسپی "پ.م"

لەناو ژووری تەنیایمدا

مێژوون‌و دەنگ ئەدەنەوە

چەخماخەن‌و تاریکایی ئەم نامۆیی‌و غەریبییەم

وەك بەفری بەر لایتی دەستی شەوانتان

ڕووناك.. ڕووناك ئەکەنەوە!

لەم دوورەوە گەواڵە هەوری پایزەم

دەنگی زریانی لای ئێوە

بەرەو باشوور ئەمدەنە بەر گڤەی خۆیان

**هەموو ڕۆژێ بەتلاوتل ئەمبەنەوە**

**هەتا ئاسمانی "بەرگەڵو" لەسەر ئەوێ**

**لەتاواندا وەکوو لۆکە شی ئەبمەوە**

**ئەبمە هەزار.. هەزار.. هەزار**

**پەپوولە پایزەی سپیو ئەوسا ئیتر**

**گوێسەبانەی ژوورەکانتان، تەلی ئاریەل،**

**تەنافی جل، هێواش هێواش.. ئەمگرنەوە**

**سڵاو! سڵاو! سڵاو!**

**ئەی گوڵە گەنمی قەڵەمو**

**ئەی کاغەزی کێڵگەی هەتاو.**

**ئەی ستۆدیۆ ڕوتەڵەکەی**

**کومباری شێدار لەبەرم**

**ئەی ڕیکۆردی هەوراز بڕی**

**هەموو ڕۆژێکی ناو سەرم**

**سڵاو! سڵاو!**

**من دەنگتانمو لە لایشتان نیم**

**چاوم لێرەیەو بینینم لە لاتانە:**

**وا ژوور، بە ژوور، هەیوان، هەیوان**

**سەربان، سەربان، وەك کۆترەکان**

**نیگاکانم لەو کلی خاكو خۆڵەدا چینەیانە.**

**لاتان نیمو بەڵام چاوم هەر لێتانە:**

**وا ئەنگۆرە فلچەی پانی تاریکیی گرت بەدەستەوە**

خێرا، خێرا بە لاشانا هەڵئەگەڕێو

پلە پلەی شاخ ڕەش ئەکا!

ئەوا ئیستە ڤڕەی ماتۆڕ، تەپە تەپی،

گڵۆپی زەرد باو هەڵئەکا بۆ پشووی کەمی شەوانە

لاشتان نیمو گوێم لێتانە:

ـ "چیمان هەیە؟! خەفەر کێیە؟!"

بەچوار دەوری مەنجەڵێکدا، لێواری کەل،

سەرقاپ قوپاو

دووکەڵ خواردوو

برسی.. برسی

خۆتان نانن.. بەڵام برسیی

بەیەکدا دێن.. تارماییینو جاربەجارێ

کلێپەی لەپڕ

دەمو چاوتان ئەداتە بەر

شەوقێکی کزی نارنجی

لەناکاودا دووسێ هاوار

ئەبنە دەنگی ـ گڕـ ی مەقەڕ

ـ "وەرن بۆ نان!

وەرن بۆ نان"

ـ دیسانەوە نۆکی نەکلۆك

لەسەر سفرەی درێژکۆلەی قەد ڕێ ڕێ بوو

دوو دوو، دوو دوو

بەرامبەر یەك

وەك "مظلي" ئەمانخاتە سەر لاقێكو

سەر ڕووتاوەی هاوڕێشمان، سەرووگرتوو

چەندین ساڵە ئازارێكی قۆشمەیەو

دیسانەوە وەكوو دوێنێو وەكوو پێرێو،

بەسەر پێرێ

بۆ ئەم  نۆكەیش

یەك دوو نوكتەی تازەی پێ یە!

* * *

ئەوا ئیستەیش ئەتانبینم:

زیاتر لە نیوەی شەویشتان هەڵهێنجاوەو

سەعات.. سەعات

ئەیكەنە ناو ئەستێركەكانی نیگاوە

هەر بێدارن

ئەتانبینم بەچوار مشقی لەسەر بەتانیە سەوزەكان

دانیشتوونو قەڵەمیشتان بە ڕێگەكانی كاغەزا

لەسەر مێزی نزمی بەردەم

تیپی مەڵبەندی وشەنو

هەر ئەڕۆنو هەر ڕێبوارن.

* * *

سلاو! ئەستێرەكانی شاخو داخ! سلاو!

سلاو! گوڵە كێویەكانی شۆڕش! سلاو!

لەتەم تومانی ئەم وەرزە دژوارەدا
ئێوە ڕیزە چرای چاوی ئایندەن‌و
یەك.. یەك.. لەسەر
تاشەبەردو، لقی بەرزو، تاڤگەدا، هەڵکراون!.
لەبەردەمی چەپۆکانی ئەم سەردەمە چەمووشەدا
ئێوە شاسواری ئێمەن‌و
کەڵ مل.. کەڵ مل.. وەکوو لوتکە ڕاوەستاون!
ئێوە ئەی گوڵە جەرگینە
ئەی جەرگ کون تیا نەبوەکان!
خاك لە هەنگاوتاندا ئەژی
ئاو لە هەناوتاندا ئەژی
دەنگ لە گەرووتاندا ئەژی
ئێوە مەرگ ڕام ئەکەن‌و
کوردستانیش لەناو سەنگەرتاندا ئەژی.
ئێوە لە ئەژدیهاکەی بەرگرتووی سەرچاوەوە
هێندە نزیك کەوتوونەوە
ئەمۆستتان ئەچێ بە چاویا
هەموو ڕۆژێ، بەسەر ڕەگی ملیا ئەڕۆن‌و دێنەوە
شەوێ نیە بۆ ناونیشان گوێی بڕڕاوی بەچکە دێوێ
بەچکە نەهەنگ‌و درنجێ.. نەهێننەوە
چی ما! چی ما! چی ما ئیتر
تا بۆ ژەهریش

ئێوە دەرگای هەناسەتان ئاواڵەیە.

بەڵام لێرە! لێرە! لێرە!

لای ئەوانەی فاڵی خەیاڵ

لە فنجانی ئەوروپادا ئەگرنەوە

لەگەڵ تەوقیتی "بگ بن"دا

لەسەر بورجی "ئیڤڵ"ەوە

بۆنی "شێخ وەسان" ئەکەنو

هەر لەوێوە..

ڕۆژژمێری خوێنو دووکەڵی ساڵانتان ئەخوێننەوە!

لێرە! لێرە! لێرە

لای ئەوانەی لە تەمەنی ئەژدیهاوە

لە ئاگرە سوورە دوورنو

کراسی بەری دەفتەریان چرچ نەبووەو

دەقی پانتۆڵی قەڵەمیان نەژاکاوە

ئەوان لێرەوە شمشێری دارینەیان

بۆ ئەژدیها هەڵئەکێشنو

وەکوو گاوس بەسەر شیعری پێشمەرگەما

گیڤ ئەبنەوە!!

بیرتان ئەکەم، بیری مێوژە ڕەشکەی چاوتان.

بیرتان ئەکەم.

بیرتان ئەکەم، بیری نانە قەیسی قسەی خۆشتان؟ بیرتان ئەکەم.

بیرتان ئەکەم، وەختە شیعری بەر مەمکانەی

**لە مەمکی خاك دابڕڕاوم سوێی بێتەوە!.**

**ئا لەم تەندووری کۆچەدا**

**وەختە، وەختە باڵام ببێ بە کۆڵەوژ**

**وەختە چاوم لە کاڵانەی جوێ بێتەوە**

**بۆ من ئیستە**

**ژانەو ژانەو ژانە**

**وا قەڵەم لەسەر تەوقیسەر ئەخولێتەوە**

**قوڵ، قوڵ، قوڵ، قوڵ**

**هەموو شەوێ بە نووکی خۆی**

**یادگارێ هەڵئەکەنێو ئەوینێکی ئەکولێتەوە**

**هۆ! هۆ! هۆ! ئەی نیشتمان**

**خۆ گوێت لێمە!**

**بەو چاوانەت، بە ئەوینت، بە ئازارت**

**لە ئیستەدا**

**بە تەنافی تەماشای تەڕی منەوە، هەموو شەوێ**

**تك، تك، تك، تك**

**بەسەر قەڵەمی بێدارما**

**خوێنی شەهیدێکی تازەت ئەتکێتەوە!.**

ستۆکهۆڵم 1987/10/17

# ئەسپێکی سوور

بۆ شەهید د.جەعفەری شەفیعی

ئەمجارەیان! کۆمای خەمێکی گیان بە سۆی،

پۆرگ کردووی.. ئەم پایزە درەنگ وەختە

بەژنی سی ساڵەی شیعرمی،

وەك پشتی کوردستانو کۆست، چەمانەوە!

چ تەوژمی ئازارێ بوو، وا لە گەرووی شاخانەوە هاتو

وا بە لووزەو

ڕژایە ژووری تەنیاییو هەناومەوە.

لە ترووکەی چاوێکدا بوو،

ترووکەی چاوی گەڵایەك

ترووکەی چاوی وشەیەك

بەرەو گێژەنی نوقم بوون لوولی دامو

لوولی دامو

وەك بەردی بن متی کردم.

کوێرە هەواڵ مۆتەکەیەکی ئاسن بوو

هەناسەی لەبەرکێش‌و سەروای ڕەوانم،

گرت‌و بڕی لەنجەی دێڕو،

شەقزنی‌و شەو ئاهەنگی،وەك باڵی چۆلەکەی

لە کەڕەسیسەدا، کەسیرە بوو

وەکوو پەنجەی سەرما بردووی

گوڵێ، قەڵەمێ، گزنگێ،

منداڵێکی لانەوازەی نێو کڕێوە، لە جووڵە خست.

بە دیواری بەرامبەرمەوە، سەرنجم

بوو بە بزماری داکوتراو.

ئەم مامە خەمەی قەڵەمەم

هەر بە پێوە لەئەستێرکی

فرمێسکەکانی خۆیدا، نوقم..، ئەوق بوو

تۆ ئەوق بوونی تریفەی مانگە شەوو

گۆمێکی مەکسی باوەشی زەردی خەزان

بهێنەرە پێش چاوی خۆت، ئاوەها بوو!

تۆ قولنگێکی پێکراوو لەنگەری باڵی شکاوی

بهێنەرە پێش چاوی خۆت، ئاوەها بوو!

ترسام.. ترسام

نەموێرا شیعر بکەمە بەر چیای "ئاسنگەران"ی

ئا ئەم کۆستە.

من ئەمزانی بەبەری ئەو تەنگ ئەبن‌و،

لە قۆڵ تێهەڵکێشانی "با" سرێشکی ساردی ئەو،

لەبەر گێڵەی کەلەپۆی خۆرنشینی ئەودا
چۆغەی ڕەشم، شیتاڵ شیتاڵ ئەبێو دواییش
ڕەوەزی ژوور هۆبەکانی ئەودیو "چۆخماخ".
کیژۆڵە ڕەنگ پەڕیوەکان،
وەکوو "بەیان"
کارژۆڵە، ماسی، گوڵ خونچە
دایکانی، سك، وەك نانی سووتاوی "بۆکان"
لچم لێهەڵئەقورتێننو پێم ئەڵێن:
کوا ئەم چاوی شیعرە بەقەد
چاوی ئەو خوێنەی ئەو گەش بوو؟!
کوا ئەم سۆزی نێو دێڕانە
ئەم زەماوەندی سووتانە
هێندەی ئەو پشکۆی کسپەیە
بە چزە چزو دووکەڵو بۆکروز بوو؟!
کەی بەژنی ڕەشپۆشی کورتە باڵای ئا ئەم،
قەڵەمە ئەگاتە ئا ئەو کاجی زامە؟!
چۆن خەرمانی ئەرخەوانیی
ئێمە بە کیلەی شیعری تۆ، دێو ئەپێورێ.
دە لالۆ.. لالۆ.. لالۆ.. هەستەوە!
تۆ زریانیو سواری ئەسپە شێکەت بەوە.
هەستەوە! بە بەن سامۆتەی زینەوە
تفەنگەکەت.. قەڵەمەکەت

گوارەی سووری گوێچکەی مێژوون
هێشتا هەر ئەلەرێنەوە
دە.. هەستەوە
دە لالۆ.. لالۆ.. لالۆ.. هەستەوە.
هەموو هاتوین بەسەر سەری ئەم هەوارە نوێیەتەوە
وەك شۆڕابەی برژانگ هەڵوەریوی پایز
گڵمتکی ئاڵهەڵگەڕاوی سەر مەزارەکەت ماچ ئەکەین
دە لالۆ.. لالۆ.. هەستەوە.
بەفر بیستی، ها لەدوور ڕا لە شاخەوە
بەرەو "ژیلوان" کلوو، کلوو وا کەوتنە ڕێ.
گوڵان بیستیان، ها لە دوور ڕا
لە هەولێرو سابلاخەوە
لە قامیشلیو بۆتانەوە، بەرەو گوڵدانی دڵەکەت
چەپك.. چەپك وا کەوتنە ڕێ
دە لالۆ.. لالۆ.. هەستەوە!.

★ ★ ★

تەمو مژ بوو، ئەم دەست ئەو دەستی نەئەدی
تاریك.. تاریك وەکوو گلێنەی نابینا.
لە گوێی کێودا ترسو بیم ئەزرنگانەوە.
ژەنگو ژاری دوای هەرەس بوو.
خم خۆرکی لینجی هەڵلووشەر
هەتا گوێچکە

ئەسپی ئەیلولی قووت دابوو.

شمشێری "شا"و فیرعەونەکەی کۆشکی بەغدا

بە ڕاستو چەپ بەچەپو ڕاست

یەك لەدوای یەك:

ملی سنەوبەرو سەروو

ملی بەڕوو، بازووی گوێزو

پەنجەکانی گوڵە گەنمیان ئەپەڕاند.

ئەژدیهاکەی تەمووز پارووی نەرمە قووتی

هەر ژەمێکی، جەستەی نەرمی ئاسکێ بوو

نان ئەگریا.

ئاو لە کەناری بێزار بوو.

ئەو سەر وەختە تاریك نووتەك، نووتەك تاریك.

لە چوار لاوە دۆڵپای پایتەخت

کەڵبەی جیڕیان لە ژیانمان گیر کردبوو.

شەوە زەنگ بوو شەوە زەنگ بوو

چل مۆمی تروسکە کزمان لە "قەندیل"دا،

ئەسووتانو کەوەختێکیش تەواو ئەبوون،

هەر بە مێویی بنی خۆیان

جارێکی ترو سەر لەنوێ

خۆیان ئەکردەوە بە مۆم

دیسان هەڵئەگیرسانەوە.

ئێمە چل گوڵەگەنم بووین،

لەچل بەرددا سەوز بووبووین.
یەك گۆرانیو چل گەروو بووین.
ماوڵێکمان هەبوو دەم کەل
بەو ماوڵە لە کێوی مەحاڵ ئەنەویین.
لە چیای ترس ئەنەویین
خۆمان چلو حەڤدە تفەنگی خانە بڕ
حەڤدە دەستی پەنجە نوقسان
سنگیشمان ئەنا بە سنگی بەغدای میكو ڕاجیمەوە
ئا لەو دووڕیانی بوونو نەبوونەدا
لەو گێژەنەو لەو دەمەدا
ئەم دارتووە، لقو پۆپ هاوێژو سێبەر کرەی ئەمرۆ
ئەو دەمە هەر بنچکێکی بستە بالای قژ خۆڵاویی لا تەریك بوو.
ئەسپی چوار پەل ئاگرینی ئەمرۆ
ئەسپی کوڕژن وەك بروسکەو تیسکەی تفەنگ
یالْ ڕەشەبا.
ئەو سەردەمە جوانوویەك بوو مێژووك، مێژووك
تازە زاوا بوو لەرزۆك، لەرزۆك.
لەو دەمەدا لەناو، قوڕگی نەهەنگەکەی (ساواك)ەوە
بەسەر دەمی گوێزانی تیژی سنووری مێردەزمەو دەڵە دێودا
بەناو هەزاران داوی باریکی جالْ جالۆکەی ترسو بیمدا
ڕوەو "قەندیل" بەرەو لای ئەو بازو هەڵۆ ڕەنگ سوورانەی
لە دەراڵو گەوەی شەختەو کونە گورگو

کلۆری دارودرەختا هەوای ڕەشیان وەرئەگرتو
هەناسەیان ئەدایەوە.
ئا لەو دەمەوە لەو وەختەدا
مرۆڤێکی گەنم ڕەنگی
لە پیاوی داستان چووی پێشین
دیدە پشکۆ
مل کەڵی تەوێڵ پرشنگدار
لێو بە گوڵی بزە پشکووت
بۆنو بەرامەی خاكو خۆڵ
لەبەرگی شڕۆڵەی هاتوو.
ئەهاتو ملەو هەورازی بە پلەو کووڕی یەك بەیەك
لەبەر هەنگاویا تەخت ئەکرد
بەکۆڵەپشتی نوردۆنانی مالانی
سنەو، سەقز، سابلاخەوە
بە هەگبەی توێشەبەرەی ئازیزانەوە
وەکوو "مەم"و "برایمۆك"
سەرئەکەوتو سەرئەکەوتو سەرئەکەوت
تا لەسەر پەیژەی ڕەوەزی دانەبەردی سەری "قەندیل"
سەری ورە
سەری چرا
ئەگەیشتە لای هەڵۆی برسی
پریاسکەی چل جووتە چاو تێبڕاوی ئەکردەوە

ئەو وەختەی بۆی هەڵئەڕشتن
ئەبوو بە جەژنی داروبەرد
ئەبوو بە ئاهەنگی ئەشكەوت
بە زەماوەندی كۆساران
تفەنگی بێفیشەك دانمان لەسەر یەك قاچ
ئەكەوتنە سەماو هەڵپەڕین
ئەو سەردەمە پوورەهەنگی نێو شارەكان
مێروولەی سووری ژێر زەوی
بە چرپەی ئەو دیوی دیوار
ئەو دیوی كون.
دوكتۆر جەعفەریان ناونابوو دوكتۆر عەزیز
لەناو نەهاتە ساڵانەوە
ئێمە دڵۆپی بارانی ئەومان ناسی.
ئێمە زەوی پێست قڵێشاو
ئەو، ساڵاوی بەهارە بوو.
بۆ چیلكەو پووش‌و پەڵاشی سەر سەهۆڵمان
بۆ وشەی گۆنەكردوومان
ئەو بەردە ئەستێی ئاگركەرەوەی بەردەم
ئەشكەوتی تەمەن بوو.
ئێمە برین ئەو هەتوان بوو.
لەو دەمەوە وەك دوو ئاوان
گیانمان تێكەڵ بەیەكتر بوو

لەو ڕۆژەوە بووین بە برۆیەکی پەیوەست

بە دوو جەمسەری یەك پردو

سیامەندێکی عاشقی خەجی شۆڕش.

دە لالۆ.. لالۆ.. لالۆ. هەستەوە

سواری ئەسپە شێکەت بەوە

دە هەستەوە ئەستێران جلّەوت ئەگرن

ئارەقەی زەنگوڵ زەنگوڵی

لا ملو نێو چاوت ئەسڕن.

دە لالۆ.. لالۆ.. لالۆ.. هەستەوە

هێشتا زووبوو.. زووبوو.. زوو

وادەی ئەم کۆچە کوا هەبوو؟

دە لالۆ.. لالۆ.. هەستەوە

سواری ئەسپە شێکەت بەوە.

* * *

ئەو کاتەی شیعریشم وەك خۆم

بەن کاڵەی کاڵەو پێتاوی عەشقی بەستو

شاخی هەڵۆکانی کردە قیبلەو ڕووگە

لەویٚ لەیەکەم سەفەری پەلّکە ڕەنگینەی شیعردا

بەژێر ڕێژنەو لێزمەو شەوی گۆپاڵە باراندا

کە بەخۆمو هەگبەی بە شیعر ئاوسی

بەشان تەکە تەککەرمەوە

ڕوومان کردە هۆبەی دەوارە شێدارە،

لە نایلۆن گیراوەکانی ئێوەی عاشقی ئازادی.
بەر لەوەی کە پەنجەکانمان یەك بناسن
ناوەکەت  وەك گیزەگیزی شڵخە هەنگی دەم بە شیلە
لەشانەکانی نێو سەرما گڕی ئەخوارد
"د.جەعفەر.. د.جەعفەر"
چاوەکانم بنەبانی دەوارەکەت بۆ ئەگەڕا
کەچی تۆ وەك بەورێ بێدەنگ
لەلا پانکێکی نەپندی خوارەوەدا
هێور.. تروشکەت کردبوو.
دەرلنگی شەڕواڵ تا ئەژنۆ قوڕاویی
یەخەی کراسێ چرچو لۆچ
ڕەنگ پێ نەماو
دوو نیگای ژێر
چاویلکەیەك زەڕەبیندار
ئەتوت ڕەشەڕێحانەی مل
بەلارەوە گرتووی دوای شەستەبارانی.
لەوەرزێرێکی لای سنەو سەقز ئەچوویت،
هەر وەکوو ڕاستیی ساکارو
وەکوو منداڵانی بۆکان تۆ سادەبووی.
تۆ هەر لەو گوڵانەت ئەکرد
کە لەهەناوی بەردەوە سەر دەردێنن،
بەبێ گوڵدانو شووشەبەند

بێ بانگەشە، لەژێی دەزوولەی گیان ئەدەن
لەویشەوە بۆ هەورەبانی ڕەشێنەی
گلێنەمان پێهەڵ ئەگرن.
وەختێ هاتیتە لامەوەو دەستت لەسەر شانم دانا.
ڕووی بەخەندە هەلگەڕاوی،
وەك هێرۆ ئاڵت.. تێ کردم
منیش گوێم نا بە گوێچکەی وشەی دانارو ڕەوانتەوە
قسەکانت وەك گەنمی قەندەهاری،
بە پێزو وەك گوڵەمێخەك بۆن خۆش بۆن خۆش.
وەکوو دڵی هەژارانیش بێ گرێو گۆڵ.
کە وەختێکیش، دواتر، دەرگای
قەفەزی سنگم کردەوە
پۆلە شیعرێکم بەرەڵلای ژێر دەوار کرد
ئەوساکە تۆیش بە گیانێکی قولپ دەری سەر ڕێژەوە
بووی بە مزگێنی باڵ گرتوو
باوەشی سۆزت پیاکردم
گەرم.. گەرم.. ماچت کردم.
ئەی کلاوە قوچەکەی بەڕووی هەژاران
ئەو باوەشەت کوانووی بەکەڵە پشکۆیەو
لە ڕۆحما سارد نابێتەوە
ماچەکانیش چڵە کاجی هەمیشە سەوزی چواروەرزەی
ڕواوی ناو یادگارمن وەکوو بەهار بیرناچنەوە.

دەلالۆ.. لالۆ.. لالۆ.. وەرەوە

سەربەرەوە.. وا وەرەوە

سواری ئەسپە شێکەت بەوە

هۆ بە هۆیەو زایەڵەیە

ڕێ بەندانو بەفرانبارە

شیعر چلوورە فرمێسکی هەموومانەو

تا "ئازادی"ش وەك بۆکانە نازدارەکەت

شۆڕەژنێکی غەمبارە!.

دە لالۆ.. لالۆ.. هەستەوە

سواری ئەسپە شێکەت بەوە.

★ ★ ★

ئەمڕۆ "چۆخماخ"، لانەی پڵنگە چنگو پەل

بە چەخماخەکانی ئێمە.

لە مانگی گیراو ئەچێتو تارو مارە.

خاك بە هەنیسکەوە سەری

درەختی خۆی هەڵئەکەنێ.

لووتکە چاو تەڕو مل بەکوێن.

دەمو لێوی یارانی شاخ

هەر لەو گەڵا وەریوانە ئەچن کە "با"،

کە کزە بای ئەم پایزە درەنگ وەختە

بەرەو گۆڕیچکەی دوا عومری خۆی ئەیانبا

کپ بوونێکە هەر بەتەنها ئازار

ئالەم دۆڵە کزو خامۆشەدا

ئەبزوێو ئەزرنگێتەوە.

ئەم بەر، ئەوبەر، ڕیزە تفەنگی چاو تەڕی
پێشمەرگەکان، وەك هەڵاڵەی ڕوومەت شەقار
بە درێژایی هەناسەی ڕێگاوبانو
بەدرێژایی گریانو
بەدرێژایی خەمی سوور
هەر وەکوو لەقۆناغەوە ڕوابن
وا بوونەتە دوو تەیمانی دەوری سەری ئەم
کۆتەڵە وروژاوە.
بڕوانن‌و وردبنەوە
لە چۆخماخە بچکۆلانەو ڕووتەڵەکەی ئێمەدایە
کە زرێبار ئەڕژێتە سیروانەوە.
شاهۆی ئەوین
مل لەژێر چەنەی پیرەمەگرون هەڵئەسوێ
سابلاخیش بۆن ئەنێ بە بۆی
هەناسەکەی هەولێرەوە.
چەکمان چۆغەی کەرکوك بەسەر
ڕانکی هیوای کرماشاندا لەبەرئەکات.
بەسێ ڕیز فیشەك لغەوە
ئێشك گری شەوانەی ئەم خاکی دایکەن
تۆ بڕوانە ئەوەتا وا
بەدەم هاواری خوێنەوە سوجدە ئەبەن.

★ ★ ★

لە بیری بەفورە ڕەش چووی
ڕابردوویەکی دێزماندا.
ئەو وەختانەی کە ڕۆژگارمان سیخوڕ بوون
بەسەرسەعاتی ترساوی شەوگارمانەوە.
وەختێ بەخەنەبەندانی خوێنی یەکتر،
چل چرای شاییو لۆغانی
ئێرەو ئەوێو ئەولای ترمان،
بۆ پایتەختە سمێڵ قیتەکان سوور ئەکرد.
لەو دەمەدا کە لەبەر پێی شاو سوڵتاندا،
وەك زەردەمار،دوپشك، بەیەکمانەوە ئەداو ئەمردین،
بەڵام ئیستە لە کۆتەڵی
ئەم هەموو جەعفەرانەدا.
لە پەنجەرەی ئەو خوێنە ڕووناکانەوە،
یەك ئاسۆگەی سورمان هەیە.
کۆست لە دوای کۆست
خوێن لە دوای خوێن
هەر هەمووومان ئەچینەوە،
سەر ئەو شا ڕێگەو شەقامەی
باخەوباخو تەلان تەلان
ئەمانباتەوە ناو دڵە داگیرساوەکەی کوردستان.
ئەمڕۆ "چۆخماخ"ی دوا یانەی ئەم جەعفەرە
بوو بە هەموو نیشتمان!.

تۆیش ئەی شەهیدی کەڵەگەت،

وەکوو نەخشەی وڵاتەکەم!.

ئەی خاجی ڕەنجو لاوکی دەم ئازادیی!.

گڵ مەیل بڕی تۆ نییە.

گڵ بەخوێنی ئێوە هەناسە ئەداتو

دەمی برینەکانی ئێوە کارێزی ژیانێتی.

ئەوەتا پێشمەرگەیەکی شێونەکردوو

بە پلەی خزی تاریکی ئەم شەوەدا هەڵئەگەڕێو ئەڵێو ئەڵێ:

لە پەلە پیتکەی تفەنگمای.

نووسەرێکی وشە شەهید

دوای نیوەشەوێکی خامۆش

قەڵەمەکەی ڕووی دەمت تێئەکاو ئەڵێ:

لەناو بیلبیلەی حەرفمای

دایکێکی خەم دەستەمۆکەر

لە ژوورێکدا، تەنها وەك خوا!.

بێ چرای مێرد، بێچرای کوڕ

ئەویش ئەڵێ:

تۆ ستوونی ئەم دەوارەو

کۆڵەکەی بەر هەیوانمانی.

منداڵە چۆلەکەکانیش، پەڕوباڵ تەڕ

ڕووی دەمی خونچەی خۆیانت تێئەکەنو

وات پێئەڵێن:

**لەم زستانەوە ئیتر تۆ**

**شەوانە چیرۆکی ئێمەی.**

**بۆ منیش تۆ ئەو شیعرە هەرە نازدارەی**

**کە هێشتاکە نەمنوسیوی!.**

**دە لالۆ.. لالۆ.. هەستەوە**

**سواری ئەسپە شێکەت بەوە.**

**ڕێ بەندانو بەفرانبارە**

**هۆبە هۆیەو زایەڵەیە**

**کوا وەختی بوو**

**ئا ئەم کۆچە بێ وادەیە؟**

**دە لالۆ.. لالۆ.. لالۆ.. هەستەوە**

**سواری ئەسپە شێکەت بەوە**

**چاوەڕوانین دە هەستەوە!.**

ستۆکهۆڵم/ 1987

*ئەم بەرهەمەم بۆ یەکەم جار لە شێوەی شیعرو پەخشانە شیعرێکی تێکەڵدا بێ سەردێڕ لە چلەی شەهید د.جەعفەری شەفیعی دا لەستۆکهۆڵم خوێندەوە، دواتریش لەگۆڤاری "پێشەنگ"ی هونەرو ئەدەبیاتی کرێکاری ـــ کوردستان ـــ دا ژمارە "7"ی ئوکتوبەری/1988دا بە سەردێڕی "کوا وەختی بوو" جگەلە بەشێکی –بڵاوکرابۆوە– بۆ ئەم چاپەیش لەڕووی فۆڕمی هونەرییەوە لەئاهەنگی شیعرم نزیکترکردەوەو ئەم ناونیشانەیشم بۆ دانا.

# تاڤگەی زیندانیی

وەك چۆن ئەستێرە ئەکشێ کەوانەیی،

تاج پرشنگدار،

چاو ئاگرین، گەردن زیوین، تیژ وەکوو عەشق

کوتو پریش وەك مەرگە سات.

تۆیش بەو جۆرە لە شەوێکی مانگ کوژراودا

لە شەوێکی بەژنو باڵا هەڵقرچاودا

لە وڵاتی خۆڵەمێشو لەژێر قوببەی

مێژوویەکی بریندارو زەمینێکی کۆت کراودا،

ئاوا کشایت

زەرد.. زەرد، کشایت.

ئاڵ.. ئاڵ، پژایت.

لە کاوانی ئەوینەوە وەکوو بەفراو چۆڕایتەوە،

ملی کەژو هەردی بڕڕاو

مەچەکی بەرد، پلوسکت بوون،

وردە وردە بویتە ڕووبار.

وەکوو خوێنت ڕوون بوویتەوە، سوور هەلگەڕایت
کلْپە، لە تۆی ئەخواردەوە،
خۆشەویستیت ئەستێرکێکی بەخشندە بوو،
لێی ئەڕژا، خۆشەویستیت،
گەلاّ.. گەلاّ سەوز هەلگەڕا.
خۆشەویستیت، دارستان بوو، تەماشات چڕ.
ئازارەکانت دارەوان، وەك سمۆرە
بەسەر قەدی گرێ گرێی
ڕەش‌و سپی شەوو ڕۆژتا هەلْئەگەڕان.
ماندوو نەبوویت، خۆت ڕێگە بوویت.
نەخشە نەبوو بتگرێتە چوارچێوەی خۆی
تۆ خۆت نەخشەو، خۆت چوارچێوەو
ئەودیو، ئەودیو، چوارچێوە بوویت.

⋆ ⋆ ⋆

لەو دەمەدا
بالاّت بالّەبانی خوا بوو،
ناتی بە لێوی کێوەوە
بە فووی زریان‌و ڕەشەبا گڕ گرتیتی‌و
بووی بەئاواز، بووی بە لەنجە،
بووی بەسەمای بەفرو هەتاو.
دار بەڕووەکان پەنجەی خوا بوون.
ڕەوەزەکان کەللەسەرو شانی خوا بوون.

که ئەیژەنیت:

دەمێ ئەبوویتە شەپۆلو باڵت ئەگرت.

دەمێ ئەبوویتە بارانو خوڕ دات ئەکرد.

دەمێکی تر ئەبووی بە زاری ئەشکەوتو

وەك "هەزارمێرد"

لە دوێنێوە بەرەو ئیستە

بانگی هەزار هەزار ساڵت ئەکرد.

تۆ ئەو دەمە ئەسپی قەترانیی

سەرکێشو جڵەوبەربووی،

"لاس"ی وێڵی دوای "خەزاڵ"ی مانگە شەو بووی.

خەزاڵ گیرخواردووی

ناو تەمی قوللەی قاف بوو.دێوی سپی و ,

دێوی ڕەش و درنجەکان ,ئەویان بە قەفی سمێڵو،

کۆتی بسكو قرژاڵی چنگ بەستبۆوە، یارەکەی تۆ،

وەك باوبۆران، ئەیزریکان، وەکوو هەور ئەیقریشکان.

ئەو تاڤگەی زیندانیی بوو، پرشنگی دیل،

هەوای کۆتو پێوەند کراو،

قوربانیی بوو.

★ ★ ★

هەر ئەبوایە سەری ئەو عەشقە هەلگری.

تۆ ئەو سەرە هی خۆت نەبوو.

سەری دارو سەری بەردو سەری ئاو بوو.

هەر ئەبوایە بچیتەوە هەواری گوڵو خۆڵەمێش.
ئەو هەوارە هەر هی تۆ بوو.
هەر ئەبوایە بە ژیلەمۆی عەشقی خەزاڵ،
داپلۆخایە پێستی ڕۆژگاری تەمەنتو
هەڵقرچایە، ئەوینی سەر ژیلەمۆکەی بەهاری ساڵ.
هەر ئەبوایە بۆ سێهەم جار کفنەکەت لەبەر کەیتەوە.
داوە ژانی چیاکانت بە تەشی دوند هەڵکەیتەوە.
وەکوو شەهید چاو ببڕیتە
گزنگی خوێن.
گورج بیتەوە
ڤیت بیتەوە
لاو بیتەوە
کاژی هەرەس فڕێ دەیتو بەدەم لاوکی سوورەوە،
بڕۆیتەوە لای تاشەبەرد، لای بەردە قارەمانەکان
لای "داس"ی دەس زەردو ماهیی دەربەندەکان!.
وا نەبوایە ئەوین ئەیبەست، سترانەکانت لاڵ ئەبوون.
کچی حەیران، سوارەی لاوك،
دەست بەرداری ژانت ئەبوون.
ئەی ئەوساکە تۆ چیت ئەکرد؟
لەکام بنارو کام دەشتا؟
غارت ئەکرد؟ لەبەر دەمتاو لەپاشکۆتا
کێت هەڵئەگرت؟

چیت هەڵئەگرت؟ چ هۆبەیەك ئەیانكردی بە میوانی،
"سیامەند"و كام "خەج" چاوی نێرگزی خۆی،
ئەدا لەبەرۆكی والآی قەڵەمەكەت؟
لەگەڵ وشەی قوربانیتا
چۆن ڕووبەڕووی ئەبوویتەوە؟
مەچەكی بڕڕاوی "خانی"ت بۆ كوێ ئەبرد؟
لەكام گۆڕستانی شیعرا ئەتشاردەوە؟
هەر ئەبوایە ببی بە گڤەو بە گەرداو.
هەر ئەبوایە مۆتەكەی ترس دەستەمۆكەیت.
هەر ئەبوایە ملی ڕێی ئاگرو پشكۆی،
وەرزی عەشقی ترس‌و بیمت بگرتایە.
لە ئاوی ڕەشت بدایە.
یان ئەبوایە وەكوو بنچك گرمۆڵەبیت
وەك ماری سڕ پەپكە بخۆی.
حیلەی ئەسپت،
بارڕژنی مامزی "خەج"ت،
وەكوو سەرت
لەناو قەلآی ئەژدەهاكدا بەند كردایە
ئەی چیت ئەكرد؟!

* * *

لەبەرچاوت كەلەپچەیان كردە بازووی هەورو هەتاو.
ئاویان خنكان.

پەنجەی شنەبایان قرتان.

لەبەردەمتا گۆشاوگۆش شیعریان سەربڕی.

ڕیشی "مەولەوی" یان سووتان!.

من بۆ ئەوەی کۆت نەکرێتە پێی درەختو،

گوڵەگەنم لە بار کێڵگەو زەوی نەچێ!.

من بۆ ئەوەی جۆگە نەبێ بە کۆیلەو،

باران نەمرێو گیا پێ بگرێ!.

خۆم لەناو تۆدا توانەوە گەیشتمە لات.

ئەی ئەوینی شاخو داخو عەشقی فەرهاد،

هەر ئەبوایە من بێمە لات!.

1988

# توانەوە

سەعات دووی دوای نیوە شەوە

وەکوو هەورێکی ژان گرتوو.

وەكماینی حیلە کردووی

جوانوو ون بوو.

ئیستە ئاوا

شڵەژاوو وەکوو دایکم خەم لێ نیشتوو.

بەم ناوەختە.

لە نسێی ژووری تەنیاییو غەریبیما

شیعرێ هاتووە بمنوسێو

لەدواییدا بمخاتە بەر باخەڵیەوەو

لەگەڵ خۆیدا دوور دوور بمبا.

سەعات دووی دوای نیوە شەوە

شیعری چاو ڕەش، بەسەر سەرمەوە وەستاوە

ئەو هەر ئەڵێی ڕەشە ڕێحانەی هەڵچووەو

چاوی منیش، ئەڵێی کانیی،

گوندی تازە ڕاگوێزراوە.
سەعات دووی دوای نیوە شەوە
من خەوم دێ‌و ئەو ئەیەوێ هەر بمنووسێ
درێژ ئەبم‌و ئەو ئەیەوێ هەستمە سەرپێ
کاغەزێکم خۆم لوول داوەو ئەو ئەیەوێ بمکاتەوە
چاو لێك ئەنێم.. ئەو ئەیەوێ
بچمە ناو هەردوو چاوێوە.
من پێی ئەڵێم:
کوللەی نامۆیی‌و غەریبیی
بەم ڕۆژگارە
بەم شەوگارە
گوڵە گەنمی گیانم ئەخوا
وەختێکی تر سەر بەرەوە.
ئەو پێم ئەڵێ:
تا نەبارێم نارۆمەوە
هەتا قەد قەد نەتکەمەوە نارۆمەوە.
ئەو هەر ئەڵێ‌و من بێدەنگم
ئەو ئەڵێ دەی من ئەڵێم نا.
ڕاماو ڕاما
وەکوو دووکەڵی جگەرەم
لە پەنجەرەوە چووە دەر
کە هاتەوە دەستی شۆخێکی گرتبوو

ئەتووت بەفرو گوڵەزەردە

لەسەر یەکەم کورسی بەرامبەرم داینا

وتی: ئیستا

هەر وتم نا

سەعات سێی دوای نیوە شەوە

وەك یەکەم جار چۆن هاتبوو

ئیستەیش ئاوا بەسەر سەرمەوە وەستاوە

نە ئەو ئەڕوی، نە من ئەمویست هەڵمسێنیٚ.

ئیتر خەو هێندەی نەمابوو وەکوو منداڵ بمفرێنیٚ.

لە پرێکدا چریکانی

ئەو کاتەی پێڵوم هەڵبڕی

بینیم شیعری چاو ڕەشی شاخ

بەر ئاوێنەی خەیاڵی ژوورمی گرتووە

جامانەیەکی خوێناویی

دوا شەهیدمانی بەستووە

وتی: ئیستا؟

ئیتر هەر ئەو هەستانە بوو

من سەنگەرو ئەو نمەی خوێن.

من دەشتو ئەو دەنکە تەرزە

ئیتر هەر ئەو داچڵەکینو هەستانە بوو

قەد قەد گیانم بۆ کردەوە

هەر نووسیمیو هەر نووسیمی

باری‌و باری تا ڕۆژ بۆوە
من نەمزانی ئیتر دوایی
ئەو لەناو مندا تواپۆوە
یان من لەودا تواپوومەوە؟!

ستۆکهۆڵم1987/9/17

# سوتماك

ئاسمانێكی: خۆڵەمێشیی.
شەقامێكی: وەنەوشەیی.
تەنیایم: زەرد.
ئاوارەییم: تارمایی پەرت.
هەواڵ: ڕەش.. ڕەش!
ئەی شین پۆشی كەمانچە ژەن،
ئەی گوڵی یەخە، پەمەیی!.
وا لێرەوە:
لە سێبەری قژ تەنكی، سەوزی كاڵی،
ئەم دار لیمۆ گۆشەگیرو تەریكەوە
خۆم‌و خەمی ئەرخەوانیم، ڕاوەستاوین
ملمان لارو
لەپۆپەوە تا بەری پێ
زەنگوڵ.. زەنگوڵ
خۆرنشینمان لێ ئەتەكێ!.

كزكزو مات

كڕكڕو مات

هەر بەپێوە، لە گۆشەی نیوە ڕوناكی

ئەم جێیەوە

خۆمو خەمی ئەرخەوانیم،

پەردەی ئاڵی گوێمان ناوە

بە پەنجەرەی، بەر هەناسەی،

ئەو "ژێ"یەوە كە بەجووڵەی بێ سرەوتی

سەری پەنجەی بلوورینت،

ئاوازێكی تەلیسماویی،

باڵ زیوینی، لێ هەڵئەسێ!.

ئەی شین پۆشی كەمانچە ژەن!

ئەی رۆح سپی!.

بۆ ئەم ئێوارە كسپەیەم.

بۆ چزەچزی هەواڵی،

تازەی ئەم شیعرە بە سوێیەم.

بۆ یاڵی ئاگر تێ بەربووی،

جوانووی ئائەم كۆچە نوێیەم،

هاوڕێم بە!

بمخەرە ناو كزە كزی هەڵقرچاوی كەمانتەوە.

وەكوو پەپوولە پایزە،

بمدە بەدەم بای زایەڵەی هەڵوەرینو پژانتەوە!.

خەون بکە بە ڕێ بینم.

شەپۆل بکە بە سەرینم.

هەور بە چرپای برینم.

دوور دوور بمبە، بمبەرەوە

بۆ وڵاتی ساڵ دوانزە چاو، فرمێسکاویی.

بۆ لای درەختی مل بە کوێن.

بۆ لای بەفری پرچ خوێناویی.

هاوڕێم بە!

بمبەرەوە، بمفرێنە

وەکوو هێشووی سەرما بردوو

لەژێر کەپری ئاخەکانتا،

دەنك.. دەنك.. بموەرێنە!.

دەدەی توخوا بمبەرەوە!

لێرە پەڕەی ڕۆژمێرێکی دڕاوە ئەم تەمەنە!

بەدیوارو بە بنمیچی دەروونی خەڵکی ئێرەوە،

ئەوین گڵۆپی سووتاوە!,

زەریا.. تینوو

لەم بیابانی ڕۆحەدا، ئاو خنکاوە!.

هاوڕێم بە!.

شەقام.. شەقام

پێش تۆ گەڕام

تاق تاقکەرەی چاوی تەڕم

چووە بەر هەر پەنجەرەیەك، هەڵیانفڕان!.
لەم چۆڵەوانی ڕۆحەدا، یەکێ نەبوو، کەسێ نەبوو
لا کاتەوەو ئاوڕ لە کڵپەم باتەوەو
گوێیە بگرێو بێتە زمان!.
هاوار! هاوار!
لە کوێیە رۆح، لەکوێیە دەم، لە کوێیە گوێ؟!
ئەی کۆستی نوێ!
خۆ من ئەسپێکیشم نەبوو
تاوەك هاوڕێکەی "چیخۆف"
بچمە لایی‌و هەر هیچ نەبێ،
ئەو گوێ لە شیوەنم بگرێ!.
دەدەی توخوا
لەسەر باڵی نەغمەیەکی گریاناویت بمبەرەوە
بمبەرەوە ئەی شین پۆشی کەمانچە ژەن
قژ قەترانیی!.
دیارە کە تۆیش هەر وەکوو من
درەختێکی گۆرانیت‌و لەبەستەی خۆت هەڵکەنراوی!.
دیارە کە تۆیش هەر "ئاخ" ێکی کۆچەریت‌و
وەکوو شیعری هەجیجیی من
لەم وێستگەوە بۆ ئەو وێستگە
لەم فڕگەوە بۆ ئەو فڕگە
پایز بەکۆڵ، هەڵوەریوی‌و، ڕاونراوی!.

ئەی شین پۆشی کەمانچە ژەن، بمبەرەوە

هەواڵی نیگا بە شەونم وای پێ وتم:

ئیستە لەوێ

لەناو تابووتی نارنجیی خۆرنشینی شارەکەمدا

چل.. منداڵم.

چل.. جگەرم.

هەشتا.. چاوم.

هەشتا.. گوێچکەم.

هەشت سەد پەنجەی،

هەردوو دەستو هەر دوو قاچم

بەیەکەوە هەڵئەوەرێن!.

پێکیشەوە بەجاجمی خەزانێکی ئەم پایزەم

هێواش.. هێواش، دا ئەپۆشرێن.

ئەی شین پۆشی کەمانچە ژەن، بمبەرەوە

وەکوو هەناسەی منو تۆ

لەشاری خەم نزیك نزیکم کەرەوە.

ئیستە لەوێ گەڕەك هەواڵم ئەپرسێ!.

شەقام چاوم بۆ ئەگێڕێ!.

کۆڵان بەدوامدا ئەگەڕێ!.

کۆستی تەتەر، بەهەردوو دەست

لەدەروازەی ماڵە کۆنەکەمان ئەدا.

ئیستە لەوێ سەیوانەکەم

چل نێرگزی شەهیدیتر ئەدا لەسەر.

چل کراسی هەڵاڵەی تر ئەکاتە بەر.

چل جووت گوارەی گوڵەباخم ئەکاتە گوێ.

لەسەر چل قووببەی هەیاسەی،

چل نقێمی سوور دائەنێ.

لەسەر سەری چل ئەرخەوان

چل چرا دائەگیرسێنێ.

چل مۆمی تر ئەسووتێنێ.

ئیستە لەوێ سەیوانەکەم

چل سوێسکە، چل چۆلەکەی

باخچەی خوێنم

لە یەکەم شەوی باوەشیا ئەخەوێنێ!.

ئاسمانێکی: خۆڵەمێشیی.

شەقامێکی: وەنەوشەیی.

تەنیایم: زەرد.

ئاوارەییم: تارمایی پەرت.

هەواڵ: ڕەش.. ڕەش!

ئێوارەیش: شین، وەك بەرگی تۆ

ئەی شین پۆشی کەمانچە ژەن!.

شیوەنیشم: مۆر وەك جەستەی

ئەو چل ئاسکەو

ئەو چل کۆترەن!.

**ده لۆ لۆ لۆ**

**لەمنی وشە سوتماکێ**

**لەمنی قەڵەم غەمناکێ.**

**ده لێ لێ لێ**

**لەمنی شیعر خەزانێ**

**لەمنی دیوان وێرانێ!!.**

ستۆکهۆڵم 1988/3/3

# دیدەنی

بۆ شەهید فوئاد سوڵتانی

وەکوو نێرگز ساڵی جارێ

بەسەردانێ

ئەو دێتەوە

بە زرێباردا دێتەوە

خەونەو لەپڕ پەیدا ئەبێ

ئەگاتە جێو ورد چاوێکمان پیا ئەگێڕێ.

لەو وەختەدا

ئێمە ئەڵێی دارستانی بنارینو

ئەویش لە لوتکەی سەر ئەچێ.

وەکوو ساڵانی ڕابوردوو

دیسانەوە ئێمە هەموو

وەك ڕەنگو ڕوو

مۆرانەی ساڵ یەك یەك بەڕەی

پێستی خواردوین

گلۆڵە بەنی قژیشی یەك یەك خواردوین
عومری خواردوین
تیاشماندایە
لەنێوانی دوو سەردانو
سێ سەردانی كاك"فوئاد"دا
سەعاتی دڵی ژەنگ ئەگرێ
وەك بورغوی كۆن بیری ئەسوێ
ئەبێ بە قەڵەمی زڕو
لە حەرفو وشە دائەبڕێ
ئەبێ بە هەوری نەزۆكو
یەك دڵۆپ بارانی نابێ!
وەكوو كەفە ژیلكەی سەر ئاو
هەر ساتێكەو ئیتر ئەوسا بزر ئەبێ.
ساڵێ جارێ ئەو دێتەوە
بەڵام ئەوكاتەی دێتەوە
چۆنمان دیبوو
هەر وەكو خۆی
سەعاتی دڵی وەكوو خۆی
قەدو ڕەگی
پێستو بەرگی
هەر وەكوو خۆی
بیری، قژی، عومری، چاوی

دەنگی، ڕەنگی، سمێڵەکەی هەر وەکوو خۆی!

ساڵی جارێ ئەو دێتەوە

لەناکاوێکدا.. دێتەوە

ئێمە هەموو، هەر هەموومان

شەپۆلمانو کەفە ژیلکەیش

بارانمانو شێرە کوللەیش

هەر لەدوور ڕا بە سێبەریا بەدیئەکەن ئەیناسنەوە

بەڵام کاك"فوئاد" بە تەنها

ئەو.. بەتەنها

هەموو ساڵێ

لەسەرانسەری نەخشەدا

دوو تاقممان ئەبینێتو

دوو تاقممان ئەناسێتو

یەك یەك دەستیان ئەگوشێتو

لەگەڵیاندا ئەدوێو ئەخواو پێئەکەنێو

ئەڕواتو دێ..

ئەوانەی وەختی خۆی نەیدیبوونوئیستە لێرەن

ئەوانەیشمان کە وەکوو ئەو

ماونەتەوەو، هەر بروسکەی خێرای ڕێگەن!

# تەم توومان

1985

یاران بە رشییەن جە زێد وە زامن

گرد تەفرەقە بین چون خەیاڵ من.

**مەولەوی**

# تەم toomAn

"بۆ هاوڕێم، شەهید ئازاد هەورامی"

ئەو ڕۆژەی شاخ، بێواز بێواز، لەبەر هەیوانی تەمەوە
سەروملی خوێناویی خۆی بۆ لەقانی!
لارە لارە، بەدەم کزەبای چرپەوە
نەهێنیی شەوی پێشمەرگەی لا درکانی!
کێ ئەیزانی؟! وەختێ هاتی
چ زوو هاتی!
دوای تۆفان بوو، گەردەلوولی ترسو بیمو،
تەم توومان بوو.
هێشتا زریکەی زەمینو قیژەی درەخت
وەك زریکەی هەڵدێراوی دایکانی گوند،
دایکانی شار لە "سەر" دا ئەزرنگانەوە!
وەکوو منداڵ هێشتا کانیی
ئەوقی ترسی بنی خۆی بوو!
دەربەند، ئەشکەوت، مەزار، باخچە

وەکوو.. گەورە، وەکوو ئێمە

گینگڵ.. گینگڵ

لە گێژەنی دووکەڵێکی پێچ خواردوودا ئەتلانەوە!

وەختێ هاتی پیرە دار بەڕووی شان شکاو،

هەناوکلۆر چاوانی کزی خۆرەتاو، ڕێی حەپەساو

لەسەر ملەو قەدپاڵەوە، سەرسام.. سەرسام

بە باڵای تۆی بچکۆلەدا ئەیانڕوانی!

کێ ئەیزانی

وەختێ هاتی.

کە گەیشتی

تۆ کە جوانووی مێژوویەکی

تازە تازە یاڵ دەرکردووی

ئاگرەکەی باباگوڕگوڕ بووی، زۆر بچووك بووی

تۆ ئەو دەمە

گەر خۆت گرمۆڵە کردایە

لەبەرچنە گەورەکاندا جێت ئەبۆوە!

تۆ ئەو کاتە

لە "دوانزەتیر" هەرتۆزێ هەڵکشاوتر بووی.

زۆر بچووك بووی.

وەختێ هاتی، تۆ ئەتتوانی

گەر مۆتەکە ئابلۆوقەت بات

لە سندووقێکی بۆراقدا، خۆت حەشاردەی، دابنیشی!

باریك.. باریك

وەك سەمەلی گوڵەگەنم.

هێور.. هێور

وەكوو كانیی.

كە تۆ هاتی، دوای تۆفان بوو، تەم توومان بوو.

یەكەم زستان لەسەر بەفری نوا باریوی پیٚدەشتو

بن بنارو گەوەی كوێستان، تاكو تەرا

چەند شوێن پێیەك بە دوای یەكدا

جێ پێی دۆڵپای نەهەنگەكەی

دوای نەورۆزیان هەلگرتبوو!

جێ پێكەی تۆیش گچكە.. گچكە

لەسەر بەفری نوا باریو.. بەرەو لوتكە

بلاو.. بلاو.. لێرەو لەوێ، دەركەوتبوو!

وەختێ هاتیتو گەیشتی

هەر یەكەم شەو

دەربەند"باسەڕە" پێی وتی:

ـ ئای چاوەكەم چ زوو هاتی

بەخێر هاتی!

⋆ ⋆ ⋆

ڕێ بردییتیو تۆیش ڕێگەت برد.

مەنزڵ .. مەنزڵ.

ئاو ئەوەندەی تۆی تینوو بوو.

نان ئەوەندەی تۆی برسی بوو.

لەدوای هەموو گەردەلوول‌و وەیشوومەیەك

وەکوو هیوا باڵات ئەکرد.

لەدوای هەموو کەڕە سیسەو بەفرانباریێ

ئازار بوویت‌و گەڵات ئەکرد.

لەدوای هەموو ئاژاوتن‌و غارکردنێ،

لەدوای هەموو چوڕچوڕەی ئارەق کردنێ

ڕام تر ئەبووی

یاڵت چڕتر

گەردنت ڕێك‌و بڵند تر

شانەی هەنگوینی بیریشت شیرینترو

پڕتر.. پڕتر

تا ڕێژنەی ئازار بەسەر

بەژنی تۆدا بباریایە

وەکوو شاخ‌و

وەك ڕانك‌و چۆغەکەی بەرت

ورەت کرژتر ئەبۆوەو ڕەگت جیڕتر.

* * *

ڕێ بردییتی‌و تۆیش ڕێگەت برد

هەندێ جار ئەو ئەیگەیاندی‌و

هەندێ جاریش تۆ بەسەر دیواری بەردا

سەرت ئەخست!.

ڕێ بردییتیو تۆیش ڕێگەت برد!

شەوی عاشقان درێژە

وەکو پرچی درێژو ڕەشی کوردستان

وەك هەناسەی بۆن نەوتاویی شەوی کەرکوك

وەك ڕیزە تابووتی شەهید

وەکوو پەتی سێدارەمان

شەوی عاشقان درێژە!.

ڕێ بردییتیو تۆیش ڕێگەت برد، کێلگە.. کێلگە

برین.. برین.. هەوراز.. هەوراز

هەر ئەڕۆیشتیو

بەهەردوو دەست

عەشقی ئەم خاکەت تۆو ئەکرد!

لەوەیشوومەکەی "هەکار"دا

تۆ لەپێش "با"وە ئەڕۆیشتی

پێش تەمەنی خۆت ئەکەوتی

لەدەراڵی کێوەکاندا،

لەبا پێچو لەبەر گێڵەی گەورەکاندا

ڕۆژی چەند جارێ بە مردن خۆی ئەگەیشتی!

لەدەوەنی قاچ تەزیوی "هەکار"ەوە

بووی بەداری "چەرماوەند"و

تۆ ئاوەها پێگەیشتی!

بەرد تۆی ناسیی، ئەو وەختەی کردت بە سەرین!

شەختە بە تەختەبەندی جیٚو

خووژە، گژوگیا، بەری تاڵ،

بە بابۆڵەی خوانی بەفرین.

شەوی عاشقان درێژە! "سیامەند"بووی

پشووی "سیروان" لەسنگتا بوو

تریفەی چاوی غەمباری منداڵانی ئەم وڵاتە

لە چاوتا بوو

تۆ زریانی ئەم مێژووە لەدەنگتا بوو.

شەوی عاشقان درێژە، تۆی سیامەند

ڕۆژانە هەر، شەوانە هەر

ڕێگەی "خەج"ی

لە خاچ دراوی عەشقێکی کوردستانیی

لەسەرتا بوو!

⋆ ⋆ ⋆

ئەو گەردوگوڵی بەیانەیش،

کە "سەگرمە"ت لەخەو هەستان

تۆ دڵنیاو، بەڵام گزنگ، دڕدۆنگ.. دڕدۆنگ

دوورونزیك شوێنت کەوتو لە گەڵتا هات.

ئەو ڕۆژەی تۆ تیشك بوویتو

لەجادەی ڤیر پەڕیتەوەو

لەگەڵ خۆتدا "کەرکوك"ت برد بۆ لای "ناوزەنگ".

ئەو ڕۆژە تۆ بوبووی بە ئەسپێکی سپی

کورڕن‌و حیلەت ئەگەیشتە گوێی "هەورامان"
تۆ ئەو ڕۆژە لەدۆزەخی ترس‌و بیم‌و
لەناو نەخشەی ئەوق بووندا
چنگ لەسەر شان مەترسی‌و مەرگت ڕاوئەناو
بووبووی بە کوڕی نێو داستان.

* * *

ـ ڕۆژباش.. کاکە ئازاد.. ڕۆژباش!
چاوت لێمە؟! گوێت لە منە؟!
لەدڵۆپی ڕوون‌و گەرمی چاوانی غەریبییمەوە
لەو پەنجەرە تەڕانەوە، وەك تیشکی دوای تەمێکی چڕ
سەرنج ئەدەم..
من لێرەوە، لەسەرچاوەی گریانێکی
ئەرخەوانیی بێدەنگەوە
بناوانی شیعری مەنگم وەکوو "نالی" هەڵبەستووە!
چاوت لێمە؟! گوێت گرتووە؟!
کاڵەو پێتاوت ئەبەستم، عەشقی زیوینت زین ئەکەم
بەم تەمەدا دێمەوە لات.. ڕێ دەرئەکەم
وەکوو جاران، لەوسایش لاوتر، ئەتبینمەوە.
ئەچینەوە دامێنی ڕیزە چیاکەی "چەرماوەند"و
لەسێبەری دارگوێزێکی کاکۆڵ پڕدا
وەك دوو ئاسك.. دوو پەلەوەر
تینوو.. تینوو.. چاوپڕتیشك بەیەکتری ئەگەینەوە.

ـ ئێوارەت باش.. کاکە ئازاد.. ئێوارەت باش!
لەبەرچاوی ئاوێنەمدا، وەك دوێنێ بێ،
وەك ئیستە بێئەوا ئێوارە وەختێکی
ژێر کەپرەکەی "کانی توو"ە
بۆنی خۆرنشینی سروشت،
بۆنی ئەوین، بۆنی هاوین
وەك بەرامەی میوەی باخی گەیشتووە.
ئەڵقەیەکین وەك گۆی بازن
دەوری عاشقی خاکمان داوە
وەك پوورە هەنگ، هەنگی قسە بەیەکدادێ
بۆ دوا بروسکەو دوا شەڕو دوایین شەهید
تا ماوەیەك وەك بەردی بن گۆم مت ئەبین.
هەتا "دلێر".. ڕێواسەکەی کەلی "پ.م"
مامە خەمەی شاخو چیا
کوڕی ئازار!
بە دەنکە قسەی هەناری ترشو مێخۆش
سەرە وشەو بنە وشەی هەندێ جار پس!.
ئاو ئەزێنێتە دەممانو ئەمانخاتە کەفەزگو
ئەوسا ئیتر پێکەنینمان وەك باڵندەی نزیك لوتکە
ئەویش ئەفڕێ.
وەك گێلاسی سەرکانیەکە، ڕوومەتی تۆ
بەو قسانە

لەهەمووومان ئاڵتر ئاڵتر هەڵ ئەگەڕێ!.

★ ★ ★

ـ شەوباش.. کاکە ئازاد.. شەوباش!
وەکوو "قەندیل" تۆی لەبیرە! لەبیرم دێ
بۆ یەکەم جار "مانگ"ی شیعر
لەسەربانی هاوینێکدا
لەبەر چرای تریفەیدا
هەردووکمانی بەیەك ناسان
تا کازیوە بە بادەی وشەی سەوزوسور
مەستی کردین.
بۆ یەکەم جار خۆشەویستیی شیعر
لەئاهەنگی دەنگی تۆدا
لەگەڵ "با"دا وەك دوو خونچە
چاومانی خستە هەڵپەڕین.
لەیەك کاتدا:
تۆ چەك بوویتو تۆ گوڵ بوویتو تۆ گۆرانیی.
لەیەك کاتدا:
سەرت سەری ئاسکە کێوی
چنگەکانت هی هەڵۆ بوون
دڵیشت کۆترێکی سپی!.
لەیەك کاتدا
تۆ باز بوویتو گیانی پەپوولەت تێدا بوو.

زریان بوویتو شنەی شەماڵت تێدا بوو.

تۆ بە باڵا دارچواڵە بووی

کەچی لقت بەڕووی ئەگرت.

تۆ شارەکەی کەرکوك بوویتو

کەچی بەفری هەورامانت، تیا ئەباری!

* * *

ـ ڕۆژباش.. کاکە ئازاد.. ڕۆژباش!

ـ بیرتان ئەکەم! ئەمشەو لەوێن شیعر بێنمو

بێم بۆ لاتان؟

چاوەکانت وەك دوو زنە

قوڵپیان ئەدا بە ئاوەڕۆی زەردەخەنە.

مەچەك تووکن، دەستت ئەخستە سەرشانم

پێت ئەوتم:

ـ شیعر چاوە

شیعر ئاوە

ئای کە تینووین بۆ بینینیو بۆ بیستنی

ئەو دیداری ئەستێرانە.

خۆتو شیعر بەخێرهاتن

سەرچاو هاتن!

* * *

هەر کە سێبەر وەك تەتەرێکی بەپەلە،

لەپڕێکدائەهاتە ناو دەربەندەوەو

بەقەڵەمباز جێی خۆی ئەگرت

لەپێش شارداو لەپێش گوندا
چرای بە ئێمە هەڵ ئەکرد..
تۆزێ زووتر! هەگبەکەم ئەدا بە شاندا
وەکوو کەستەك بەڵام قورس
سەربەرەوخوار ئەبوومەوە
لەپێچێکدا گەرووی دەربەند،
وەك پێچی چەم، قووتی ئەدام
شیعرو خەیاڵ، وردە وردە
وەك پرووشەی دەم باڕێزە، ئەیانبردم
ئەو وەختەی سەرم هەڵ ئەبڕی،
دێی "چالاوا"ی وشك‌و تینوو
بەو سەرەوە وەك لە خاچی شاخ درابێ
یان پشتاوپشت ڕاونرابێ، وا ئەیبینم:
خزاوەتە دەراڵی بەرز هەرچۆن بڕۆم تێم ئەڕوانێ.
هەردوو دەستم لەبەر کەلەکەو پشتێنداوهەناسە سوار
ئەبووم بە لقە داری "بی"و سەرئەکەوتم
لەوێ هێشتا گوڵی هەتاو زەرد نەبووەو
بەرد هەر گەرمە.
پشتێن شل‌و شەکەت شەکەت،
شلە شاریی، ئەگەیشتم
هەتا لەسەر تاشەبەردی بەردەمی دێ
ڕوو لە بەفری سەرهەڵەمووت

جگەرەکەم پێ ئەکردو دائەنیشتم!

* * *

وا دەرکەوتن.. گوڵە جەرگە پێشمەرگەکان..

وا دەرکەوتن

تاك تاك جووت جووت

ڕەوە ئەسپی ئەم دۆڵەن‌و وا دەرکەوتن

وەك هەلاڵە

ڕووگەش ڕووگەش

یەکە یەکە لەپەنجەرەی چاویانەوە

ئەیانخستمە پشتیەوانی دڵیانەوە.

* * *

ـ ئەی گوڵە جەرگی پێشمەرگە ئێوارەت باش!

ئێوارەت باش.. کاکە ئازاد.. ئێوارەت باش!

شەوی شیعرو پێشمەرگەیە

شەوی جریوەی وشەیە.

لەدالانێکی درێژی لایەك بە نایلۆن گیراودا

بەدوو ڕیزی ئەمبەر ئەوبەر بەرامبەر یەك

بە چوار مشقی گوێ قوت گوێ قوت دائەنیشتن.

شەوقی تیژو ئێجگار سپی،

لۆکسی سەر تەنەکەیەك

سێبەری سەرو ملمان‌و لوولەی چەکیان

بەدیواری ئەو بەرەوە

چەند کەڕەتێ گەورە ئەکرد.
دوو ڕیزە چاوی کێوی بوون زیتو ورد ورد
لە چاوەڕوانیی کەشکۆڵی هەگبەکەمدا
لەچاوەڕوانیی بارانی هەگبەکەمدا
تروکەی خۆیان مت ئەکرد!
دوو ڕیزە چاوی کێویی بوون
لە بریسکەی گلێنەدا، لە تەمومژی سیمادا
نەخشەی ئەنجنو پایزی دەم بەبزەی
کوردستانت بەدی ئەکرد!

* * *

کە وەختێکیش شیعرم ئەفڕی
دڵی تۆ یەکەم دڵیان بوو
ئەبوو بە شینایی ئاسمان.
چاوم لێ بوو:
لە هەڵقرچانی وشەدا: هەڵ ئەقرچایت.
لە داچڵەکینی وشەدا: دائەچڵەکیت.
لە شەهید بوونی وشەدا: چاوت ئەسڕی.
لە گاڵتەوگەپی وشەدا: پێئەکەنیت.
شەوی شیعرو پێشمەرگەیە، وەکوو پ.م
شیعرم ئەڕۆی.. ڕەوەز.. ڕەوەز
دۆڵ بەدۆڵو لوتکە لوتکەو پێ دەشت پێ دەشت
وەکوو ئەوان شیعر خۆی ئەکرد بە شاردا

وەکوو ئەوان لە کەمیندا شەهید ئەبوون..

بۆیە ئیستەیش لەدیواندا

شیعرم هەیە وەکوو پ.م دەستێکی بڕڕاوەتەوە

شیعرم هەیە وەکوو پ.م قاچێکی بڕڕاوەتەوە

شیعرم هەیە وەکوو پ.م چاوێکیانی لەدەست داوە!.

هەر دانیشتوویتو هەر شیعر ئەجریوێنیٚ.

درەنگانیٚ کە وەختێکیش

لەسەفەری دووردرێژ ئەهاتنەوە

هێدی.. هێدی.. ئەنیشتنەوە

چاوم لیٚ بوو

ئەو چاوانە

یەکەم چاو بوون

بۆیان ئەبوون بە هێلانە!

* * *

لەکۆچدا بووم، کە "با"ی ژەهراوی پەیدا بوو.

ڕەنگو ڕووی ئاسمانی گۆڕی،

دارستانوچیاکانی ڕشانەوە.

لەویٚ نەبووم کە گەردەلوولی کیمیای بۆندار،

بیٚ بۆن بە لوورە لوور

لەبەغداوە بەرەو هەناسەی کوردستان،

هەڵیکردوو هەرێم هەرێم هاتە سەرتان.

لە کۆچدا بووم، کە"شێخ وەسان" بۆ یەکەم جار..

پیره گوندی ڕیش سپی من، باپیرەی من
خۆیی‌و سەد نەوەی زیاتری، کوڕو کچی
خۆیی‌و سەد جۆگە زیاتری، لق‌و چڵی
فریای قسەیەك نەکەوتن.
فریای خوڕەیەك نەکەوتن.
فریای لەرەیەك نەکەوتن.
بەڵام چۆن بوون ئاوا کەوتن، ئاوایش نووستن!
لەکۆچدا بووم، قاچم ڕەگ بوو لای ئێوە بوو،
سەرم لێرە.
لە کۆچدا بووم، تۆ لەوێ بووی،
کە "هەڵەبجە" شاری چاوم.
هەنارەکەی سەرلقی دڵ، گوڵەزەردی دەشتی ڕەنگم.
زەڵمی دەنگم. هەڵەبجەکەی خاتوو عەنبەری مەولەوی.
ژنە شۆخی خەزێم لە لووتی شارەزوور.
دایکی "نالیی"
خنکاو نەگەیشتمە سەر سەری!
ئەوڕۆژانە لەوێ نەبووم، ئێوە هۆرە بوون،
لەوێ بوون.ئێوە "گوڵان" بوون
لەوێ بوون "شنروێ" بوون‌و لەوێ بوون.
ئێوە هەناسەی سینەتان
هەوای ژوورتان
هەوای دەرتان

لێتان بووبوون بە خوێنە خوێی شەوەی مەرگو
کەچی تا بەرد، هەتاکوو دار
هەتاکوو ئاو، لە پاڵتاندا شەهید نەبوون
هەر نەبزوتن!
لەسەفەری ئا ئەم عەشقە مەزنەدا
لە سووتانو هەڵقرچانی ئەم فەرهادو شیرینەدا
لەسەفەری ڕێی نەهاتی ئەم تۆفانو
باوبۆرانو ڕۆژمێری کۆچانەدا
ئا لەم ڕەشەبای ژەهرەدا
ئەی گوڵە جەرگی پێشمەرگە!
دوانزە ساڵە لەکوێ نەبوون؟!
کە وەختێ بەرد لەسەرمادا ڕەق ئەبۆوە
تۆ لەوێ بوویتو بەهار بوو.
ئەی سەمتوورە ئێسك سووکە دەنگخۆشەکە
ئەی باڵەبانی هەورامیی!
وەختێ ڕووبار لە ترساندا بەرەودوا ئەگەڕایەوە
هەر لەوێ بوویتو بەرەوپێش، بەرەو زەریا،
تۆ ئەڕۆیشتی!
وەختێ خۆرەی نائومێدیی ڕۆژانە زۆر دڵی ئەخوارد
تۆ شەوانە
کرمی ئاوریشمی قۆزاخەی هیوا بوویتو
هەر لەوێ بووی.

له خەریتەی ترس‌و ژەهرا
له چوار وەرزەی کۆست باراندا
تۆ پێم بڵێ! ئەی عاشقه چاو ڕەشەکه
لەکوێ نەبووی؟!
ئەی عاشقانی هاوڕێ
دەپێم بڵێن
لەکوێ نەبوون؟!

* * *

ـ شەوباش کاکه ئازاد شەوباش!
تۆ پێم بڵێ! توخوا ئیستەیش
لەشەوانی مانگه شەوی کەژوهەردا
که تەنیایی دەستت ئەنێته ژێر چەناگەی بیرەوەری‌و
وەختێ خەیاڵ بەقەد سێبەری شاخەکان گەوره ئەبێ.
درەنگانێ که دەشت‌و دەر ئەبن به مافووری زیوو
درەنگانێ که خشەخشی گەڵایەك،
بەتاریکیی حەشار نادرێ‌و ئەگاته گوێ.
درەنگانێ که مانگ وەکوو شاژنێکی ئەگریجه زەرد
به پلیکەی کێوەکاندا هێدی هێدی دێته خوارێ‌و
لەسەر شەخته بەندی ڕنوو ڕائەکشێ.
درەنگانێ که بەهەتوانی تریفه برینی خاك
ئارامێکی تێ ئەگەڕێ‌وکەمێ چاو لێك ئەنێ!
تۆ ئەو کاته، وەکوو ئەوسا،

وەکوو شەوانی "هەرمێلە"

بە جووت لەگەڵ "تارە" کەتدا دێنە دەرێ؟!

ـ شەوی تۆیش باش! وشەی نامۆ!

ئەی هاوڕێ!

چیت پێ بڵێم!

لەو ڕۆژەوە کە دوو بە دوو

بۆ دوا ماچی ماڵ ئاوایی

باوەشمان کرد بە یەکترداو ئەوسا ئیتر چرۆی چاومان

چەند پەپوولەیەك فرمێسکیان لێ هەڵفڕی!.

لەو ڕۆژەوە کە تۆ بەرەو پایزە ڕێگەی غەریبیی

ڕۆشتیو وەکوو چڵە داری

شەپۆل شەپۆل ئاوی شیعرو

زەمانێکی تووش بردیتی!

لەو ڕۆژەوە ئەی هاوڕێ!

هەتا ئیستە

سەعات لەدوای سەعات ئێرە

چرکە لە دوای چرکە ئێرە

وەك ئاسمانی، کۆستی داری، کۆستی بەردی

کۆستی ئاوی، هەتاکوو بێ

گەورە گەورەو گەورە ئەبێ!

ئەو ئاسمانەی کەتۆ دیبووت پڕ جریوە

ئیستە خەزانی ئەستێرەو گەلاڕێزانی تریفە

سەرانسەری داپۆشیوە.
"مانگ"ی شیعرت
وەك هەڵەبجە
بێوەژنێکی ڕەشپۆشی گۆنەو پەنجە هەڵوەریوە!
چیت پێ بڵێم!
دوای تۆ سەردەمی ژەهر بوو!
سەردەمی "با" ی کیمیایی‌و
شەهیدانی بێ زام‌و خوێن.
ـ بیستم گۆیژەی سلێمانی‌و ئاگری
بابە گوڕگوڕت بردبووە لای شیعری خانیی
بیستم شاخی هەورامانت
گەیاندبوو بە بادینان.
بیستم لەگەڵ "مەم"ی ئەوێ
دوو گەرووتان کردبووە یەك
دوو سەنگەرتان کردبووە یەك
دوو تفەنگتان کردبووە یەك
خەونی دێرینەی ـ لاوك‌و حەیران ـ ی ئەم
وڵاتەتان هێنابووە دی!
ـ تەنها زەردەخەنەی لێوی
ئەم ڕۆژەمان هەر ئەوەیە!
تەنها تروسکەی چاوانی
ئەم شەوەمان هەر ئەوەیە!

ـ ئەم تەمو مژە ئەستوورە

تاریکە، تاریکە، تاریکە!

ـ بەڵام خۆت سەرمان ئەناسی

ئاگردانی چ ئاگرێکە

هەتاکوو مۆمی پەنجەیەك لەم تەمەدا داگیرسابێ

هەتا کونی هەناسەیەك ئا لەم ئاسمانەدا مابێ

ئێمە لێرەین

خۆتۆ خۆت چاومان ئەناسی.

هەر ڕێگەکانی "قەندیل"ین

تا بن بەردێ

تا جێ گۆڕێ

لێرە هەبێ، ئێمە لێرەین!

⋆ ⋆ ⋆

ـ ڕۆژباش داروبەردی وڵات ڕۆژباش!

شەوباش ئەی "مانگ"ی شەهیدم شەوباش!

کلاوکوڕەیەکم نامۆ! بۆ هەڵەبجە، بۆ بادینان،

بۆ ئەو، بۆ تۆ

لەم کۆتەڵ و کۆستانەدا.. ئا لەم ژەهر بارانەدا،

من لێرەوە

لە باڵەفڕێی گریانێ بەوەلاتر چیم لەدەست دێ!

تەماشاکەن! قەڵەمم برژانگی تەڕو

گەرووی وشەکانم نووساو،

من لێرەوە، لەهۆنینەوەی پرچی خەم بەولاوەتر،
لەلاواندنەوەی شەوانەی خەو زڕاوم بەولاوەتر
چیم لەدەست دێ.
ئەوە هەر دوو نیگاکانم
وەك دووکانیی بناری تۆن.
ئەوە سەرم هەر وەکوو پەڵە هەورێکی ئاسمانی تۆن.
من لێرەوە
لەخەو بینین، لە ئاوڕدانەوەی ئەسرین
لەپەنگ خواردنەوەی هەنسکم بەولاوەتر
چیم لەدەست دێ.
لەم بیابانی گیانەدا
لێرە کێ گوێ لەشیعر ئەگرێ!
نەك هەر نەهەنگە گەورەکان
لەناو دنیای ڕەوشت لەگرێ ژەنەچووی
شەرواڵ کەسیفی ئەمڕۆدا.. لێرەو لەوێ
لە جیهانی ئاڵو گۆڕی نەوتو خوێندا.. لەم لاو لەو لا
کێ گوێ لەقیژەو زریکەی مێژووم ئەگرێ.
ئەم دنیایە هەمووی قەپاتمەی زل هێزەو
کێ گوێ لە هەڵەبجە ئەگرێ!
نەك هەر نەهەنگە گەورەکان
لە جیهانی سوزەنکاویی ئەمڕۆدا
هەتا برینی ژێر چەقۆی وەك خۆم هەیە

لێرەو لەوێ
شێوەی ئازارو فرمێسکمان لەیەك ئەچێ
پشتی ڕێ ڕێ بووی هەردووکمان لەیەك ئەچێ
ئەویش وەك من ئاوازێکی ئاوارەیەو
بۆ عەشقی خاك.. بۆ عەشقی ئاو
شیعری وەك قەقنەس ئەسووتێ.
کەچی.. کەچی.. کەچی
کە دێتە سەر سووتانی من
بۆ ناوهێنانێکی شاری شەهیدی من
وەك کیسەڵ ملی ئەباتە قاوغەوەو
ئەبێ بە کورسیەکەی ژێریو
بێ دەنگ.. بێ دەنگ.. بێ دەنگ ئەبێ!

* * *

ـ بەیانیت باش کاکە ئازاد بەیانیت باش!
ئەی ئیستاکە لەگەڵ پایزی عاشقی ئەم کوردەدا
دوا مەنزڵت بردۆتە کام تازە هەوار؟!
ئەی برینە ڕەوەندەکە!
بەم باڕێزەو بەفرانبارە، لە کام هۆبەی ئەوینی تۆ؟
لە دەوری کام کلّپەی ئاگر
وەك هەڵۆی تەڕ ڕاوەستاویو
هاڵاو لەبەژنت هەڵ ئەسێ؟!
لە "لێوژە"یت

یان لە دوندی  "کونەکۆتر"؟
لەگەڵ کۆڵە پشتو تارو چەکەکەتا
شۆڕشت بردۆتە کام شاخ؟
ئیستە لەکوێ؟ لەپەنا کام گاشە بەردا
ڕواویتو بووی بە گێلاخ !
کام ڕەنگی پەڵکە ڕەنگینەی
سەروبەستی چیاکانی؟
سەوزی؟
زەردی؟
نارنجیت یان هەر سوورێکی ئاودامانی؟!
ئەبێ ئیستە تۆ چنوری کام کاروانی هەورامان بی؟
بووبی بە کام کۆترە شینکەی سەر پلەی بەرز؟
ئەبێ ئیستا لەبەر بەرۆچکەی هەتاوی
گوێ ئاواندا
لەگەڵ کام شەهیدا بدوێی؟
لەگەڵ کامیان دانیشتبی؟
لەم تەمو مژە چڕەدا
لەم شەوە تارومارەدا
من ئەزانم تۆ ئیستاکە
لایتی دەستی پێشمەرگەی گەرمیانی!
من ئەزانم تۆ بەیانیان زوو شەبەقی لە کەرکوکدا
کولێرەی گەرمی سەردەستی

دایکێکی تازە ڕەشپۆشی!

ئێوارانیش تۆ تیریێژی

لاکسی تیشکی مژدەیەکی

شاقوڵی بەرەو زیندانی!

من ئەزانم تۆ ئیستاکە نیگای قەڵەمی

سەر ڕێگەی گوڵ ئەستێرەی شیعری شاری!

وا گوێم لێیە

ئەی برینە ڕەوەندەکە

لەدەربەندا بووی بە قاسپە

لە ناو چەمدا بووی بە هاژە

لە زینداندا بووی بە چرپە

لە بێشەدا بووی بە وژە!

بۆت ناگەڕێم,

ئەی درەختە ڕەوەندەکە، بۆت ناگەڕێم!

کە تۆ هاتی

تەم توومان بوو، دوای تۆفان بوو

کە تۆ هاتی، وەختێ گەیشتیتە قۆپی

وەختێ یەکەم داربەڕومان بەخێرهاتنی لێ کردی

تۆ ئەو دەمە

زۆر بچووك بووی

لە "دوانزە تیر" هەر تۆزێ هەڵکشاوتر بووی.

بەڵام وەختێ ئەی ئەوینە ڕەوەندەکە

باڵت گرتو" کونەکۆتر"ت بەجێ هێشت

قۆڵ لەقۆڵدا

بەجووت لەگەڵ پەری خانی مێژوماندا

تیژڕەو ڕۆشتی!

چاوم لێ بوو، کە ئەمجارە

بەبەرزایی

سنەوبەرێ دوو سنەوبەر

تۆ لە "قەندیل" بەرزتر بووی!.

بۆت ناگەڕێم، بۆ بگەڕێم؟! کەتۆ ئیستە

هەر ئەوەندەی:

دووریی نێوان فرمێسكو ژووری گلێنەم

دووریی نێوان قەڵەمو سەرلقی پەنجەم

دووریی نێوان سیەکانمو هەناسەم

لەمن دووربی!

بۆ بگەڕێم؟! بۆت ناگەڕێم!

ئەی عاشقە نەمرەکە!

ستۆكهۆڵم 1988/12/20

## ژەهر

ـ 1ـ

بەرەو کوێ ڕەو ئەکاو؟ بەرەو کوێ مل ئەنێ

کاروانی ئەم گریەو کۆتەڵە؟!

ئەم کۆستە لە کوێدا تروشکە ئەکاتو؟

لە کوێدا سەر ئەنێ بە سەری وەرزێکی ترەوە

ئەم کڵپەو دووکەڵە؟!

مارت وایە! مانگێکە فەرهاد کوژ!.

مانگێکە لە چاڵی سەرڕێژی" سیو یەکەی"

ڕۆژگارو شەوگاری سینەیدا

زوخاوی هەر هەموو ساڵەکەی تێدایە!.

ـ دووچاوی بایەقوش

لەچاوی پەنجەرەی ئەم مانگە ناتروکێ!

ـ ئەی پەپووی هەڵنیشتووی

سەر بەختی کۆتەرەو سوتماکم هەڵفڕە

هەڵفڕەو هیچ نەبێ بۆ ساتێ کاولاشی

ئەم لەشە زوخاڵەم جێ بێڵە!

ـ مانگی شووم: هێلانەی داری زڕ ولاتیو

هەوای کوێر هاودەمی‌و

خۆڵەمێش بەرووبووم.

مانگی شووم.

مانگی شووم.

مانگی شووم.

* * *

سەرەتای هەتاوبوو، سەرەتای پێکەنین

بەیانیی دەستی خۆی وەك دایکم

دایە دەست برینم!

سەرەتای گزنگ بوو، سەرەتای پشکوتن

کێوەکان لە قژو لە ڕیشی "مەولەوی"

تاجێکیان بۆ چنیم، کردمە سەر برینم.

بووکێنیی بەهاربوو

بووکێنیی گۆرانیی

بووکێنیی هەموو شت

ئەوەندەو لە پڕدا، گرمەیەك، دووکەڵێ.

ئەوەندەو بۆنێك‌و کپ بوونێ.

ئەوەندەو هەموو شت بوون بە بەرد.

ئەوەندەو خوا لاڵ بوو.

ئەوەندەو مێژوویەك لاربۆوەو لەسەردەم

کەوتە سەر زەمینی شەهیدم!.

ـ ئەوێریی؟ لەبەردەم ئەم تەرمی "خەزاڵ"ی خۆرەدا

بوەستیو سەیری کەیت؟!

چاوی تۆیش وەك چاوی "کاکە لاس" نامەییَ؟

ئەوێریی لەبەردەم ئەم تەرمی شارەدا

بوەستیو سەیری کەیت؟!

وەکوو ئەو ڕەق نابێ باڵای تۆیش؟!

ئەوێریی تەماشای مێژووکەیت

کەوتبێو چاوی زەق؟ ئەوێریی؟

زات ئەکەیت بچیتە کیشوەری مەرگەوە؟

زات ئەکەیت باوەشی پێدا کەیت؟

ـ ئەلەرزم.. ئەلەرزم.. ئەلەرزم!

ناوێرم بڕوانمە ئەو نوورە شەهیدەی

کە لەسەر تەوێڵی "مەولەوی" کەوتووەو

دووچاوی کۆچێکی بێ وادەم تێ ئەبڕێ!

ئەلەرزم.. ئەلەرزم!

من بوومەلەرزەی خاك.. گرتوومیو

وەکوو حاڵ، عەشقی ئەو ئەمگرێ!

★ ★ ★

ئەم هەموو کۆستانە لە کوێدا دابنێم؟

گلۆڵەی ئەم هەموو ژانانە لە چیدا هەلگرم؟

ئەم زەنگی زریکەو قیژانە بەرمە کوێ؟

پلێڵەی ئەم هەموو فرمێسکە؟

گەردانەی ئەم هەموو هەنیسکە

به چیدا هەڵواسم؟
من بەچی بەستەکی ئەم هەموو ژانانە شەتەك دەم؟
جانتای شاخ سیخناخە!
بوخچەی هەرد نایگریٚ!
پریاسکەی پیٚ دەشتیش شیتاڵە!
لەکویٚدا دایان نیٚم؟ سەیرکە:
ئەم هەموو بارانە کوژراوە.
ئەم هەموو شەپۆلە خنکاوە.
ئەم هەموو ئەستیٚرە پژاوە.
لەکویٚدا بنیٚژم؟
چ خوایەك دەست دیٚنیٚو ئەم سەرە بڕراوەم هەڵگریٚو
بیخاتە کۆشیەوەو، ڕەگ بە ڕەگ،
خویٚن بە خویٚن , ژیٚ بە ژیٚ بیدویٚنیٚ؟!
ـ دیٚوەکان ئەمجارەیش خۆریٚکی دایکمیان لەبار برد!.
دیٚوەکان ئەمجارە لە فڕگەی هەر هەموو دنیاوە
لە فڕگەی نەوتەوە.. لە فڕگەی سنگمەوە
فڕینو هاتنو بارانی
دۆزەخیان بەسەردا بارانم.
هاتنو تاعوونی هەوایان بەردایە ئاسمانم.
هەناسەی سینەمیان کلیل دا
بە ژەهر سواغیان دا.
دیٚوەکان!

دێوەکان!

دێوەکان!

ـ تا هەوا نەبوو بوو بە کێڵگەی ژەهراویی ئاسمانم.

هەتا ئەو نەچووبووە هەناسەی پێ دەشتو چیاوە.

هەتاکوو دێوەکان ئاسمانی کیمیای

خۆیانیان ڕانەگواست بۆ سەرمن،

هەناسەی خنکاومیان نەدابوو بە بەغدا

تا سەری خۆیانیان بۆ نەکرد بە کارگە.

تفەنگی تاکە باڵ، سەنگەری بە پێوە وەستاوم

ئازایی ئەم خوێنە بێکەسەم

هەموو ڕۆژ لەو چیاو دۆڵەدا

وەك چەقەڵ مردنیان ڕاوئەنا!

ـ کە زەمین ئەکوژرێ!

کە ئاسمان ئەکوژرێ!

ـ ئەڵێی چی؟ ئەی عەشقی سەرگەردان..

ئەڵێی چی؟! چۆن زەویی ئەکوژرێ؟

سكوزای ئاسمان چۆن لە بوونی پرشنگو

ئەستێرەی تازەتر ئەکەوێ؟

بایەقووش! مانگی شووم!.

ترسی تۆ

لە تەمە گومانی بەرچاوتا

لێڵو پێڵ، وێنەیان ئەکێشێ

ئاوڕێ بەرەوە:
ئەوەتا دوای ژەهریش تاك.. تاكە
سمۆرەی سەرداران دێنەوەو
لەبەردا، خەمیتر ئەپشكوێ!.

ـ 2 ـ

گۆڕستانی ئەم مێژووە
دارستانی بەردەكێلی، بێشەی فرمێسكو هەناسەی
قەت ئەمەندە چڕ نەبووە.
بە درێژایی ئازارو بە پانایی دەربەدەری‌و
بە ئەستووری چەوسانەوەو بە قوڵایی نائومێدیی
قەت ئەوەندە ئەم نەخشەیە
ئەم سیما پەراگەندەیە
چاوی كزو جەستەی ئاوا سڕ نەبووە.
ئەم مەلانە
قەت ئەوەندە
باڵی ئاسمانیان نەكراوە.
ئەم ئەسپانە
قەت ئەوەندە كوڕژنیان زیندان نەكراوە.
ئەم بەردانە
قەت ئەوەندە
پێی نەیاریان پیا نەنراوە.

ڕێ نەبوو. پرد نەبوو. دەس نەبوو. کون نەبوو.

نەفریشتەو نەپەریو نە ئاهورامزداو

نەخواکانیی کۆنو تازە.. هیچیان نەبوون

هەرخۆمو خۆم

خۆمو دارو خۆم بەردو

خۆمو ژانو خۆشەویستیم.

ـ ئەبوایە هەر شیری لوتکەم

لە کێلانی ئەم زامانە هەڵکێشایە.

بەردم وتی:

من نامەوێ بە چیچکانەوە وردم کەن.

ئاوم ئەی وت:

من نامەوێ بە نوستوویی سەرم ببڕن.

باڵدارەکانم ئەیان وت:

نامانەوێ بە هەڵکوڕماویی ڕاومان کەن.

چەکەکانیشم ئەیان وت:

ئێمەیش نامانەوێ سەربەرەوخوار بژین.

ـ ئەم چیرۆکە:

بەر لە زاووزێ کردنی ژەهر

بەر لەدڵ تێکەڵهاتنی هەورو ئاسمان

بەر لە بۆنکردنی چیا.

بەر لەوەی کە:

کفن دزانی "مەولەوی"

مناره کورته باڵاکان

زۆڵه گولله..

به مردویی بازنی دەستو موستیلەی

"عەنبەر خاتوون" دابکەنن.

به مردویی نقێمی چاوی هەڵەبجه دەربهێنن.

به مردویی لاقەی مانگی کوژراو بکەن!.

ئەو چیرۆکه خوێناو خوێن ئەگێڕرایەوه

ئەو داستانه ژان بەژان ئەنوسرایەوه.

* * *

خوێن شایەتمە: ئاو شایەتمە، نان شایەتمە:

سەنگەرەکەم له پێش خۆمدا شەهید ئەبوو

ڕام نەئەکرد.

تفەنگەکەم، مەتارەکەم له پێش خۆمدا

له تینۆتیدا ئەخنکان.

ڕام نەئەکرد.

نانەوردەی بن گیرفانم له پێش خۆمدا

له برسانا ئەمردنو ڕام نەئەکرد.

* * *

قیمەکێشی سەر ئەم لەشه هەر که زانیی

من خەریکم ئەو کول ئەکەم!.

سێدارەکەم، کاتێ زانیی

من خەریکم ئەیخنکێنم!.

**پێوەندەکەم کاتێ زانیی من خەریکم**

**پێوەندی کەم!.**

**زیندانەکەم، وەختێ زانی، من خەریکم**

**ئەو حەپس کەم!.**

**جەللادەکەم وەختێ زانیی:**

**زام لە دوای زام**

**سەنگەر لەدوای سەنگەر وەکوو:**

**لاسکی لاولاو خێرا خێرا بالاّ ئەکەم.**

**دلۆپ دلۆپ وەکوو تێزاب دائەدەمو کونی ئەکەم.**

**بووم بە گڕو بست لە دوای بست**

**بەناو لەشیا ئەتەنمەوە.**

**وەختێ زانیی:**

**شەقام شەقام، کۆلاّن کۆلاّنو ماڵ بەماڵ**

**بووم بە گلۆپ**

**بووم بە چەترو، بووم بە گەنمو**

**بووم بە بێشکەو**

**شیری منداڵ.**

**ئەوسا ئیتر هەوای ژەهراوی قەرز کرد.**

**لە عەمباری دێوەکاندا**

**ئاسمانی پێش چل ساڵێکی**

**"هێرۆشیما"ی کڕیو.. بار کرد**

**نەفەس.. نەفەس**

لەسەر سەرم

بەرەڵڵای کرد.

خەزانی بەرد

خەزانی ئاو

خەزانی گیان.. دەستیان پێکرد!

* * *

ئەمە سەرەتاو کۆتایی مێژوویەکیتری شاخ بوو

ئەمە دۆزەخێکی دیکەی

عەشقی شیرینو فەرهاد بوو.

ئەمە پەندی وەرچەرخانەوەی ڕووبار بوو

جارێکی تر بۆ سەرچاوە

ئەمە پەندی گەڕانەوەی هەزاران هەنگاوی دوێ بوو

بۆ سەرەتای ڕێیەکی تر

ئەمە پەندی کوژانەوەی ئاگرێ بوو

بۆ دیسان هەڵگیرسانەوەی

زۆر ئاگرو مەشخەڵی تر.

ـ ئەی تۆ چیت کرد؟!

ـ ئەگەر هەموو خواوەندەکان

بەخۆیانو باوبۆرانو خۆریانەوە

بە ئەسپی باڵداریانەوە

لە بەیانیی ئەو ڕۆژەدا

لە "شێخ وەسانان" بوونایە

چۆن زۆرانیان لەگەڵ هەوای زەردا ئەگرت؟
چۆن باوەشیان بەناوقەدی ژەهرا ئەکرد؟!
ـ ئەگەر هەموو پێغەمبەران
پێشمەرگەی ئێمە بوونایە
لەبەیانیی ئەو ڕۆژەدا
لە "هەڵەبجە"و "گەلی بازێ"دا بوونایە
چییان ئەکرد؟
ـ وتمان: کرم. وتمان: کوللە. وتمان: چەقەڵ!.
ـ قەدی ئەم دار گوێزە پیرەی خاکم
لق‌و پەلی، گەڵای چڕی
بەبێ کرم‌و پواز ئەبن؟!
ئەم دەغڵ و دانی مێژووە
دەشتی ئەم لەشە تینووە
بەرگی بەری ئەم شاخانە
چۆن بێ کوللەو بێ مۆرانەو خۆرە ئەبن!
گوێ چەمی ئەم شۆڕشە دووردرێژە
کەلاوەی ئەم ئازارە داڕوخاوانە
قامیشەڵانی ئەم هەموو کارەساتە
چۆن بێ چەقەڵ، چۆن بێ پەپوو
چۆن بێ مارومێرو ئەبن!
ئەو کرمە هاووڵاتیانە
ئەو کوللە هاوزمانانە

ئەو چەقەڵە هاوڕەگەزو هاوخوێنانە!

لە داری تری دنیادا

لە دەغڵی مێژووی دنیادا

لە چەمی خوێنی دنیادا

بە ژمارە

لە کرمی دارگوێزەکەی من

لە کوللەی دەغڵی مێژووی من

لە چەقەڵێ ناوچەمی من

زیاتر بووبن، کەمتر نەبوون.

* * *

گەر گیرفانی نەوتت هەیە.

گەر گیرفانی گازت هەیە.

با جرج بی

با مشك بی

با کرم بی

وەك سابرێنە شێخەکانی دوورگەی عەرەب

ئەتوانی سمێڵیشێری هەموو دنیا بۆخۆت بکڕی

گەر گیرفانی نەوتت هەیە

گەر گیرفانی گازت هەیە

لەجێی خۆتەوە ئەتوانی دەست بەریتو

لەسەر ئالاّی ڕۆژئاواوە

ئەستێرە داگریو بیکڕی.

خۆت نەچیتو بە تەلەفۆن
لەناو سەری ڕۆژهەڵاتدا
چەند ژوورت ویست، بەکرێی بگری.
گەر گیرفانی نەوتت هەیە
گەر گیرفانی گازت هەیە
ئەتوانی قوڕگی "ماو" بکڕی
پێکەنینی "کاسترۆ" بکڕی
دەستو پەنجەی "میتران" بکڕی
هەر دوو مەمکی "تاتشەر" بکڕی!

★ ★ ★

ئەوینی ئێمەو سەربەستی.
سەری ئێمەو ئەم بەردانە.
نێوان ئێمەو ئەم ژانانە.
پەیوەندیمان لەگەڵ هەورا
خۆزگەمان لەگەڵ بارانا.
هاتوچۆمان لەگەڵ هەموو ئازارێکی نێو جیهانا
لە زووەوە کەوتوونە ڕێ
لە زووەوە ئەم مێژووە ڕائەهێنین.
لە زووەوە سنگی ئێمەو سەری سونگی یەك ئەناسین.
گوللەتۆپو کاسەی سەرمان
پەتی سێدارەو گەردنمان یەك ئەناسن.
لە (میك)ی بیستویەکەوە، زۆر بەرزتر

شەهیدانمان، حەزیان بە فڕینی گیانی
بەرەو ئازادیی کردووە.
لە بۆمبای فسفۆڕیەوە
ئەم ئەستێرەی برینانە
بەردەوام ئەدرەوشێنەوە.
لە بۆمبای "عنقودی" یەوە
ئەم خاکە هەر هێشوو، هێشوو شەهید ئەگرێ.
لە بۆمبای" ناپاڵم"ەوە، ئەم عەشقە
هەر قووڵم ئەکاو ئاوی تازەم لێدەردێنێ.

★ ★ ★

ئەم زەمینە باڵۆنێکە لای دێوە سیحربازەکان.
بیانەوێ فوو ئەکەنە دەشتەکانیو ئەیئاوسێنن.
نەیانەوێ کێوانی فش ئەکەنەوە!.
بیانەوێ دەمامکێ ئەکەنە سەر گوێدرێژێو
ئەیکەن بە ئەسپ
نەیانەوێ ئەسپێ ئەکەن بە گوێ درێژ.
بیانەوێ تف ئەکەنە جۆگەی وشكو
ئەیکەن بە زێ.
نەیانەوێ ڕوباریش وشك ئەکەنەوە
هتدد.. هتدد.. هتدد.
ئەم زەمینە باڵۆنێکە لای دێوە سیحربازەکان
ئەم دێوانە

گیرفانیان قیبلەنمایە

قیبلەنما ئەگەڕێن‌و وەرئەچەرخێن

لەهەرکوێ بن ڕوو ئەکەنە قیبلەی خۆیان

ڕوو ئەکەنە بانق‌و بازاڕ

چاو ئەبڕنە چاوی زێڕو

دەس ئەکەنە ملی دینار

قیبلەنما ڕووی لە کوێ بێ، داد لەوێیە

ماف لەوێیە، چارەنووسی عەردوو ئاسمان

هەر لەوێیە!

با ئەو دادە لەسەر کورسی ئێسکی مێژووم دانیشتبێ.

با ئەو مافە بە ڕمی خۆی کەللەسەرمی هەڵگرتبێ.

با ئەوبانقە سەرچاوەکەی خوێنی من بێ.

ئەو بازاڕە چاوی من‌و پەنجەی من‌و

هەناسەمی تیا بفرۆشرێ.

ئەو مەزاتەیش شاخ‌و بەهارو باران‌و

هەتاومی تیا مەزات کرێ!.

ـ چاوەڕوانی دابەزینی کام خواوەندو

هەڵکردنی کام زریانی ژەهر کوژی

ئەفسانە بین؟!

چاوەڕوانی موجیزەی کام فریشتە بین؟!

پاڵکەوین‌و چاوەڕوانی

کفن‌و گۆڕو دارەمەیتی

ئاینده کەین؟

لەناو ئەشکەوتی گریاندا بە دیار تەرمی

خۆمانەوە هەڵتروشکێین؟!

بۆ کوێ بڕۆین؟!

ـ سەرمان ، سەرمان، سەرمان، سەرمان!

ئەبێ ئەم سەرە گەنیوە، لەخۆمان دووربخەینەوە

بیگۆڕینو سەرێکی نوێی لەجێ دانێین.

ئەبێ خێرا

ئەم قۆریە ڕزیوەی سەرمان فڕێ بدەین

چیتر کەڵکی بەکارهێنانی نەماوە.

ئائەم کاڵەکە تەپیوە

ئەبێ هەتا دەستمان ئەگات تووڕی هەڵدەین

چیتر سوودی تیا نەماوە.

ئەبێ ئەم سەرە، ئەم گڵۆپە سوتاوە داگرینو

وای فڕێ دەین، لە دوایدا

وردە شووشەکانی. نەچن بەپێی منداڵەکانماندا!.

ئەبێ ئەم سەرە بگۆڕین

ئەبێ هەر خۆیشمان بیگۆڕین.

سەرێکی نوێی لەجێ دانێین.

سەرێکی پاك، ڕوو لەهەتاو،

هەزار پەنجەرەی تێدابێ.

سەرێ هەموو کانیو زەریاو درەختێکی

کوردستان‌و ئەم جیهانەی لەناودابێ.
سەرێ وەکوو حەوزێکی ڕوون
با هەزاران جۆرە ماسیی
ڕەنگاوڕەنگی لەناودابێ.
سەرێ هەموو مۆمێکی تیا داگیرسێنین.
سەرێ هەموو گوڵێکی تێدا بڕوێنین.
سەرێ تەنها نەیکەین بە مەشجەبی تفەنگ
بەتاوسی لەخۆبایی.
سەرمان، سەرمان، سەرمان، سەرمان
ئەبێ ئەم سەرە بگۆڕین، سەرێکی نوێی لەجێ‌دانێین.

بەهاری/1989

# ئاوێنە بچکۆلەکان

1986

گیانی من بۆ تەڵێ وەنەوشە پەرۆشە

کە لە ژێر سێبەری توتڕکا خامۆش

گۆران

# خۆرنشین

ئێوارەو
دڵۆپ
دڵۆپ
ئەتکێمە سەر خۆرنشینی
غەریبیی خۆم..
ئەی خۆرنشین!
مەڕۆ! چونکە
تا سبەینێ
هەتا ئێوارە.. دێیتەوە
بەشوێن تۆدا وشەکانم
یەک
یەک
ئەگرین
ئەی خۆرنشین!.

1975

# پاش وەخت

درەنگ.. درەنگ.. تێگەیشتم
من دەمێك بوو وەك "كاربۆن"ی
ژێر قسەكانی تۆ وابووم
هەر ـ دەركردنەوە ـ م لەسەربوو!
درەنگ.. درەنگ ئەوەم زانی
ئەو ڕووەی تۆ ئەتدا بەمن
وەك پولی پۆستەیەك وابوو
لەخەڵكی كەت ئەكردەوەو
ئەدنا لەمن
درەنگ.. درەنگ.. تێگەیشتم!

1975

# ناسین

وەك كتێبێ تۆم هەڵبژارد
كە گرتمی بە دەستمەوەو
كەوتمە هەڵدانەوەی ناخت
یەك.. یەك
پەڕەی دڵتم ژمارد
ئەوسا زانیم كتێبێ بووی
نەك لەشوێنێكو دوو شوێندا
لە دەیان شوێندا پەڕیبووی!

1975

# خەنجەر

ئەزانم بەفر کوژەکان!
خۆشەویستیی ئێوەم بۆ ئەکەن بە خەنجەر
تا لە کێلانی گەرووەمی هەڵچەقێنن
بەڵام ئەوسایش
من مشتووی ئەو
خەنجەرەتان ماچ ئەکەمو
ئینجا چاوم لەناو بەفری
ئەوینتانا ئەچێتە خەو!

1975

# مقەست

لەناو شارەکەی "مەم"ی بۆتاندا
لەچەقی ڕێگەی دێرپێکدا.. ڕۆژێ
وشەیەك کەوتو
نەیتوانی بفڕێ!
وەختێ مقەستێ هاتو دەنووکی
مەلی حەرفێکی دەنگخۆشی ئەوی
لەبندا قرتان!
رۆژهاتو ڕۆیی‌و هەر هەمان مقەست
لەژێر هەرەسی کتێبدا تاسا
چونکە دەمێ بوو
لافاوی ڕقی
هەزاران ووشەی
لەخۆی هەڵئەستان!

1976

# دوا ووشە

ئەگەر "با" شنەی هەناسەکانی
لەسنگی بڕیو
دەمو چاوی خۆی
لە ڕێبوارانی دنیا شاردەوە!
ئەگەر "ئاو" چاوی شەپۆلی لێکناو
لە نیوەی ڕێدا
ماندوو بوو وەستاو
بەرەو سەرچاوەی دیسان هاتەوە.
ئەگەر "باڵندە"
باڵی کلیل کرد
ویستی فڕینی وەك دەزوو لەسەر
دەنووكو ملی هەڵبکاتەوە
ئەگەر درەختێ
زەمینی جێ هێشت.
ئەگەر بارانیش
ئەو بڕیارەی دا

لە وەرزی خۆیدا دانەکاتەوە..
بڕیار بێ منیش
سەری وشەی خۆم هەڵبکەنم‌و
نەهێڵم شیعرم دەم بکاتەوە!

1977

# پەند

زۆر شت هەن، ژەنگ هەڵدێنن‌و
بیر ئەچنەوەو
دواییش ئەمرن
وەکوو تاج‌و
سەوڵەجان‌و
تەختی ژێر پێی پادشاکان!
زۆر شتی تری دنیاش هەن
نارزێن‌و
بیر ناچنەوەو
هەرگیز نامرن
وەکوو شەپقەو
گۆچانەکەو
پێڵاوەکەی
"شارلی شاپلن"

1978

# 27 جار

بۆ "بێکەس"ی باوکو نیشتمان پەروەر

**ئەگێڕنەوە..**
**ئەڵێن هەمووساڵێ جارێك**
**بە ئاسمانی گردەکەی "مامەیارە"وە**
**خەڵکی هەڵۆیەك ئەبینن**
**بەرز.. بەرز ئەفڕێ**
**بیستو حەوت جار خول ئەخواتو**
**ئەوسا لەسەر**
**کارێزەکەی "وەستا شەریف"**
**لەنگەر ئەگرێ**
**دیسانەوە بیستو حەوت جار**
**باڵەکانی لەیەك ئەداو**
**گوێیان لێیە شتێك ئەڵێ..**
**ئەگێڕنەوە..**
**ئەڵێن هەموو ساڵێ جارێك**
**بەدامێنی گردەکەی مامەیارەوە**

چاویان لێیە: جرجێکی ڕەش
لە کونێکی تاریکەوە
بیستو حەوت جار سەر دەردێنێ و
چاوی هەڵۆ ئەیکاتەوە
بەناو کونداو
ئەیتۆقێنێ
خەڵکی ئەڵێن: هەڵۆی پیرۆز
ڕۆحی بەفرینی "بێکەس"ەو
جرجیش "ئەدمۆنز"

1978

# مشار

مشارێك.. دوو
دەسکی هەبوو
دوو دارکەنی ماڵی ئیمام
دەستیان دایەو
کەوتنە وێزەی پیرە داری
وەختیَ درەخت
بەلادا هات
بەدەم ڕێوە
لەسەر مشار کردیانە شەڕ!
هەر بەپێوە
ئەم دەسکێکیو ئەو دەسکێکی
ڕائەکێشا
هەتا ناوقەدی یەکتریان
پیَ بڕێوە.

ئەیلولی/ 1979

# سـەر

لەپەنجەرەی ژوورێکەوە
کچێکی جوان..
لە پەرژینی باخێکەوە
باوەشێ گوڵ..
لە گیرفانی
کراسەکەی منیشەوە
قەڵەمەکەم
سەریان هێنایە دەرەوە
کچەکە بۆ
دڵخوازەکەی
گوڵەکان بۆ
منداڵەکان
قەڵەمەکەیشم بۆ شیعرێ
تا پێکەوە
وێنەی هەر هەموویان بگرێ!

1979

# تاریکی

لەئێراندا
"مۆنالیزا"ی
تابلۆی هونەرمەندێ گریا
وەختێ ئیمام
بەزۆر پەچەی پێگرتەوەو
جبەکەی خۆی
دا بە سەریا!

تشرینی یەکەمی/ 1979

# وێنەیەك

چوار منداڵی..
تورك‌و فارس‌و
عەرەب‌و كورد
بەهەر چواریان
وێنەی پیاوێكیان دروست كرد
یەكەم: سەری
دووەم: دەستی
سێیەم: لەشی‌و قاچەكانی
چوارەم: چەكی
كردە شانی!

تشرینی دووەمی 1979

# هاوڕێ

سەرەتای هەموو پایزێ
وەختێ پۆل پۆل ئەو مەلانەی
بەدوای عەشقی گەرمەسێردا
ڕووەو باشوور کۆچ ئەکەن و
جێمان دێڵن.
ئەو.. ڕۆژانە
لەناو باخچەی ئاژەڵەکانی باکوردا
سەرنج بدەن.
ئەبینن وا ئاوەڵی ئەو باڵندانە
زیندانیەکان
زیزو ماتن
چاوی بەفرمێسک هەڵئەبڕن
لە عەزرەتا سنگی خۆیان
بە باشووری
هێلانەو شیشی قەفەزی

باخچەکەوە ئەنووسێنن.

ئەو.. ڕۆژانە

گوێ ڕابگرن گوێتان لێیە

ئەو ئاوەڵە زیندانیانە

بەبێ وچان بۆ درەختی

گەرمە سێری دوور ئەخوێنن!

1980

# هەڵۆێست

سێبەری گەڵای دارتوویەك.. كشایەوە
وەختێ زانی ئەو ڕێبوارەی
وا بە پەلە خۆی ئەكوتێ
بۆ پشوودان لە سایەی دا
لە هەڵدێرەكەی ئەو دیودا
دوو سێ نەمامی سەربڕی!
مانگ تریفەی كوژانەوە
وەختێ زانی لەبەر ئەودا
تۆڕ بۆ گرتنی گزنگی
سبەی بەیانیی ئەچنرێ!
كلیلێ خۆی
لەكونی قفلا عاسی كرد
كە هەستی كرد ئەیانەوێ
چرایەك بێننە دەرەوە..
بیخنكێنن!

ڕێگایەك پاسدارەکانی
یەك.. یەك، وێڵ کرد
وەختێ زانی ئەچن بۆ ئەوێ
باخچەیەك، بە دیل بگرن
نامەیەکیش خۆی لەزەرفەکەیدا
دڕان
وەختێ زانی
هەواڵی ـ ئیعدام کردنی ـ
هەڵبەستێکی لەناودایە
بۆ مەهابادی لەیلایە!

1980/5/30

# شایەت

کوشتیان..
"با" هاتو "بەدلە"کەی
لەبەر داکەند.
باران: شتی.
ڕووبار: بردی.
باخچە: ناشتی.
لەماڵەوە کە بەدلەکەیان هەڵواسی
"خەم"ە وردیلەکان دەستیان
بەگیرفانەکاندا گێڕا
گیرفانی یەکەم.. پێی وتن:
ئەوە پێنج شەش
"تمەن"ی ئەمڕۆی خوێن مژراو
گیرفانی دووەم پێی وتن:
ئەوە قوڵێ
جگەرەی قامیشی کوردیی.

**گیرفانی سێیەم ڤیژاندیو**

**وتی: ئەوەیش**

**دوا وێنەی پەتی سێدارەو**

**ملی "قازی"!**

حوزەیرانی/ 1980

# مانگو زەریا

زووتر.. زووتر
ئەم "مانگ"ە نا
مانگێکی تر هەبوو جوانتر
دەمو چاوی ئێجگار گەشتر
ئاو شێتی بوو، ئاو شەیدای بوو
هەموو شەوێ لە کەناردا
ئەهات ئەچوو بەتەمای بوو!
بەڵام مانگ لەو لووتەلابوو
زەریا ویستی بەفێڵ بیگرێ.
شەپۆل هەرچەند خۆی هەڵبڕی
دەمی نەگەیشتە ڕوومەتی.
مانگ بە ئەنقەست نازی ئەکرد
بۆ چاوشارکێ لەژێر چوخمەکانی هەورا
خۆی ون ئەکرد!
هەتا جارێ بەسەفەرێ
مانگ کۆچی کرد بۆ بیابان

تا چەند شەوێ نەهاتەوە

کە هاتەوە، تەپو تۆزو خۆڵی قاقر

لە دەمو چاوی نیشتبوو

تریفەی قژی خۆڵاویی

پۆشاکی زیوینی بەری

گەرد لێ نیشتوو.

ئەو کاتەی مانگ گەڕایەوە

ئاو نوستبوو.

مانگ بڕیاریدا خۆی بشوا

بە پەلە پەل

جلەکانی بەری داکەند

ڕووەو زەریا هەنگاوی نا

شڵەژا بوو

مانگ پێی لەسەر بەردێ دانا

بەرد زۆر لووس بوو

شڵپەیەك هات

مانگ خلیسکا

مانگ نوقم بوو.

زەریا وەك شێتو هار هەستا

بۆ مانگ گەڕا

سەری کردوو خواری کردوو

دەستی بەناو بنیا گێڕا

هەر چووە سەر

هەر هاتە خوار

مانگ هەر نەبوو

لەو شەوەوە هەڵچوون و داچوونی زەریا

لەدایک بوو!

# بەشکردن

ئێمە برسێتیمان بەشکرد
بۆ ئەوەی وەکوو یەك بخۆین.
ڕووتو قووتیمان دابەشکرد
بۆ ئەوەی وەك یەك بپۆشین.
ئێمە خوێنیشمان دابەشکرد
بۆ ئەوەی وەکوو یەك بمرین.
بەڵام ئەو وەختەی کە ترس
ئابڵووقەی داین
هاتە سەر ئەوەی برسێتیی بەین بە تێری
لای گەنم کوژ
ڕووتو قووتی بە پۆشتەیی لای کفن دز
خوێنمان بە بانقی مەرکەزیی.
هەر هەندێکمان بڕیان پیاکرد.
بۆ یەکەم جار یەکسانیمان بۆ یەك نەویست
بۆ یەکەم جار وەك یەك نەبووین
لە مەیاندا، وەك یەك نەژیاین!.

1988

# ئازادی

لەناو هەناوی هەورەوە

مژدەی سەوز دائەباری

لەناو چاوی کانییەوە

ئاوی ژیان هەڵئەقوڵێ

لەناو دەروونی شاخەوە

مەلی بەربەیان هەڵئەفڕێ

لەناو برینی کێڵگەوە

گوڵەگەنم ئەهاتەدەر.

لەناو لوولەی چەکیشەوە

ڕێی ئازادیی!

1985

# خـــاك

دەستم برد بۆ چڵی دارێ
لەتاو ئازار لق داچڵەکی
کە دەستم برد بۆ لقەکە
ناوقەدی دار
کەوتە هاوار
کە باوەشم کرد بە قەد دا
خاك لەریەوە لەژێر پێم دا
بەرد ناڵاندی.
ئەمجارەیان کە دانەوییم
خۆڵم هەڵگرت
گشت کوردستان زریکانی.

1985

# چریكە

بەیانی زوو كە هەتاو هات

لووتكەكانی لەخەوهەستان،

لەو كاتەدا من دەمێك بوو

مەلی شیعرێكی نەنووستووم

لە لووتكەوە هاتبۆوەو

بەبێ وچان

لەسەر بەفری

پەڕە كاغەزی بەردەمم

ئەیچریكان!

1985

# ئـــازار

ئەی ژنی تەنیاو غەمگینم
ئارامییشت وەکوو قژە خورماییەکەت
درێژ درێژ بکەرەوە
وەك هەر چواریان دڵو باوەش
بۆ هەژارییش بگرەرەوە
من ئەزانم چ شەوێکەو
دەرگا لەسەر نائومێدیی مەکەرەوە
لەگەڵ فرمێسك هەرگیز نەدوێن
دەبا ئازار بەردی ڕق بێو
ئێوەش , ئەو پێنج گوڵە جوانەی
لەسەر تەوقەسەری ئەڕوێن!

1985

# نــــاپــــاك

هاوینێ بو، نیوه شەوێ
لەکەژێکدا داره بەنێ
که مانگ لەودیو کەل ئاوابوو
بەپێ دزکێ
خۆی دزیەوه
خۆی تەنیا بوو
نەیهێشت لقێ
یان ڕێبوارێ
کەس بیبینێ
دارەبەنی چاوبەرەوژێر
پەنای بردە ماڵە تەورێ
تەور کردی بەپاسەوان
هەتا ئێشکی کۆشکی بگرێ
ڕۆژێ زستان
پیره تەور زۆر سەرمای بوو
دارەبەنی لەت لەت کردوو
فڕێی دایه ناو ئاگردان.

1985

# قوربانیی

سێلاوێ هات

تا گەیشتە پۆپەی دارێ

بە پۆپەوە هێلانەیەك بەجێ مابوو

دووسێ زەڕنەقووتەی تیا بوو

درەخت بەسنگ

شەڕی لەگەڵ ئاودا ئەکرد

هەرخۆی ڕاگرت

هەتا ئێوارە داهاتو

دایکی بێچوەکان هاتەوە

وەختێ خنکا

ئەو دوا بێچوی ئەگواستەوە!

1985

# ئاوێنە

ئەو ئاوێنەیە کە شەهید

قژی لەبەر دائەهێنا

ئەویش گیرا

ئاوێنەی دیل

نەیزانی چۆن خۆی دەربازکا

ڕۆژێ تاوان لەگوێ چەمێ

ڕیشی تاشی

ئاوێنە سەری هەڵبڕی

"با" یەك ئەهات

یەکدوو چرپەی لەگەڵدا کرد

با خێراتر هەنگاوی نا

تا پاڵێکی بەمەوە نا

ئاوێنە خل بۆوە بۆ چەم

ئاو نەوەستا شەپۆل بردی

بۆ ئەو شوێنەی

چلەی شەهیدیان ئەگێڕا!

1985

# بڕیار

یەکەم دەرس
چوار ئەفەندی ڕەشتاڵەو دێز
هاتن "سیروان"یان دایە پێش
سیروان بوو بە بەردی بن گۆم
نەهاتەوە
جێگەکەی چۆڵ..
وەرزێکی تر یەکەم دەرس
کە مامۆستا هاتە ژووری
تەماشای کرد
پۆل کشومات
کە ئاوڕێکی دایەوە
لەسەر تەختەی ڕەش نوسرابوو:
ئەی مامۆستا
ئێمە ئیتر هەر هەمووومان
لە ئیستەوە بووین بە "سیروان".

1985

# ئەنجام

ئەو زیندانەی
"مانگ" یان تیا کوشت
خۆر هات گرتی!
ئەو ڕووبارەی جۆگەی قووتدا
ئەویش زەریا
هەڵیلووشی!

1985

# ژیانم

دوو شت کەم خایەنە بزەی
دەمو لێویان
وان لەپێش چاو
خۆشیی من
خۆشیی پەپوولە
دوو شت خێرایە هەڵچوونیان
بە بڕشتە گەورە بوونیان
وان لە پێش چاو
باڵای خەمم
باڵای لاولاو.

1985

# عاشق

یەکەم جار بوو قامیشەڵان

قامیشێکی عاشقی خۆی لێ یاخی بێ

ئەم عاشقە باریکەلە ڕەنگ زەردەمان

دڵی بە "با"ی وەشتا چووبوو

قامیشەڵان وتیان نابێ و نەیاندایە

عاشقی شێتی بێ هەناو

وتی: ئەو تەنها لە لایە

ئێوەش هەمووتان لە لایە

ئەوەش دڵم!

قامیشەڵانی ڕق هەڵساو

بۆ سزادانی دڵداری چاو بە شەونم!

دار کونکەرەیان بۆ بانگ کرد

دارکونکەرەی دەنووك زۆر تیژ

پێنج شەش کونی کردە دڵو

لەشی قامیش

لەو ڕۆژەوە ئەو عاشقە

بوو بە شمشاڵ

لەو ڕۆژەوە زامی دڵدار

بە پەنجەی با

دێتە قسەو

گۆرانی بۆ دنیا ئەڵێ

هەتا ئیستا.

1985

# چەك

**بۆ ئەوەی شاخ دڵی خۆش بێ.**
**درەختەكان بە "با" یان وت:**
**وەكوو شمشاڵ بیانژەنێ.**
**بۆ ئەوەی باخ وەڕس نەبێ**
**مەل بە چەم و ڕووباری وت**
**شەپۆل دەس گرێو پێ كەنێ.**
**هەتا شیعریش ئازاد بفڕێ**
**خاك بە چەكی پێشمەرگەی وت**
**گڕ لەم شەوگارە بەربداو**
**لە باوەشی خۆردا بمرێ!**

1985

# پەستیی

وەکوو کەشتیی بن کون تێبوو

تەماشای ئەم

دڵەم ئەکەم

هەر ئاو ئەچێتە ناوێوەو

ئاو دەر ئەدەم

هەتا جامێ لە خەمی کۆن هەڵئەهێنجم

جامێکیتر، خەمی تازە لەجێیەتی

ئا ئەم کەشتیە شپرزەیە

نە ئەوەتا نوقم ببێ

نە ئەوەتایش لەم گەرداوی شەوگارەدا

لە ڕۆخێکدا لەنگەر بگرێ!

1985

# خۆشەویستیی

ولاٌت زۆرە لە كوردستان
شۆخو شەنگ تر
خوێن گەرمتر
ولاٌت زۆرە لە كوردستان
چاوی گەشتر
ئێسك سوكتر
ولاٌت زۆرە لە كوردستان
قسە خۆشتر
دەس ڕەنگینتر
بەلاٌم ئەی كوردستانەكەم!
ولاٌت نییە هەرگیز لە تۆ
خۆشەویستر!

1985

# سەنگەر

هاوڕێکەم!
"تۆو"ێ گوێ ناگرێ لە کێڵگە
ئەگەر سینەی خۆی نەداتێ
کێڵگەش گوێ ناگرێ لە هەورێ
بۆی نەبارێ.
هەوریش گوێ ناگرێ لە "با"یەك
نەیگێڕێتو ڕای نەژەنێ
"با"یش گوێ ناگرێ لە دەربەندێ
گڤەگڤی نەوروژێنێ..
دەربەندیش گوێ لە شاخ ناگرێ
ئەم لاو ئەولای قایم نەگرێ!
هاوڕێکەم!
شاخیش بۆ گوێ لەتۆ بگرێ
گەر سەنگەری شەهیدێکیت پێ لێ نەدرێ!

1985

# گفتوگۆ

سلەیمانی وتی ئەگەر
ئیستە"شەهاب"م بژیایە
ڕەنگی گۆیژەم ئاڵتر ئەبوو.
کەرکوك وتی ئەگەر ئیستە
منیش"ئەنوەر"م بمایە
چاوی "بابە"م تیژتر ئەبوو.
هەولێر وتی ئەگەر ئیستە
منیش"ڕەنجبەر"م بژیایە
گوێچکەی قەلاّم سوکتر ئەبوو.
کۆیە وتی ئەگەر ئیستە
منیش"جەعفەر"م بژیایە
چنارۆکم شەنگتر ئەبوو.
بادینانیش وتی ئەگەر
منیش"عەزۆ"کەم بمایە
ئیستە بێشەم چڕتر ئەبوو.

له دواییدا کوردستانم هەڵیدایە
وتی ئەگەر ئەوان هەموو بمانایە
من باڵام چۆن بکردایە؟!
ئەم ئاگرە چۆن لە گیانما
هەڵگیرسایە؟!

1985

# هێلانە

کۆمۆنیست نیم
بەڵام زۆر جار چاوم لێ یە
یەکە یەکە
هەندێ وشەی دایکەو باوکەم
وەك چۆلەکە
کە هێلانەی شەوگارێکیان لێ ئەشێوێ
هەڵئەفڕنو ئەیانەوێ
ئەو شەوانە
کاسکێتەکەی لینین بکەن
بە هێلانە!

1985

# ڕێگا

ڕۆژێ زەمین بورکانی بوو
بورکانیش کوردستانی بوو
کوردستانیش کوڕی وەکوو
ئاراراتی لێ کەوتەوە..
ئاراراتیش کوردی لێ بوو
کوردیش دووانەی چەوسانەوەو تێکۆشانی
بەیەك سك بوو
لەو دووانەیەش
ڕێگای وەکوو"یلماز گۆنای"لەدایك بوو.

1985

# شۆڕش

شاخ وتی شۆڕش ڕووباره
جارێ تیژو جارێ خاوو
هەندێ جاریش بێ بواره.
ڕوبار وتی شۆڕش شاخه
جارێ لووتکەو جارێ گەورەو
هەندێ جاریش بن بناره.
درەخت وتی شۆڕش وەکوو دارستانه
جارێ ڕووتەو جارێ وشکەو
هەندێ جاریش چڕستانه.
ئەمجارەیان زەمین وتی:
ده بلێین شۆڕش ژیانه
وەك سەری من چۆن بەدەوری
چاوی خۆردا ئەخولێتەوه
سەری ئەویش وا بەدەوری
چاوی گەلدا ئەخولێتەوەو
ئەوەی له کەسمان ڕوونەدا
نەوەستانه!.

1985

# شەونخوونی

لەو شەوەدا

لەو دۆڵەدا

چراکان کوژابوونەوە

تاقە چرایەك ئەسووتا

ئەویش چرای شاعیرێ بوو

بە دیار برینی نەنووستووی

شیعرێکەوە دانیشتبوو!

1985

# كوێر

**بەرخۆڵەکە**

**دوای گرمەیەك**

**دوای ڕۆشتنی فڕۆکەکە**

**دەمی گێڕا**

**نە گوانی بۆ بینرایەوەو**

**نە ڕانی بۆ دۆزرایەوەو**

**نە چووشەوە سەر ئاوەکە!**

1985

# پێڵوو

که مانگ هەڵهات

یەکەم چەپکە تریفەی خۆی

پێشکەش بە لووتکەی بەرز کرد

لەپەناوە

کانییەك چاوی تێ بڕیو

داوای یەك ماچی لێ ئەکرد

لەبەر پەنجەرەی ژوورێکدا

نامەی دڵدارێکی بێدار

تکای مانەوەی لێ ئەکرد

لەپڕێکدا کە ئاوا بوو

چوون بۆی گەڕان

سەیریان کرد مانگ

لەناو شیعرێکدا نوستووە

خەمی کانیو نامەو لوتکەی

لە پێڵۆیدا هەڵگرتووە.

1985

# میرات

کە کەو ئەمرێ

دوای خۆی بۆ شاخ

چەند قاسپەیەك بەجێ دێڵێ.

کە هەنگ ئەمرێ

دوای خۆی بۆ باخ

هەندێ ماچی شیرین شیرین

بەجێ دێڵێ.

کە وەختێکیش تاوس ئەمرێ

دوای خۆی هەندێ تێلی ڕەنگین

بۆ ناو گوڵدان

بەجێ دێڵێ.

کە وەختێکیش ئاسك ئەمرێ

دوای خۆی مسك بەجێ دێڵێ.

هەرکاتێکیش کە من مردم

دوای خۆم بۆ ئێوەو کوردستان

هەندێ شیعری

نازدارو جوان

بەجێ دێڵم.

# هیوا

ئەگەر ئەوینت باران بێ

وا لەبەریا ڕاوەستاوم.

ئەگەر ئەوینت ئاگر بێ

وا لەناویا هەڵکوڕماوم.

ئەی ئەوینی کوردستانم

شیعرم ئەڵێ:

تا باران و ئاگر مابێ

منیش ماوم!

1985

# بەرزبوونەوە

**بەرزیی باڵام**

**سەدو حەفتاو نۆ سانتیمە**

**گەڕام.. هەرچی**

**لاپەڕەی ڕوو زەردی ناحەزانە**

**کۆمکردنەوە..**

**سەفتەیەك بوو.. هەر بە پێوە**

**چوومە سەری..**

**ڕوو لە "دابان"**

**کە ڕاوەستام**

**وەختێ بینیم:**

**ئەمجارەیان**

**بووم بە سەدو هەشتا سانتیم!!**

1985

## زەبر

لای من ئەمڕۆ

کەللەی شیعرو سەری بزمار

وەکوو یەکن

کاتێ هەردوو نووکی تیژیان

قووڵ ڕۆئەچن..

لەسەر ئەویا زەبری ئازار

لەسەر ئەمیش زەبری چەکوش

دەس دائەگرن.

## یاخی بوون

ئەی زمانە شیرینەکەم!

لێم ببورە

بۆیەکەم جار بە گوێت ناکەم!

بۆ یەکەم جار لەفەرهەنگت یاخی ئەبم

بۆ یەکەم جار تۆ وەك تینوو

بە شوێن مندا ڕائەکەیتو

منیش سەراب

ئەگەر ئەمجارە شیعرێکم کوڕێکی بوو

من ناوی لێ ئەنێم "شەهاب"!.

# بێشکە

کە لاشەی ساردی چوارچرا
وەکوو هێشووی سەرما بردوو
لە سێدارە کرانەوە
دار.. بەجێ ما
هەژارانی سابلاخ بردیان
زستانیش بوو نەیان سووتان
سەرمایشیان بوو نەیان سووتان
لەو دارانە.. لەو تەختانە
چوار بێشکەی سووریان دروست کرد
لەو ڕۆژەوە هەتا ئەمڕۆ
ئەو لانکانە
هەر ئەگەڕێن
ئەم ماڵ.. ئەو ماڵ
ئەم دەست ئەو دەست
وەریان ئەگرن
ئەی نابینی هەزاران قازی محەمەد
لەسەر لوتکە وەستاون و
چەك هەڵئەبڕن؟!

# ساڵی تازە

ئەو کێڵگەیەی، ماچ بارانی ساڵی پارم
سەوزی نەکرد. ئەمساڵ ئەیکەم
هەورێ وای وت.
ئەو گوڵە جوانەی پار نەمدا لە ئەگریجەم
ئەمساڵ ئەیدەم.. باخێ وای وت.
ئەو درەختە شۆخو شەنگەی
پار لە تەکیا هەڵنەپەڕیم
ئەمساڵ بۆ خۆم دەستی ئەگرم
شەماڵ وای وت.
ئەو تاجی گڕی نەورۆزەی پار کردمە سەر
بچوکتر ئەبێ لەتاجی ساڵی تازەم
لوتکە وای وت.
ئەو جۆگانەی پار چاوبڕکێم لەگەڵ کردن
ئەمساڵ ئەچمە خوازبێنیان
گۆمێ وای وت.

ئەو ئاسۆیەی پار تیا نەفڕیم
ئەمساڵ ئەبێ بە جێی گەشتم
مەلێ وای وت.
ئەو حەرفە چاو ڕەشانەی پار نەم ئەناسین
ئەمساڵ وەكوو ڕستە بازن
ئەیانكەمە هەردوو دەستم
كیژۆڵەیەكیش وای ئەوت.
ئەو دەنكە گەنمەی ساڵی پار نەمگەیاندە
ناو شارەكەم
ئەبێ ئەمساڵ بیگەیێنم
مێرولەیەكیش وای ئەوت.
ئەو گێژەنەی پار خۆم لێداو گەڕامەوە
لەساڵی نوێدا ئەیبڕم
ئەسپێك وای وت.
مۆمەكانی هەر دوانزە پەنجەی ئەمساڵم
شەوقی هیوایان گەشترە لە هی پارم
سینیی سەر مێزەكەش وای وت.
ئەو شیعرە سركە كێوییەی وەكوو ئاسك
پار نەمتوانی دەستەمۆی كەم
پار نەمتوانی لەگەڵ چاوما ڕای بهێنم
ساڵی تازە ماڵیی ئەكەم
ساڵی تازە ئەیخەمە ناو هەورەبانی

کەشکۆڵەوەو

لەباخەڵما ئەیخەوێنم

دوای هەموویان منیش وام وت!.

# بەفر

منداڵ بوومو سەرەتا بوو

خۆشەویستیت

تۆپەڵە بەفرێ بوو بچووك

بەقەد تۆپێ.

ڕۆژ هاتو چوو..

سەرنج ئەدەم:

هەتا تەمەن بەرەو لێژایی مل بنێ

تۆپەڵە بەفری ئەوینیش خول ئەخواتو

دائەگەڕێو

گەورە ئەبێ.

ڕۆژێکیش دێ

ئەی وڵاتە سپیکەلە غەمگینەکەم!

کە قورسایی کێوی بەفر

بەم دڵە بچکۆلانەیە

هەڵنەگیرێو

هەر بەدەستی خۆشەویستیی

تۆ بکوژرێ!!

# چاو

شیعرم وەکوو زنجیرە شاخ، لوتکە.. لوتکە
هەتا بەرەو ژوور بێتەوە
بەفری ئەوین دایئەپۆشیۆ
لەبەر تەماشای گزنگما
سپی.. سپی ئەچێتەوە.
بەرەو باکوور
شیعرم هەڵمی زامەکانی گەرمەسێری کۆچکردووە
کەژاوەی بووکێنیی هەورەو
مانگی سووری، دوا شەهیدی
سلێمانی تیا نووستوە.
بەرەو باکوور
شیعرم ئەڕوا
گڕە و ئەڕوا
خەمەو ئەڕوا
تا لەسەر "وان" لائەداو ئەچەمێتەوە



4

بەسەر پەنجەرەی نارنجی بەربەیاندا
دا ئەبارێ‌و
لەچاوەکانی "دەرسیم"دا ئەتوێتەوە.
چاوی شیعرم
چاوی دایکم
چاوی دەرسیم
ئەو جۆگەلە رۆشنانەن
سەرچاوەیان وا لەناو دڵی بەفرایەو
بەفریش عەشقێکە ئەبەدی‌و
نابڕێتەوە!

# قۆخ

لەبەر ئەوەی چاوەکانم

دوو دەنکە هەڵووژەی ڕەش بوون

وەختێ کەتۆ داوات کردن

یەکێکیانم دایە دەستتو

ئەویترم بۆ خۆم هەلگرت!

ئەی کچەکە!

بەڵام دڵم هەر قۆخێکە

هەر یەکێکە

ئەی نازانی

ئەویش زووتر

لەبەرەبەیانی تەمەندا

کوردستانم پڕی پیاکرد

ئەو فڕانی

تۆ بزانە بەشت نادا!.

# گۆڕەوی

لەدەرەوە

سەرمای کانوون

دەمی "با"ی لەگۆ خستووە.

لەژوورەوە

خۆی بەتەنیا دانیشتووە.

لاڵو پاڵ وەك بەرخو کاوڕ

منداڵ نووستوون.

مێردیش ئەوە چەند ساڵێکە

زریانێکەو

شوێن عەشقی چیا کەوتووە.

خۆی بە تەنیا دانیشتووە

ئەڵێی شۆڕەبی پایزەو

سەری بۆ کۆش داخستووە.

هەر ئەچنێتو ئەچنێ

ڕاسپاردەی

گۆرەویە پووزەوانەکەی

نیوەشەوێ تەواو ئەبێ

داخ! نازانێ، ئاخ! نازانێ

کاتێ گۆرەوی ئەگاتێ

ئەو هەر تاکی چەپی ئەوێ!.

# پرسیارو وەرام

ـ تۆ بینیوتە درەخت بگریو هاوار بکا؟
ـ من بینیومە چونکە لە تەنیشت منەوە
چەمێکیان کوشت
چونکە لەنزیك منەوە
گریان لەیالی "با"ش بەردا!
ـ ئەی بینیوتە وشە ببێ بە خەڵووزوو
کتێب سەری بپژێتو
تەباشیریش خۆی ڕەشپۆش کا؟
ـ من بینیومە چونکە لە تەنیشت منەوە
قوتابخانەی گوندێکیان کوشت
چونکە لەنزیك منەوە
قەڵەمێکیان کرد بە پەتا!
ـ ئەی بینیوتە بەرد پێکەنێ؟
لەخۆشیاندا کەژ هەڵپەڕێ؟
شەقام بڕواتو بگەڕێو

لەناو شارا سەما بکا؟!

ـ ئەی چۆن هەموو بینیومانە

وەختێ قەندیل

یەکەم کوڕی پێشمەرگەی بوو

وەختێ باڵای چەك داگیرسا!.

## مەودا

شیعری تۆ هەر تاقە ژووریٚ

جیٚ ژوانی ئەوینێتی

شیعری تۆ هەر پەنجەرەیەك

ئاسۆی هەموو تێڕوانینێتی

شیعری تۆ هەر کورسیو میٚزیٚ

هەموو گێتیو گەردونێتی

بۆیە شیعرت تەنگەنەفەس..

کورتە بنەو

هەرچەند مەتریٚ

مەودای هەموو فڕینێتی!

1985

# مردن

که گەڵایەك مرد.. حەرفێکم لێ مرد.

که کانییەك مرد.. وشەیەکم مرد.

که باخچەیەك مرد.. ڕستەیەکم مرد.

بەڵام ئەی کیژی

تەمەن دەساڵەی

گوندی "هەڵەدن"

وەختێ تۆ کوژرای

دە شیعرم مردن!

1985

# خۆزگە

هەموو شەوێ

بەقەڵەمەکەی خۆم ئەڵێم:

ئەگەر گڵۆپی شیعری تۆ

هەر بەخوێنی شەهیدی نوێ

دابگیرسێ!

دەبا ئەوسا

ئەو خۆزگەیەم بۆ بێتە دی:

دەست بشکێو

تەمەن کورت بێ.

دەبا ئەوسا

چش لە تۆ بێ

خەڵك بژیو

شیعر بمرێ!

1985

# ناونیشان

نە ناوی شار، نە گەڕەك‌و نە شەقام‌و

نە ژمارەی تەلەفۆن‌و نە سنووقی

پۆستەم هەیە!

کەچی نامەی سەوزی ئەوین

نزیك‌و دوور

هەموو ڕۆژێ بەڕێوەیە.

چونکە شیعرم خۆی پۆستەچی خۆشەویستی‌و

ئەدرەسیشم دڵی دیاری

پێشمەرگەیە!

1985

# زێوە

ڤڕەیەك دوور، نزیك.. نزیك
دووسێ ناڵە.
دەشتێك.. دووكەڵ.
ئۆردوگایەك.. ڤیژەو هاوار.
حەرف.. حەرف
سەد"ئەلفو بێ"ی كوردیی كوژراو.
وشە.. وشە
سەد" ئەلفو بێ"ی "دارا"ی بێ سەر
"دارا"ی بێ قاچ.
ڕستە.. ڕستە
سەد"ئەلفو بێ"ی "دار"ی قژ سوور
"دار"ی گوڵان لەبار براو.
سەد"ئەلفو بێ"ی "زارا"ی لە كەمەردا قرتاو.
پەڕە.. پەڕە
سەد"ئەلفو بێ"ی "بابە"و "دایە"ی

لەش کۆتەرە.

سەد"تۆپ"ی چاو دەرپۆقیوو

سەد بووکە شووشەی سەربڕڕاو.

ڤڕەیەك دوور، دوور، دوور، دوورتر

پایتەختی ئەژدیهایەكو

جیهانێكی كەڕەواڵە!.

تشرینی دووەمی/ 1986

# جوانوو

بۆ شەهید فەرهاد

جوانوویەك بوو
وەکوو شەفەق حیلەی سوورو
وەکوو کولوو گیانی سپی.
نەترس‌و بیم ڕەنگی حیلەی سووری گۆڕی‌و
نە دووکەڵی پایتەختێکیش گیانی سپی.
سنورەکان هەرچەندیان کرد ڕامیان نەکرد.
سوڵتانەکان هەرچەندیان کرد ڕامیان نەکرد.
کەچی زارۆکی کوردستان
کامیان وەك قامیش لاوازو
کامیان ئێجگار برسی‌و ڕووت بوو
ئەیان توانی، لە ترۆپکی هەڵەمووتدا
بە ئاماژەیەك ڕایگرن..
خۆ بە یاڵدا هەڵواسن‌و
باڵی فڕینی پێ بگرن.
جوانوویەك بوو، چوارپەل ئاگر

**دابین نەبوو، وەکوو عاشق**

**وەکوو قوڵنگەکەی فەرهاد.**

**تەنها ئەو وەختە دابین بوو**

**کە لەسمکۆڵانی چیاو وەرزی گڕدا**

**بە بڵێسەی، دەستو پلی، خۆیەوە بوو!**

تشرینی دووەمی/ 1986

# ئابڵۆقەدان

لەنێو ئەم شاخو داخەدا

ئەوا بۆ دوو ساڵێ ئەچێ

هەر چواردەورم بە خۆشەویستیی گیراوە

هەر چوار دەورم بە خۆشەویستیی تەنراوە

ئەمە تاقە ئابڵۆقەدانێکە، گیانم

حەز بکا چڕتر بێتەوەو

ڕۆژ لە دوای ڕۆژ

زیاتر لێی نزیك بێتەوە!

ئەمە تاقە ئابڵۆقەدانێکە هەتا

بازنەکەی بێتەوە یەك

هەتا زیاتر بخاێنێ

ئازاد ترم!.

ئەمە تەنها ئابڵۆقەدانێکە کە من

ئاواتمە لێی دەرباز نەبم!.

1986

# چادر

**ئەم چادرانە، سەروگەردنو لاقی لە جەستە**

**ڕاونراومانن.**

**ئەم چادرانە، پێستی گووراوی، لە نامۆییدا، هەڵدراومانن.**

**ئەم چادرانە، سەرئەکەم بەژێر هەر یەکێکیاندا:**

**گوندێك ئەبینم، بە چیچکانەوە، کز دانیشتووەو**

**کڕ، تێم ئەڕوانێ.**

**پیرە درەختێ، بەتانیی لەکۆڵ، هەڵئەلەرزێتو**

**زەق، تێم ئەڕوانێ.**

**چاوم لێیانە لەژێر چادردا**

**جۆگەلەو ڕووبار، لەسەرپشت کەوتوون**

**دووکەڵیان داوە بەسەر خۆیانداو هەر چاویان دیارە**

**گوێشم لێیانە، وەك ڕەزوکێڵگە، هەڵئەقرچێن ونالەناڵیانە**

**گوڵە گەنمەکان، وەکو کارژۆڵە تازە زاوەکان**

**بێ هەناو لاواز، کۆماونەتەوەو**

**سەریان خستۆتە کۆشی یەکەوەو، وەکو پەلکەگیا**

**وەکوو وردەبەرد، ئەکرِوزێنەوەو، نرکەنرکیانە.**

**چاوم لێیانە، مامرەکانیش، بۆ گەرِانەوەی**

**جووجەڵەکانیان، لەتاریکیدا هەر خول ئەخۆن‌و گارەگاریانە.**

**ئەم چادرانە، سەروگەردن‌و لاقی لە جەستە**

**رِاونراومانن.**

**ئەم چادرانە، ماڵە برینی**

**هۆبە بەهۆبەی شیعرەکانمانن.**

ئێران/ 1986

## دەسەڵات

کام کونە دەرزی بیرۆکە
زۆر بچووکە
بە تاریکیش من ئەتوانم
دەزووی شیعریان پێوە بکەم.
کامە خەیاڵ ئێجگار لووسە
من ئەتوانم هەر بەدەستی
ڕووتی ڕستە
بیگرم وەکوو ئەم پێنووسە.
کام حوتی دەریا گەورەیە،
من ئەتوانم لە پەرداخێ وشەی پڕدا
جێی کەمەوە.
بەڵام ئەوەی نە لەدڵماو نە لەشیعرا
هەرگیز جێیان نابێتەوە
درۆی گەورە
یان بچووکە!

1986

# قۆپچە

**ئەم شاخە وا هەڵکەوتووە**
**ئەڵێی پیاوێکی درێژەو،**
**ساڵ دوانزەی مانگ سەرمایەتیو،**
**پاڵتۆیەکی خۆڵەمێشی ئاودامانی،**
**تەسکی لەبەر خۆی کردووە.**
**پاڵتۆکەیشی بە چوار قۆپچەی**
**گا بەردی زل داخستووە.**
**ئەم شاخە واهەڵکەوتووە.**
**ئەمڕۆ شەبەق بۆردومان بوو**
**من هەر خەمی ئەو پیاوەم بوو**
**دواتر کە سەرنجم دایە**
**وەك خۆی چۆن بوو**
**هەر بەپێوە ڕاوەستابوو**
**تەنها یەك قۆپچەی پاڵتۆکەی**
**لەشوێنی خۆی ترازا بوو.**

1986

# خواست

وەختێ گەرداو داوا ئەکاو،

شەپۆل هەڵئەسێتە سەرپێ!.

هەموو جارێ ئەو بەرزەوپێ ڕاوەستانە

ئەو.. هەڵسانە

بۆ یادی گیانی ئاوێکە، کانییەکە، شەهید بووبێ.

وەختێ ئاسۆ داوا ئەکاو،

باڵندە بۆ ساتەوەختێ لەنگەر ئەگرێ

بە ئاسمانەوە ئەوەستێ.

هەموو جارێ، ئەو لەنگەرە، ئەو وەستانە

بۆ یادی گیانی گوڵێکە، گەڵایەکە، شەهید بووبێ.

وەختێ خاکیش داوا لە هەموومان ئەکا

وەکوو درەخت دەقیقەیەك ڕابوەستین

هەموو جارێ ئەو بەرزەپێ ڕاوەستانە

لەبەر خاتری نیگای کانیو،

بەردەنوێژی ناوچەوانی شەهیدێکە.

هەموو جارێ لەناو چرکەی دەقیقەدا

وا هەست ئەکەم

سەعاتی خوێنی شەهیدی کەشکۆڵەکانم لێئەدا!.

کێ بوو پرسی:

ئەم شیعرانەی تۆ چەند ئەژین؟

چەند عومریانە؟

من خۆم ناڵێم، شەپۆل‌و گوڵ‌و مەل ئەڵێن:

بەقەد یادی هەرجارێکی بەردەوامی

ئیستەو بەیانی‌و داهاتووی

ئەو.. دەقیقە، ڕاوەستانە!

شام/ شوباتی/1987

# پرسە

بارانێ مرد

هەتا سێ ڕۆژ

زەویی پرسەیەکی گەورەی

لە کێڵگەیەکدا بۆ دانا.

ئەوەی کە لەم پرسەیەدا

لەهەمووان زۆرتر گریاو

هەڵقرچانی لەبەرچاوبوو:

باڵندەی باخی گوندێکی ڕاگوێزراو بوو.

1988

## شەڕ

**زریان دوو داری دا بەشەڕ**

**دارەکان کەوتنە دەسکەنەی قژی یەکتر**

**دەستیان خستە خوێنی گەڵاو چڵی یەکتر.**

**تا ئەو وەختەی درەنگانێ**

**هەتاو هاتو بەربەیانێ**

**هەردووکیانی ئاشت کردەوە.**

**بەڵام سەد داخ! ئەوەی لەو وەرزەدا تیاچوو**

**بەری کوژراوی سەر عەردی**

**هەردووکیان بوو!**

ئیتالیا/1987

# پاییز

ئەمڕۆ پایز باری کردوو ئێرەی جێهێشت
کە چوومە شوێن هەواری چۆڵ
"ئاخ"ێکی لێ بەجێ مابوو!.
ئاخم هێنایە ماڵەوە.
ئەم"ئاخ"ە وەك بە تایبەتی
پایز بۆ منی دورووبێ
پڕ بە بەری شیعرێکم بوو!.

شام/1987

# نەهێنیی

"تۆو"ی گوڵێکم خستە ژێر
سانسۆری هەردوو چاومەوە
ویستم لە نهێنیی بوون‌و
یەکەم سەرهەڵدانی بگەم.
بەجێم نەهێشت
بەڵام شەوێك نازانم چۆن وەنەوزم دا!
کەچی ئەو لەو وەنەوزەدا
نەهێنییەکەی سەری هەڵدا.

شام/1987

## له ئەنگۆرەیەکدا

"با"و "ئاو" لەسەر مانگ شەڕیان بوو.

ئەنگۆرەیەك:

له گۆمێکدا، ئاو بوو بە ئاوێنە بۆ مانگ

مانگ ئەو شەوە خۆی گۆڕیبوو

هاتو ویستی لەبەر گۆم دا

ئارایشت کا و قژ داهێنێ

له پڕێکدا

له دوورەوە به گڤه گڤ

"با"ی تووڕە هات

ئاوێنەکەی وردو خاش کردا.

ئیتالیا/1987

# جریوه

نیوه شەوی هاوینێ بوو
لەسەر سەرم، دوو ئەستێرەی
سەر هەڵەمووت
بۆ یەكتر ئەخنینەوەو
چەپك.. چەپك
جریوەیان ئەگرتە یەك.
ئەوەی ژوورتر
چاوم لێبوو، دەستی كەمێ تەتەڵەی كرد
جریوەیەكی كەوتە سەر جێگەكەم و
چاوی شیعرێكی من پشكووت!.

شام/1987

# له تووڕەبوونێك دا

ڕۆژێ چاکەت بە قۆپچەی سەر قۆڵی خۆی وت:

ـ تۆیش نەبی من لەبەر ئەکرێم.

تۆیش نەبی من

هەر سەرما گل ئەدەمەوە.

تۆیش نەبی من، هەر چاکەتم!.

ـ تۆیش نەبی ئەم پیاوە ئەژی.

"گوێم لێ بوو ڕۆژێ دڵیشم

وای، بە ڕیخۆڵە کوێرەم وت."

منیش ئەڵێم:

ـ ببیو نەبی

تۆیش ئەو ڕیخۆڵە کوێرەیەو

قۆپچەی سەر قۆڵی چاکەتمی!.

1987

# شەکردان

پیاڵەیەکی پشتێن زەڕلی، هەر بە پێوە

لەناو سویزگیەکەدا پرسیی:

ـ ئەو شەکردانە لەبەرچی

فرمێسکی سپی ئەڕێژێ؟

چەندین ساڵە لەم ماڵەدا

دڵشاد.. دڵشاد

دێتو ئەچێ.

گشت ڕۆژێکیش کەوچك.. کەوچك

زەردەخەنەی شیرینیمان پێ ئەبەخشێ!.

یەکەم جارە بگریو پەست بێ

بۆ؟ لەبەرچی؟

خوێدانە دەم هەراشەکە هەڵیدایە:

ـ چونکە ئەمڕۆ

شەکردانێکی دیکەیان بەسەرهێنا!

ـ سەد مەخابن!

ئەی باشە ئەم چی لێ ئەکەن؟!

ـ خۆ نایکوژن!

وا بڕیارە ئیتر بیکەن بە ئاڵەت دان!

1987

# جوانترین گوڵ

لەبەر هەیوانی هەورەوە
کە خۆر دەرکەوتو پێکەنی.
ئیتر پایتەختەکەی بەفر لەخۆشیاندا
بەسەر شەقامی هەتاودا بەپێی پەتی
ڕای ئەکردوو پارچە پارچە
بەرگی بەری دائەکەنی!
لەو ڕۆژەدا پێشبڕکێ بوو
پێشبڕکێی جوانترین گوڵ بوو
ستۆکهۆڵم
بۆ ئەم ئاهەنگی هەتاوە.
کام گوڵەیان هەڵ ئەبژێریٚو
لەبەر ئاوێنەی ڕووباردا
ئەیدا لە ئەگریجەو قژی؟!
کام گوڵەیان؟
هی کام باخچە؟! هی کام دوورگە؟!

هی کام کۆگا؟! هی کام ماڵو

کام پێشانگه؟!

دوورگه وتی: گوڵی کەنار ئاوی زۆرم

ئەو .. یەکەمە !

مەیدان وتی : گوڵی بەر پرشەی فوارەکەم

ئەو.. یەکەمە!

نهۆم وتی: گوڵی ئینجانەی باڵقۆنی هەرە بەرزم

ئەو.. یەکەمە!

لەبەر بەرۆچکەی هەتاوا

پێشبڕکێ بوو

پێشبڕکێی جوانترین گوڵ بوو

ئەی کێ ئەبێتە سەرپشکی هەڵبژاردن؟!

جووتێ کۆتر

دوو دار زەیتونو دوو منداڵ

له دالانێکی نارنجیی خۆرنشیندا

کۆبوونەوەو بڕیاریان داو ڕایانگەیان

ئەو گولانەی له باوەشی ئەم شارەدا

لەوان جوانتر هەرگیز نەبێ

ئەو گولانەن

لەسەر شۆسەی "سڤێ ڤێگن"

خراونەته

سەر خوێنەکەی "ئۆڵف پاڵمێ"!

# سوار

ئەو وەختەی هەرەس کپ بۆوە

بەفر چۆوە

لە دۆڵەکەدا سوارەکەو ئەسپە ڕەشی

نەورۆزی پاریان دۆزیەوە

سوار وەکوو خۆی

قیت دانیشتوو

سمێڵی ڕەش، سەروکلاو، فەقیانەکەی

دەستی تووکن جڵەو گرتوو

ئەسپ وەك خۆی

یاڵی بژی، کەفەڵی پان، زین، ئاوزەنگی

بەڵام نەئەو ئەیحیلان و

نە ئەمیشیان هۆ بەهۆی بوو!

## جەژنێك

هەوری لای ئێمە لە هەوری

هیچ ئاسمانێکی تر ناچێ

کە دائەکات‌و ئەبارێ

لە چوار لاوە ئاوی چاوانی ئەدزرێ.

خاکی ئێمە لە هیچ خاکێکی تر ناچێ

خۆی یەك دڵەو  هەموو ڕۆژێ بە چوار خاجدا دائەکوترێ.

دایکی ئێمە لە هیچ دایکێکی تر ناچێ

لەیەك ساتدا سکی ئەو چوار جار ئەسوتێ.

یەك کەسمان چوار جار ئەکوژرێ.

بۆیە ڕۆژێ لەئاهەنگی

ئەم خوێنەدا

چوار جەژن ئەکەین بە جەژنێ!

# پێکەوە

ئێوارەیەك
کوێرێكو کەڕێكو لاڵێك
هەتاوەکوو چەند سەعاتێك
لەسەر کورسی نێو باخچەیەك
قنجو قیتو لێو بەبزە دانیشتبوون.
کوێرەکە: بەچاوی کەڕەکە ئەیبینیو
کەڕەکە: بەگوێچکەی لاڵەکە ئەیبیستو
لاڵەکەیش: بەجوولانەوەی دەمو لێوی
هەردووکیاندا تێ ئەگەیی.
هەرسێکیان بەیەکەوەو لەیەك کاتدا
بۆنی گوڵەکانیان ئەکردا.

شام/1987

# تاقە شایەت

دوو جادەی، لێکدراو: خاچێکە.
هالاّوی پەڵەیەك گەرمە خوێن:
تاوانی، تازەی نێو شارێکە.
شایەتیش:
هەر تاقە چۆلەکەی هەڵنیشتووی
سەر داری باخێکە.
شایەتێ: کە هەرگیز بانگ ناکرێ
بۆ بەردەم" مەحکەمە"!.

1987

## ئینجانە

چاوت.. ئاوو
دەستەکانت "با"و، ئەوینت
تۆوی گوڵی هۆنراوەمە.
ئەی کچەکە!
ئەوەی هەمەو بۆم هێناوی‌و
لەبەردەمتا ڕامگرتووە:
تاقە ئینجانەکەی "سەر"مە!.

شام/1987

## کتێب

بۆ "حسین مروه"

**ئەو درەختەی**

**حەفتاوحەوت پەلی درێژی لێ بووبۆوە**

**ئەمڕۆ وتی:**

**دوای تەقینەوەی ناپاڵم**

**گوێچکەی چەپم نابیسێتو**

**ئیستە کەڕە!.**

**تۆ پێم بڵێ:**

**باوەڕناکەم تەقینەوەی لەو گەورەتر**

**لەو بە سامتر**

**هەرگیز هەبێ!.**

**ئەو ڕووبارەی**

**حەفتاوحەوت جۆگە لەجەستەی جوێ بووبۆوە**

**ئەمڕۆ وتی:**

**تەقینەوەی ئەو دینامێتەی کە ملی**

**حەفتاوحەوت شەپۆلی پەڕاند**

**ناڵەو گرمەی**

له گشت دەنگێ بەرزترە!

ئەو "موخەیەم"ەی کە هەر خۆی

بەدەستی خۆی

لەحەفتاو حەوت سانیەدا

حەفتاوحەوت کۆتری جگەری

خۆی ناشتبوو

ئەمڕۆ وتی:

نەء . زریکەی مەمکە بڕاوەکانی من لە گشت ناڵەو

دەنگێکی تر بەرزترە!

لەدواییدا کتێبخانەی "گەل"ێك وتی:

گەورەترو گەورەتر زۆر بڵندتر

لەو دەنگانە هەمووی تێکڕاو هەمووی زیاتر

ناڵەو گرمەو تەقینەوەی

دەنگی دەمانچەیەکی بێدەنگ بوو

کە هەر دوێنێ

کتێبێکی لەبەرگی هەتاو گیراوی..

کتێبێکی تەمەن حەفتاوحەوت، لاپەڕە

سەوزی جوانی پڕشنگداری

منی کوشتو..

گوێی جیهانی هەموو کەڕ کرد!

شام/1987

# دەرسێك

ـ مامۆستا گیان
لە جوگرافیای ناو دڵما بزر ئەبم!
من نازانم.. شاری بامەڕنی
چەند پلە
لە ڕۆخی زەریاوە بەرزە!
بە پێوانەی پێ، گەز، مەتر
هەڵچووترین لوتکەو دوندی
ناوی چییەو چەند بڵندە؟
ـ باشە لەوێ کام درەختە
باریکەلەو پێست تەنكو چاوی سەوزە؟!
سورترین گوڵی کێویلەی چی پێ ئەڵێن؟!
ـ مامۆستا گیان!
من ناوی گوڵو درەختو
باڵندەم بۆ لەبەر ناکرێن
دەنگو ڕەنگو
بۆنو چریکەو شەقەی باڵ

له قەفەزی تووڵ شکاوی
سنگی مندا حەپس ناکرێن!
ـ ئەی کام لاوك ئەی کام ستران؟
عاشق لەوێ
ئەیکا بە گوارە بە بازن
بە مێخەك بەند
بۆ دەزگیران؟!
ـ هەر نایزانم
ـ نازانم. نازانم.. نازانم
ئەی قوتابیە گێلۆکەکە
چی ئەزانی
چۆن دەرئەچی!
ـ مامۆستا گیان
هەتا ئیستا
من چاوی بامەڕنی خۆمم نەبینیوە
لەبارەی ئەو کەڵەکێویە عاسییەوە
تەنها هەر یەك شت ئەزانم!
ـ ئەی قوتابیە گێلۆکەکە
بیڵێ چییە؟
ـ لە ڕۆخی زەریاو ئاوەوە لەو بەرزتر
لە هەڵچوترین لوتکەی بڵندتر
لە سنەوبەری سەوزتر

لە شا لاوکی بەسۆزتر

لە سوورترین گوڵی سوورتر

لە....

ـ تورڕەم مەکە

ئەی قوتابیە گێلۆکەکە

بیڵێ چییە؟!

ـ مامۆستا گیان!

کۆتری سەرو

لقە لاوازەکەی لەشو

لاوكو سترانی گیانو

گوڵی خوێنی "یوسفی"یە!.

# مووتوربە

پایزێکی درەنگ وەخت
لە کاغەزێکی بەردەمما
شەتڵی تەنیایی خۆمم ڕووان
دواتر کاغەز وەنەوشەی گرت.
پایزێکی درەنگ وەخت
تۆوی یادی چاوی هەموو ئازیزانم
کرد بە مێزی بەردەممەوە..
مێزیش گوڵە بەڕۆژەی گرت.
بەڵام وەختێ
تەنیایمو یادی ئێوەم
بە قەترەیەك خوێنی شەهید موتوربە کرد
گشتماڵەکەم گوڵاڵەی گرت!.

# کۆتەڵ

خانوویەك ژورێکی لێ مرد
لە پرسەدا چاوی گێڕا
بۆ ژوورەکانی دراوسێ
ئەوەی نەیدی
ئەوەی نەهات
لەناو دڵی پەنجەرەیدا بوو بەگرێ!
گەڕەکێ ماڵێکی کوژرا
لە پرسەدا چاوی گێڕا
بۆ ڕێو بانو،
بۆ گەڕەکی ئەم لاو ئەولا
ئەوی نەیدی
ئەوی نەهات
لەناو دڵی بەرهەیوانو سەرکۆڵانو
گۆڕەپانیا بوو بە گرێ!
ئاخر خۆ من کوردستانم

لەیەك تروكەی چاوا بوو
پێنج هەزار كانیی لێ كوژرا
پێنج هەزار رەزی لێ خنكا
پێنج هەزار شیعری لێ كوژرا
پێنج، پێنج، پێنج، پێنج،..
وا شەش مانگە لە پرسەدایە مەولەویم
دار بەدارم گوێ هەڵئەخا
بەرد بە بەردم سۆراخ ئەكاو
شاخ بە شاخم چاو ئەگێڕێ
ئەوەی دووكەڵی جەرگمی ناسیو نەهات
ئەوەی نەمدی
چۆن لەبەر چاوی ئەم مێژوە سك سوتاوەم
ڕەش، ڕەش، ڕەش، ڕەش
داناگەڕێ!

# کسپە

تا قەڵەمەکەمماڵی بوو

تەختەبەندی قەڵەم دانو بۆ خۆی ژووری گیرفانی بوو

ئەگەر شەوێ ڕێکەوتایە

نەچوایەوەو

لە هەواری ئازیزێکدا میوان بوایە

تاقە شەوێ سەرینەکەی خۆی نەبوایە

تاقە شەوێ دۆشەکەکەی خۆی نەبوایە

لێفەکەی خۆی بەسەری خۆیدا نەدایە

لەسەرلا ڕووی نەکردایە

ئەو دیوارەی لەپاڵیایە!..

ئەبوایە هەر گینگڵی بێو تلی بایە!

ـ دایە خەوم لێ زڕاوە

خەوم نایە!

ـ ڕۆڵە ئەوە ئەمشەو جێگەت

لێ گۆڕاوە

پیَخەفەکەت هی خۆت نییە
رۆڵە بنوو ئارامت بیَ
هەر یەك شەوەو کۆتایی دیَ!
ـ هۆ.. هۆ.. دایە!
ئەوە لە کویێی؟!
لە کویێی ؟ لە کویێی ؟
وا ئاوی ڕەش هەڵئەقولیێن
ئەم دوو چاوە
ئیستە نەك خەو
من ژیانم لیَ زڕاوە
تاقە شەویَ  نییە دایە!
دوو سیَ شەویَ نییە دایە!
هەزاران شەو نییە دایە!
جیَ گۆڕینیَ نییە دایە..
من ژیانم لیَ زڕاوە!
ـ رۆڵە نەوەك هەر لیێفەکەت
ئاسمانیشت لیَ گۆڕاوە!
رۆڵە نەوەك هەر سەرینو دۆشەکەکەت
زەمینیشت لیَ گۆڕاوە!
رۆڵە نەك من
زوبانیشت لیَ گۆڕاوە!
رۆڵە بنوو.. بنوو.. بنوو!

**من ئەزانم**

**نیشتمانت لێ گۆڕاوە!!.**

ستۆکهۆڵم 1987/9/23

# کۆتەرە

ئەو شەوەی لە "شێخ وەسانا"
بووم بە زوخاڵو کۆتەرە
بۆ سبەینێ ڕۆژنامەکانی ئەوروپا
پەڕە.. پەڕە
لێم بوونە شەمشەمەکوێرە!
هەر ئەو شەوەیش
دوورتر لەمن
بەگڕی مۆمی کلێسە
دوو تاڵەمووی ڕیشی قەشە
هەڵکڕوزا
بۆ سبەینێ ڕۆژنامەکانی ئەوروپا
لەمانشێتەوە بۆ داوێن
یەکە.. یەکە
بۆ کڕوزیان لێ هەڵئەستا!.

1988

## چل چرا

من پێکەوە بە هەر دوو دەست
تەلی گەرمو تەلی ساردی
خۆشەویستیم گرتووە
بۆیە لەشم خۆی بۆتە وزەی کارەباو
لەم شەوەدا
چل چرای ئەم هەموو شیعرەی
لەسەر سەرت هەڵکردووە!.

1987

# سارێژکردنەوە

ئەگەر سروەیەکی ئەزمەڕ
بێ بۆ ئێرەو بگاتە لام
یەك شەو گلبخواتەوە لای، ژوری تەنیام
سەرێ بکێشێتە سنگم
کە ڕۆیشتەوەو گەیشتەوە
ئەو دیارە
دڵنیام ئەبێ بە گڕەو لرفە ئەکاو
ئەیسوتێنێ دەمو چاوو
دەستو پلی
"وێڵەدەرەو مامە یارە"!
دەبا نەیەت!
توخوا نەیەت!
ئەوان هەموو ڕۆژ ئەسوتێن
بۆچی شوێنی ساغیان ماوە!
دەبا لێرەو دوور لە چاویان

**هێواش هێواش خۆم بسووتێم**

**خۆ خۆڵەمێشی ئەم لەشە**

**گەر بەرنەوە**

**پەنجەرەیەكو دووانی ئەوان**

**ڕومەتێكو دووانی ئەوان**

**كەمێ سارێژ ئەكەنەوە**

**من ژیاوم بۆ ئەو كەمە**

**نامبەنەوە؟!**

1987

# دەنکە تۆو

ملیۆنان بووین

پیرە دارو

نەونەمامو

دەنکە تۆو بووین.

لەناو خودەی ئەنقەرەوە

شەبەیخوونێ هاتن.. هاتن

هەڵیانکێشاین

هەڵیانگرتین

دوور بردیانین!.

لەڕێ ملی زۆر پیرەدار لار بوونەوە.

لەسەرمادا زۆر نەونەمام ڕۆحیان دەرچوو

ڕەق بوونەوە.

تۆوێکی زۆر هەربوون بەژێر دەستو پێوە

بزربوونو بیرچوونەوە!.

وەك چەمی هاوین تەنك بووین.

وەك باڵندەی دەمەوپایز کەم بووینەوە.

چووینە خانەی هەزارەوە

تۆومان تیا بوو "با" هەڵیگرت

"با" بردیەوە

گەیشتەوە چیای تینوو.

لەناو بەرددا خۆی شاردەوە

یەکەم باران

دووەم باران

سێهەم باران، ڕوایەوە.

ئەوا ئیستە دیسانەوە جەنگەڵێکین

ملیۆنانین

دەنکە تۆوین

نەونەمامین

پیرەدارین

خودەی کۆن مرد!

ئەی خودەی نویێ!

دەستی سونگیت بۆ ناوەتە ژێر چەناگەت!

ئەتوانیت بمان بەیتەوە!

بەڵام ئاخر من ئەزانم

تۆیش ئەزانیت

تا دەنکە تۆوێ بمێنێ بۆ باوباران

ئەم جەنگەڵە نابڕێتەوە!

ستۆکهۆڵم 1987/9/20

# ئاماژە

لەواگۆنی نامۆیی دا

سێ قەڵەم بووین

پێك گەیشتین

لە دوای ئەوەی، وشەکانمان

باوەشیان کرد بەیەکتر‌داو

زامەکانمان یەکیان ماچ کرد

یەك کابینەیش بوو بە قەڵەم دانی ئێمەو

تیا  دانیشتین

⋆ شیلی.

⋆ فەلەستین.

⋆ کوردستان.

لەناو سەنگەری هەواڵو ناڵەوگرمەی دەنگو باسدا

هاتینە سەر سێ ڕیانی

ژمارەی قۆچی قوربانیی

شیلی لەسەر

**پشتی بلیتەکەی نووسی:**
**هەزاران هەزار قوربانیی**
**فەلەستینیش لیستەی ئامارێکی پێ بوو**
**لەو ژمارەیەی تێپەڕان.**
**من ژمارەم بۆ نەنووسین**
**لیستەیشم بۆ دەرنەهێنان !**
**لە پەنجەرەی واگۆنەوە**
**بە ئاماژەی پەنجەکانم**
**لق و پۆپ و گەڵاوچڵی**
**بێشەیەکم پێ نیشاندان**

تشرینی یەکەم 1987

# ورتەورتێ

ئێوارە بوو، "حەمە بچكۆل" ی بۆیاخچی

سەری ماندووی داخستبوو!

لە سوچێكی گۆڕەپانە گەورەكەدا

لەناوەندی دڵی "شام"دا

لەسەر كورسیە نزمەكەی خۆی دانیشتبوو.

پەیتا.. پەیتا

وەكوو فلْچەی نێوان دەستی

جەستەی لەڕی ڕائەژەنی.

"حەمە بچكۆل"ی ئاوارە، لەبەرخۆوە

بەورتەورت، ئەمەی ئەوت:

ـ تۆ بازرگان، قاچت دانێ!

تۆ مامۆستا، قاچت دانێ!

تۆ پارێزەر، قاچت دانێ!

ئەفسەر، سەرباز، جاسووس، جەللاد!

كوڕی باشو.. هەرچیو پەرچی!

**هەر هەمووتان**

**یەك لە دوای یەك**

**ڤاچتان دانێن!.**

**كەس نەماوە**

**هەر خوا ماوە!**

**لەوەو دنیا، دڵنیام ئەویش ئەنێرێ**

**ئەنێرێ بە شوێن كوردێكدا ,**

**پێڵاوەكەی بۆ بۆیاخكا**

**ڕەنگە ئەو كوردەیش هەر من بم!**

**ئای دایە گیان!**

**ئەوە ئەبێ پێڵاوی خوا چەند گەورەبێ؟**

**ژمارە چەند لەپێ بكا؟!**

**ئای دایە گیان!**

**ئەی بۆ پارە؟**

**خوا چەند ئەدا**

**ئەبێ چەند با؟!**

شام ـ مارتی/1987

# ژماردن

ئەگەر توانیت، یەکە، یەکە
گەڵای ئەو باخە بژمێری.
ئەگەر توانیت هەرچی ماسیی
گچکەو گەورەی
ئەو ڕووبارەی بەبەر دەمتا تێئەپەڕێ
ڕیز ژمێرکەی!
ئەگەر توانیت لە وەرزی کۆچی باڵندەی
بەرەوژوورو، بەرەوخواردا
بەرەوخوارو، بەرەوژوردا
یەکە، یەکە
مەلو باڵندە بژمێری.
ئەوا منیش بەڵێن ئەدەم
یەکە، یەکە
هەرچی قوربانیی ئەم خاکی،
کوردستانە شیرینەیە
بۆت بژمێرم!.

شام شوباتی/1987

# پیانۆ

جارێ بەڕێز
پۆلێ پەڕەسێلکەی دڵی
شاعیرانی هەر پێنج قاڕەی
ئەم دنیایە هەڵفڕین و
زۆر لەسەرخۆ
چوونە ناو سنووقێکەوە
لە دواییدا
ئەو سنووقە
بووبە "پیانۆ"!

شام/1987

# کرنوش

نیوەشەو بوو

فیکر لەسەر تەختی وشەی

هەژار دانیشت.

بەرەبەیان

چاومان لێبوو

پاشا کڕنووشی ئەبرد بۆ:

هەڵبەستی جوان.

شام/1987

# میوانداریی

میوانداریی بارانم کرد

بۆ ژوورەکەم.

وەختێ کە ڕۆی

گوڵێکی بۆ بەجێ هێشتم.

میوانداری هەتاوم کرد

بۆ ژوورەکەم

وەختێ کە ڕۆی

ئاوێنەیەکی بچکۆلەی بۆ جێ هێشتم.

میوانداریی درەختم کرد

بۆ ژوورەکەم

کاتێ کەڕۆی

شانەیەکی بۆ جێ هێشتم.

بەڵام وەختێ ئەی کچی جوان!

تۆ بوویتە میوانی ژوورم

کاتێ ڕۆیشتی

لەگەڵ خۆتدا

گوڵو ئاوێنەو شانەت برد

بەڵام دوای خۆت

شیعرێکی ئێجگار نازدارت

بۆ جێ هێشتم.

شام/1987

# چاوپێکەوتنێکی ئەدەبی

ئەم بەیانییە بە پەلە

"کڵاوکوورە"ی ڕۆژنامە نووس

کڵاوەکەی کردە سەری و

چوو چنارێکی شاعیری هاوسێی بینی.

کڵاوکوورەی ڕۆژنامەنووس

تەنها یەك پرسیاری لێ کرد:

ـ چۆن و کەی و بۆ ئەنووسی؟

چنار وەك خۆی ڕابژەنێ وابوو.

تۆزێ مات بوو، لە دواییدا کەمێ جوڵاو

ئینجا وتی:

ـ زستانان بیر ئەکەمەوەو هیچ نانووسم!.

لەسەرەتای بەهارەوە وشەکانم

گۆپکە، گۆپکە، سەر هەڵئەدەن،

هەتا ئەبن بە هەڵبەستی چڵ و گەڵا.

لە هاویندا بیرکردنەوەم باڵا ئەکات.

وەك ئەزانن لە كۆتایی پایزیشدا

چاپ ئەكرێنو خەزانیش دابەشیان ئەكات!.

بە قەڵەمی سەوزیش نەبێ، من نانووسم.

بەدەم" سەما" یشەوە نەبێ

هیچ شیعرێكم ناخوێنمەوە!.

بۆ ئەنووسم؟!

ئەوەی ڕاستی بێ بۆ ئەوەی

دنیای ئەوین ڕوناكتربێو ئاو زۆرتربێ

هەرچی باڵندەی عاشقە خۆشیان بوێم

ئەم دارو بەردەیش تێم بگەن!

1988

# نەنکم

ئەم درەختانە، هەندێکیان، ڕەگەکانیان
درێژ درێژ بوونەتەوە، تیایاندایە
لەعەردەوە دەرپەڕیون‌و بوون بەڕێگاو
بوون بە سەکۆ.
نازانم بۆ؟
هەموو جارێ وەختێ هەنگاوی تەماشام
ئەیانگاتێ‌و بەسەریاندا ئەپەڕنەوە:
ئەو ڕەگانە، بۆ؟ نازانم..
دەماری شین‌و درێژی دەرپەڕیوی
پشتی دەستی، نەنکمم بیر ئەخەنەوە؟
نازانم بۆ؟

1988

# پاڵتۆ

ئەم پاڵتۆ کۆنە گیرفانی بەر باخەڵی‌و

ئەم لاو ئەولای

چەندین ساڵی گرمۆڵە بوو.

چەندین یادی هەڵوەریویان لەناودایە.

هەر کە دەستیان پیا ئەگێڕم

وا هەست ئەکەم

دەستم بەردەستی خاوەنی پێشووتری

پەنجەم بەر پەنجەی ڕابوردووی تر ئەکەوێ!.

کێ ئەزانێ؟!

دیسان کە من فرۆشتمەوە

کام دەستی تر بەر دەستەکانم ئەکەون؟!

کام پەنجەی تر پەنجەی یادی هەڵوەریوم

لەو گیرفانە کۆنانەدا

ئەدۆزنەوە؟!

1987

# خەڵات

تەماشاکە!

یەك مەڵبەندو

کەچی لەجێیەك بارانەو

جێیەکی تر ئێجگار وشکە!

ـ ئەوە هەور، لەم وەرزەدا، خەڵاتی ئاو

تەنها بەو زەویانە ئەدا

کە پار نەبوون بە ئوردوگای

ڕەوە کوللەو

ملیان نەدا!.

1988

# گەڕانەوە

پۆلەکەمان لێی کۆبۆوە

ئەم سوێسکەیە سبەینێ

لەمەنفاوە، ئەچێتەوە، بۆ هێلانەکەی وڵاتی.

سوێسکەکە باڵەکانی کردبۆوەو سەمای ئەکرد

ـ ڕەنگە سەرتان لێ بەمەوە

هیچتان ناوێ؟!

هەموو بەیەك دەنگ پێمان وت:

ـ فڕینێکی سەلامەتو

سڵاویشمان بگەیەنە بە سەربەستیی

1989

# کلێته

هەندێ قوتکە

بەفر زووتر کلێتەیان بۆ ئەچنێ.

ئەو کلێتەیەی دوێنێ شەو کردیە سەری

ئەو قوتکەیەی بەرامبەرم

بەرەبەیان

ڕەشەبا هات هەڵیوەشاندەوەو داو.. داو

لەقاچی شاخەوەی ئاڵان!.

1988

# تەنها یەکێکمان

ئێوارە بوو
بەتەنها هەر فریای سەر دەرکردن کەوتین.
وەك ئەو بارانەی ئەباریی
ئەبوایە ئێمەیش نەوەستین.
ڕیزێ فرمێسك بووین ئەڕۆیشتین.
ڕێچکەی دووکەڵی پەرت پەرتی
گوندێك بووین‌و بەشاخێکدا سەرئەکەوتین.
هەموو تەڕ تەڕ، چۆڕاوگە بووین.
لووتمان پلوسکی سەرمان بوو
قاچیش جۆگەلەی لەشمان بوو.
منداڵەکان: پەڕەسێلکەو
ژنەکانمان:دارودرەختی پایزەو
پیرەکانیشمان : لە ئەسپی شەکەت ئەچوون.
هەموو تەڕ، تەڕ، چۆڕاوگە بووین.
تەنها هەر یەکێکمان نەبێ

که لەژێر چەترەکەی خۆیدا
یەك دڵۆپ باران لێی نەداو
لەهەموویشمان ئارام تربوو
ئەویش منداڵی ژێر چەتری
چەرمی سکی ژنەکەم بوو!.

1988

# ئەم شاخە

ئا ئەو شاخە

پیرەمێردە مل باریکە

بەم ڕۆژگارە، بەو سەرەوە، هەر خەریکی

خوێندنەوەی: گردو ڕوبارو کێڵگەو دەشتە!.

هەورێ وتی:

ـ من ئەزانم ئەم سەر ڕووتاوەی ڕیشنە

چەند شیعری بەفروبارانو زریانو خۆری لەبەرە.

من ئەزانم چەند کورتە چیرۆکی جۆگەو،

چەند ڕۆمانی ڕووباری دورودرێژی خوێندۆتەوە

ئا ئەم شاخە پیرەمێردە مل باریکە

مەیبینە وا کزۆڵەیە، بیری تیژە.

لە بیرێتی بە چ ڕۆژێ ئاو ژانی گرت

بە ڕووباری نۆبەرەوە!

لە بیرێتی وەختێ ئاگر پێ ڕەوکە بوو.

ئا ئەم شاخە پیرەمێردە مل باریکە

من ئەزانم چەند دارستانی قاموس‌و
چەند پەڵکە گیای وشەی هەیە
ئا ئەم شاخە پیرەمێردە مل باریکە!.

1988

# لەبیرەوەرییەکانی "دارمێوێک"ەوە

لەناو دەفتەری ڕەزێکدا

دار مێوێ ئەم یادداشتانەی نووسیبۆوە:

ـ وا هەڵ ئەدەم!

ئەمڕۆ من بووم بە بەرسیلە.

هەر سەعاتێ بەر لە ئیستە

بەدزە دزەو ماتەمات

دوو منداڵی چەتون هاتن

دایانمە بەر گڵمتکو بەرد.

ئاخ! چەندم لێ هەڵۆەریە عەرد!

منداڵەکان، بە خوێی سەر لەپی دەستەوە

بە مڵچە مڵچ لێیان خواردم

هەتاکوو دانیان ئاڵ بۆوە.

بەڵام ئاخر خۆمن ناهەقیشیان ناگرم!

من ترشمو، ئاو زانە دەم،

لەو دوورەوە

سوێ ئەکاتە ناو دڵەوە.

عافێتیان بم!

ـ ئیستە من قژم پڕترەو بوم بەترێ

ئەمرۆ لە نزیك منەوە

بوو بە شەڕێ نەبێتەوە!

لە عەسرەوە تا ئێوارێ، شەڕ خایاندی

لە دوای شەڕیش پێشمەرگەیەکی زامدارم

لەژێر گەڵامدا شاردەوە.

لە ژێریشەوە دەستم برد

یەك دوو هێشووم لە سنگی خۆم بۆ کردەوەو

دامە دەستی!.

ـ ڕنیویانم، بەڵام لەناو کونە بەردا

چەندین هێشووی فلیقاوەم

بوون بە بادە.

دوێ ئێوارە، شاهۆیەك بوو بە میوانم

لەئاوی ئاڵی خواردمەوە

هێندەی نەبرد شاهۆ مەست بوو

سەرخۆش.. سەرخۆش

نە لەسەر قاچ، نە لەسەر کلك خۆی نەئەگرت!

ئیتر بەدەم خواردنەوەوە، تا درەنگان

هەتاکوو نووست

"شاهۆ" هەر شیعری "بێکەس"ی

بۆ من‌و ڕەز ئەخوێندەوە!.

ـ بەفر ئەباریٚو بووم بە مێوژ

کراومەتە ناو قاپەوەو

لەبەردەمدا دانراوم.

داپیرەیەکی قژ سپی

زارۆکانیش بەچوار دەورا.

وەك تامی من

حیکایەتی ئەمشەو خۆشە.

کە داپیرەیش گەیشتە سەر:

"هاتمەوە هیچیان نەدامیٚ"

لەناو بنی توورەکەدا

منیش هیچی وام نەمابوو

هەتا بخوریٚ!.

1988

# بوخچە

ڕۆژێ هەنگ بوو بە هاوڕێم.

شەوێ قەڵەمەکەم نەنووست

هەتا شیلەی شیعرێکی تازەی نەدامێ.

ڕۆژێ کرمی ئاوریشمێکم بوو بە ئاشنا

شەوێ ئاوریشمی خەیاڵم

قەد.. قەد

خۆی لە وشەمەوە پێچا.

ڕۆژێ کۆترێ بوو بە دۆستم

شەوێ ئەوینێکی سپی

هاتە لامو

چەپکێ تیشکی دایە دەستم.

ڕۆژێکی تر گوڵەگەنم بوو بە ئاشنام

شەوێ تیرۆکی قەڵەمم ناسکە نانی

وشەی ئاڵی بۆ کردمەوەو هەتا دوایی

لەسەر سەبەتەی دەفتەرم هەڵمچنی.

بەڵام وەختێ کە هەژارانی کوردستان

بوونە هاوڕێم

شیلەو ئاوریشمەو تیشکەو نانم هەر هەموو

خستە بوخچەی دەروونەوەو

ئەو بوخچەیەشم دا بەوان!

1988

# خائین

شەوەزەنگێ گردێکی گڕوێی تەفرەدا
ـ هەر تۆ بیکە! بەڵێن، وات لێئەکەم سەرت
خۆی با لەسەری حەسارۆست!
بەر لەوەی ڕۆژ ببێتەوە
شەوەزەنگ گردەکەی کڕی.
گرد بە پاچەکۆڵەی دەستی
چەندین قارچکی ژەهراویی
خۆی هەڵکەنی.
لەدۆڵێکدا هەمووی گوشیو
کردیە جامی بەردێکەوەو
لەبەردەمی هەڵۆیەکی زۆر تینوودا
جامی دانا!.

1988

# خەم

مانگی نەورۆز سکی پڕبوو بەئاگرێ
کە ئاگر بوو "با" ڕای ژەندو
کە گەورە بوو چیا خواستیو
شەویان لێبوو
وەختێ شەویش باڵای کردوو
بوو بە شانزە
گریان خواستیو هەر ئەو ڕۆژە
سەعات یانزە
یانزە.. یانزە
خەمێکیان بوو
قژ ڕەش، چاو ڕەش.
گەورە.. گەورە
ئەوەندەی شاری هەڵەبجە!

1988

# یەکەم دەنگو دوادەنگ

دەقیقەیەك، نیو دەقیقە، چەند چرکەیەك
بەر لە یانزە
ئاسمان وەك گیانی "مەولەوی" سافو ڕوون بوو
وەك ئەسپەکەی "ئەحمەد موختار"
لە بڕۆیّنی شارەزووردا
جوانووی بەهار بە کورڕژن بوو
گردی "گولان"
گولّ ئەستێرەی شەمی شیعری
ئەدا لە قژ
وەکو گۆران
دەقیقەیەك، نیو دەقیقە، چەند چرکەیەك
بەر لەیانزە
لەژێر بنمیچی ژورێکی، بێ هەناوی، هەڵەبجەدا
خێزانێ بوون، دایکەو باوکەو زەڕنەقووتە
چەند چرکەیەك بەر لە یانزە

دایك بێشكەی ڕائەژەندو

ساوا بزەیەك ئەیگرتو

باوك گوێی لە كاسێتێ ئەگرتو

پاڵ كەوتبوو.

بوو بەیانزە

گرمەیەكو دووانو سیانو

دووكەڵێك و وەكو دڵی كوڕی "عۆجە"

هەوا مردوو

ئاسمان مردوو

بەهار مردوو

دایكەو باوكەو زەڕنەقووتە

لە یانزەدا

لەژێر بنمیچی ژوورێكی بێ هەناوی هەڵەبجەدا

بوون بەسێ بەردە پەیكەری

باوەش كردوو بە یەكترِدا!

لەدوای یانزە

شار كۆترێكی خنكاو بوو، ملی لەژێر باڵەكانیا

نە گمەی ئەو، نە جریوەیەك نە جووكە

نەچرپەیەك

نەزیقەیەك

نە مشەیەك، نە هەناسە

لەدوای یانزە

تەنها دەنگێ، چریکەیەك، لەو شارەدا

کە ئەگەیشتە گوێچکەی چیاو

بەناو ژەهرا

سەوڵی ژیانی لێ ئەدا

تەنها دەنگێ

لەدوای یانزە

دەنگی کاسێتی ڕیکۆردی ژوورەکە بوو

کە سروودی چەكو پێشمەرگەی لێ ئەدا!.

# دەریاچە

بەڕێوە بووین..
ئەو شەوە تیروتوانجی
زۆرمان گرتە پیرە زستان!
پێمان وت تۆ هەتا ئیستا
هەر بەدەستی کڕێوەی خۆت
بەپاچو پیَ مەڕەی "سەرما"ت
چەندین گۆڕە بەفری قوڵت بۆ هەڵکەندوین
لەهەناوی بەستەڵەکتا زۆرت ناشتووین.
ئەو نەی وت: نا!
بەڕێوە بووین، ئەو شەوەیان
ئێمە لە باهۆزی زستان تووڕە تر بووین.
نەمان ئەهێشت دەم کاتەوە:
پێمان وت تۆ خێرت نییە!
پێمان وت تۆ چارە ڕەشی!
پێمان وت تۆ بەدی، شوومی
تۆ.. تۆ.. تۆ!

ئەمجارەیان ئەو وتی: نا!

نیوەشەوبوو، ئەچوینە سەر سەربازگەیەك.

ماسیی ئەندێشەو خەیاڵمان

هەر لەلای دەریاچەکە  بوو

"چۆنی لێدەین؟! چۆنی ببڕین؟!"

پێشتر دوو بەلەممان هەبوو

بەڵام کوڕانی "بنی عاص "

لەگەڵ ڕەزەکەی ئەوبەردا

ئەوانیشیان سووتاندبووا!.

بەڕێوە بووین، ماسیی ئەندێشەو خەیاڵمان

هەر لەلای دەریاچەکەبوو

هەر ئەویش تاقە ڕێگەبوو

وەختێ گەیشتینە کەنار

زستان سمێڵێکی باداو

زەردەخەنەی تەوسێ گرتیو

ئینجا وتی:

ـ لە کرێوەشما خێر هەیە!

تەماشاکەن:

بەدەریاچەم وت بیبەستێو

ببێ بە ڕێگای سەهۆڵو

ببێ بە مەیدانی شەختە.

چۆنم پێ وت ئەوەتا بوو.

دە دەی ئیستەیش فەرموون بێ ترس

یەکە.. یەکە

بپەڕنەوەو

بگەنە ئەو شوێن مەبەستە!.

1988

# له پاسێکدا

هێشتا پاسە ڤڕ زەردەکە هەر وەستاوە

یەکە یەکە سەرئەکەون

هەر کورسیەکەی تەنیشتی من

تاقە کورسیە ڤڕ ڕەشەکەی تەنیشتی من

هەتا ئیستە

هەر ئەو چۆڵە.

هێشتا پاسە ڤڕ زەردەکە هەر وەستاوە

سەرئەکەون‌و ڕووناکەنە

تاقە کورسیە ڤڕ ڕەشەکەی تەنیشتی من

وەستاون‌و نایانەوێ بچنە لای ئەو

بۆنێکم کرد

بۆنی ناخۆشی لێ نایەت

سەرخۆش نییەو

بەردەوامیش بزەیەکی لەسەر لێوە!.

هێشتا پاسە ڤڕ زەردەکە هەر وەستاوە

**تاكو تەرا سەرئەكەون**

**ئەوا ئیستا تاقە كورسیە**

**قژ ڕەشەكەی تەنیشتی من**

**هەروەكوو خۆم**

**قژ ڕەشێكی لەسەر دانیشت**

**پاسەكەیش ڕۆیشت!**

ئەڵمانیا/1988

# گەلی بازێ

زووتر ئەگەر ڕەشەبایەك
لە گەلیەكەی "عەلی بەگ"ی بپرسیایە
ئەرێ چاوم! من پەلەمەو
تۆ نازانی "گەلی بازێ" لە كوێدایە؟!.
ئیتر دوایی ئەو ئەبوایە
سەعاتێ دەفتەری بەردوو
كۆنە باوڵی ئەشكەوتو
ژێر سەرینی هەردەكانی بگەڕایە
تا ئەدرەسی گەلی بازێی ئەدۆزیەوەو
تا ئەیدایە!.
زووتر ئەگەر باڵدارێكی عاشقی وەك
تاق تافكەرە
بەلای "گەلی زاوێتە" دا تێپەڕبوایەو
بیپرسیایە:
ئەرێ گیانە! تۆ نازانی

گەلی بازێ، لەکام لایە؟!
ئەو ئەبوایە
عەینەکی گەڵا سنەوبەر لەچاوکاتو
بەرباخەڵی تەڕی کەژان بگەڕێتو
یەکە.. یەکە
ژێر دۆسییەی گڵەسووری
کێڵگەکانی هەڵباتەوە
تا ئەدرەس بدۆزێتەوەو
بیداتە دەست تاق تاقکەرە!.
لەمەو پێشتر
ئەگەر بەرانە کێویەك
بەتەنیشت "گەلی بەدران" دا تێپەڕبوایەو
بیپرسیایە:
ئەرێ قوربان!
ئەرێ بەدران!
من ڕێگەم بزر کردووە
تۆ نازانی گەلی بازێ کوێ کەوتووە؟!
ئەو ئەبوایە
جارێ تۆزێ سەری بخوراندایەو
ئینجا سەعاتێ گیرفانی شەڕواڵەکەی "مامە ڕووتە"
بگەڕایەو
چەکمەجەی پلە پلەی کێو، ڕاکێشێتو

هەر بەئەنقەست
دووسێ چرپە بەگوێی "سەردێمان" دا بکاو
ئەوسا ئەدرەسی باتە دەست!
بەڵام ئیستە
نەك هەر "گەلی عەلی بەگ"و
نەك هەر "زاوێتە"و نەك "بەدران"
هەرچی گەلیی کوردستانە
هەرچی دەربەندو ئەشکەوتە
وەختێ پۆستەی شەهیدانیان بۆ ئەنێردرێ
وەختێ نامەی سنەوبەرو
فرمێسکی "ئەحمەدی خانی"و
تاڵە قژی سەری "زین"و
عەشقی "مەم"یان بۆ ئەنێردرێ
لەهەر کوێوە
با ئەوەندەی "نەگەزاکی"و "شێخ وەسان"یش
لەیەك دووربن
لەهەرکوێوە
با ئەوەندەی "هەڵەبجە"یش و "هێرۆشیما"یش
لەیەك دووربن!
لەهەر کوێوە.. لەهەر کێوە بۆیان بچێ
پێیان ناگات
ئەگەر بەهۆی

**ناونیشانی "گەلی بازێ"وە نەبێتو**

**ناوی ئەویان لێ نەنووسرێ!**

1988

## پرشنگەکان

ئەم چارەنووسە، بەتەنها
هەر لەسەر تەوێڵی سەنگەر نەنووسراوە.
ئەم ڕێگایە بەتەنها هەر
ناچێتەوە سەر وڵاتی گڕو باروت.
باخەکانی ئەم ئەوینە بەتەنها هەر
یەك جۆر گوڵیان، تیا  ناپشکوێ.
ئەم ئەسپەمان هەر بۆ غاری شەڕگە ناوێ.
ئەم دەستانە هەر بۆ تفەنگ دروست نەبوون.
خۆ بیرمان هەر تاقە کلیلێکی نییە.
ئەم کوردستانە بەتەنها هەر ژان
بەیەك جۆر ڕووەكو
دارو درەختەوە ناگرێ.
باڵای ئازادی بەتەنها
هەر بە باڵای چەك ناپێورێ.
چەرم هەر فیشەك لغی لێ دروست ناکرێ.

**سەربەستیی هەر بەیەك زمان قسە ناكاو**

**هەر یەك جۆر بەرگ ناپۆشیٚو**

**یەك كڵاویش لەسەر ناكات.**

**ئەم زەریایە هەر یەك جۆر كەشتیی نایبڕیٚ.**

**خۆ هەر بەتەنهایش سەفینو گۆیژە شاخ نین.**

**هەر "بێكەس"و "حاجی قادر" پێشمەرگەنین.**

**با، ئەتوانین، لەیەك كاتدا، سەرمان بكەین**

**بە هێلانەی شیعرو نۆتەو،**

**یان بە سنووقە فیشەكیش.**

**با، ئەتوانین، دەستمان بكەین، بە جۆگەلەو**

**بەدەسرازەو، بە برووسكەو بە شمشێریش.**

**ئەم وشانەیش ئەتەقێنرێن.**

**ئەم فلێچانەیش ئەكرێن بە تیر.**

**بۆ؟ ئەتوانین، لەیەك كاتدا، پەنجەكانمان**

**پێشكەشی پیانۆو كەمانو گوللەو گوڵ كەین.**

**ئەتوانین گەروومان بكەین، بەدەربەندوو**

**دەنگمان بكەین بەڕەشەبا**

**ئەتوانین چاوێكمان بكەین، بە چراوگی ناو ئەشكەوتو**

**ئەویتریان بە ئەستێرەی شانۆكانی هەموو دنیا!.**

ستۆكهۆلم 1988

# تونێل

لەژێر زەویی تەنگەنەفەسی ئەم ڕۆحە کون کونەدا
سەعاتەکانی غەریبیم
واگۆنی لەیەك بەستراون.
هەموو ڕۆژێ ئەڕۆنو دێن، دێنو ئەڕۆن
لەوێستگەی چاوەڕوانیدا
لەوێستگەی ماڵ ئاواییدا
دەرگای نەسرەوتیان بێ وچان:
ئەمکەنەوەو پێوەم ئەدەن
پێوەم ئەدەن ئەمکەنەوەو
یەك ئازارم داببەزێ
سەد ئازارم سەرئەکەون.
چ تونێلێکی درێژە ئەم غوربەتە، بۆ کوێم ئەبات؟!
وا چراوگی ئەم چاوانە کەوتوونەتە پرتەپرتو
بەڵام ئەو هەر، ئەمبات، ئەمبات
ئەمبات..!

1988

# گۆڕران

هەمان باخچە.

هەمان درەخت.

هەمان کورسی.

بەڵام نە هەمان باخەوان.

نەهەمان گەڵاو لقو پۆپ.

نەهەمان عاشقو دڵدار!.

1988

## شوێنەون

پێت ناگیرێم
وەکوو زریان من ماڵێکی
دیارم نییە.
وەکوو هەتاو من پەنجەرەو
دوو پەنجەرەو،
سێ پەنجەرەی،
ئاسۆیەكو
چیایەكو
هەوارێکی دیارم نییە.
من مێژوویەکی کۆچەریم
زەمانم داوە بە کۆڵماو
هۆبە.. هۆبە
لەگەڵ خۆمدا ئەیگەڕێنم.
کلێپەو گڕێکی کۆچەریم
ئاگردانم لە گیانمایەو

ئاسۆ.. ئاسۆ

لەگەڵ بادا ئەیگەڕێنم.

ڕووبارە خوێنی کۆچەریم

شەپۆلم وا لە دەنگمایەو

ئاواز.. ئاواز

لەگەڵ هەورا ئەیگەڕێنم.

من شۆڕشێکی کۆچەریم

ـ جێگەـ م خستۆتە مشتمەوەو

برین.. برین

لەگەڵ چەکمان ئەیگەڕێنم.

من.. مەقەڕو

وەرزی ساڵو

ئیستگەو سروودو گۆرانیم

هەمووی لە هەگبەی پشتمایەو

هیوا.. هیوا

لەگەڵ عەشقی ئازادیدا

کەژ بەکەژ ئەیانگەڕێنم.

پێت ناگیرێم.

ئیستە لێرەم

لێرە تۆوی ناو قەندیلی شەختەو بەفرم

بەڵام سبەی لە گەرمیان سنەوبەرم.

دوێنێ دەواری گڤەی خۆم

لەولا هەڵدا

ئەمڕۆ لەم لا

سوورە بەڕووی سەرکێویێکی بەرزترم.

باران ماچی

هەر شوێنێکی خاکمی کرد

منیش لەوێم.

تاریکی تۆ لە هەر کوێ بێ

من لەو شوێنە پێ ئەبم‌و دائەگیرسێم.

پێت ناگیرێم.. وردە.. وردە

من مردنتم.

ئەو وەختەی تۆیش پێ ئەکەنی‌و

وا ئەزانی لەناو چنگتام

من هەر زووتر

ئەبمە مووروی غەیبی تیشك‌و

ون ئەبم‌و

لێت بزرم.

ستۆکهۆڵم 1988/4/1

# فڕین

له سەرەوە مانگە شەوێ باوێشکی دا
له خوارەوە کانییەك نووست!.
لەوبەرەوە لوتکەی  شاخێ باوێشکی دا
لەم بەرەوە نزارێك نووست!.
که سەنگەریش لەولامەوە باوێشکی دا
له گێرفاندا قەڵەمم نووست!.
گرمەی هەور مانگە شەوی داچڵەکان‌و
کانیی هەستا
زریان لوتکەی ڕاوەشان‌و
نزار ڕا بوو
که پێشمەرگەیش دیسان سەنگەری گرتەوە
خستیەوە سەرپێ تفەنگی
قەڵەمی منیش ڕاپەڕی‌و
هەڵۆی شیعرم بەرز بەرز فڕی!

1988

## سۆما

لەکۆشکێکدا چەپکە گوڵێ
بە گوڵدانە زێڕینەکەی خۆی، ئەمەی وت:
تا دوێنێ بوو
هەتا لەو دەشتودەرە بووم
تا گەدا بۆنی ئەکردم
گەڵایش چەتری سەوزی دەستی
بەر باران‌و هەتاوم بوو
لە باڵندەو درەختەوە تا باو بەفر
ئاشناو ڕۆشناو هاوڕێم بوون
تاقانەی خۆشەویستیی بووم
ماچم گوڵاوی ناودەمی ژیانم بوو.
لە دوێنێوە کە هاتوومە
ناو باوەشی کۆشکی تۆوە
لووتی پاشا بۆنی عومرم هەڵئەمژێ
خۆم ئەبینم وا ئیستاکە

من بوومەتە چوکڵی چقڵێ

کە سۆمای چاوی بەهاری

خۆی ئەکوژێ!

1988

# دوو پیاو

ژێر زەمینێكو دوو پیاوو

پانكەیەكو ئەسكەملێ

یەكەم پیاویان:

پێشتروو زوو

ژێر زەمینەكەو پانكەكەو كورسییەكەیشی

بەدەستی خۆی خولْقاندبوو.

ژێرزەمین بۆ عەمباری ئارد.

پانكە بۆ فێنك كردنەوەی ڕەنجی هاوین.

كورسیەكەیش بۆ پشوودانی وشەی هیلاك.

دووەم پیاویان:

هەر بە پەلە

ژێر زەمینەكەی بەتاڵ كرد

ئەسكەملی كرد بە پلە

یەكەم پیاوی لە هۆش خۆچوو

خستە سەروو

لەوێشەوە

# جوانترین دیاری

لەو کەژەدا

لەو کازیوەی بەیانەدا

یادی جەژنی لەدایك بوونی نێرگز بوو

دیاریی هاتوو

لە ئاسمانو لەعەردەوە

لەبەردەم کچی قژ زەردا

تا ئێوارە

هەر ڕیز ئەکرا.

ئەوەی نێرگز هەتا ئیستە بیری مابێ

لەبەر دڵی

سێ دیارییان جوانترین بوو:

کڵاوە قوچەکەی بەڕوو.

ملوانکەکەی خاڵ خاڵۆکە.

پۆپەشمینێکیش کە پێشتر.

کرمی ئاوریشمێکی عاشق

بە چوار زستان بۆی چنیبوو

لەناو ژووری "ئینفیرادی" زیندانەوە

بۆی ناردبووا.

1988

# سیحرباز

نە بووزیمو نە هیندۆسیو نەسیحرباز

نە ئارد ئەکەم بە کۆترو

نە کۆتریش ئەکەم بە ئارد

نە ئەتوانم چەوەندەریش..

ئا لەم عەردەدا دەربێنم

نە چاویشتان تەفرە ئەدەم

نە کەسیشتان بە خەوتنی موگناتیسیی ئەخەوێنم!

ئەوە سەرم خۆ ئەیبینن؟!

هەموو ڕۆژێ وەك سەلکەتوور نایپەڕێنن؟!

ئەوە دەستم خۆ ئەیبینن

هەموو ڕۆژێ وەکوو قامیش نایقرتێنن؟!

هەموو ڕۆژێ.. کوت کوت.. پل پل

نام کەن بە شیشی سوڵتانو خەلیفەوە؟!

خۆ ئەشبینن؟!

ئەوە سەرم ئەڵێی قەڵاکەی هەولێرەو

وا لەجێی خۆی

خۆ ئەشبینن؟! دەستەکانم

دوو ڕیانی کفریو دووزن

هەر لە جێی خۆن

سیحرباز نیم بەڵام من ڕۆژی چەند جارێ

چاوی کوڵراوم هەڵئەگرم ئەیچێنمەوە

قاچی پەڕیوم هەڵئەگرم ئەیڕوێنمەوە

سیحرباز نیم جەللادەکەم سیحربازە

ئەو جادووگەرەی یەك جارەو

هەر کە سەریم دایە دەستتان

ئەوسا ئیتر.. ببڕای ببڕ

نەخۆیو سیحر، نە سەری

جارێکی دی نایەنەوە!

# بیرچوون

لەسەر مێزەکە بیرت چوون
بەهێواشی وەك دەس بەرم
بۆ دوو کۆتری سپی نوستوو
هەڵم گرتن.
لە دەرەوە چنگ لەسەرشان
با کلۆ بەفری ڕاو ئەنا
جەستەی باریکە شەقامی هەڵ ئەلەرزان.
هەر خۆم تەنیا
ملیوانی خەیاڵە گەرمو گوڕەکەم بۆ هەڵبڕیو
کەوتمە ڕێگا
ـ ئەی کچەکە!
بەڵام هەتاکوو ژوورەکەم
پەنجەکانت لە دەستما بوون
تا نوستیشم دەستەکانت لە ملما بوون
ئای کچەکە!
یەکە.. یەکە

هەر دە پەنجەیشم هەڵوەرێن

بیرم ناچێ

شەوی جووتە دەسکێشەکە!

# شۆڕبوونەوە

بەناو قەدی درەختێکدا شۆڕبوومەوە

لەویٚ ژانی ڕەگم دێوە

کە بەقوڵایی ڕەگیشدا شۆبوومەوە

لەویٚ ژانی ئاوم دێوە

کە بەقووڵایی ئاویشدا شۆڕبوومەوە

لەویٚ ژانی خاکم دێوە

کە بەقوڵایی ژان خۆیدا شۆڕبوومەوە

دنیای هەژاریم بینێوە!

## یـــاد

لەئاگردا کە داری تەڕ خوڕخوڕ ئەگری
ئەوە یادی ئەو دەزگیرانی هەتاوەی
ئەکاتەوە
لەژوانی پایزێکی درەنگ وەختا پێی نەگەیی
وەختێ باران هاتو بەفر
بەژنی ڕووتەڵەی داپۆشی.
ئەوە بۆ ئەو یادی دەزگیرانی هەتاوەیە
عەشقی ناکامی کەف ئەکاو
بەکوڵ ئەگری!

5

## لێره

لێره، مەنفا لەدوای مەنفا

ساڵ لە دوای ساڵ

تاڵ لەدوای تاڵ،

قڕی سۆزی ڕۆژهەڵاتیی

قڕی وەفا

لەسەر شۆستەی کۆنکرێتیی

نامۆییمان هەڵئەوەرین!

چ کارەساتێکە برا!

ئێمە بەرەو:

"گیان ڕووتانەوە" مل ئەنێین!

# خۆشەویستیت

خۆشەویستیت لە "با" ئەچێ
وەختێ بمەوێ داگیرسێم
دێتو ئەمکوژێنێتەوە.
خۆشەویستیت لە "با" ئەچێ
کە دایشگیرسام
دێتو ئەمگەشێنێتەوە.

ستۆکهۆلم 1988/3/8

## بیرەوەری

لەبیرم دێ
بۆ یەکەم جار
سەربان‌و چیغ‌و کچێك‌و مانگە شەوێ
شەمامەی خاڵ خاڵی بەهرەو
شیعریان دامێ
بانگی شێوان :
پەیژە بردمیە لای سەربان
سەربان بردمیە لای هاوین
هاوین چیغێکی بۆ گێڕاین
چیغیش مانگی تیا دابەزی
مانگیش لەسەر بەستەکەنوێن
چرای چاوی خۆی بۆ داناین
لەچیغی دراوسێشەوە
کچێکی جوان، دەس خەناویی
دووسێ ناوساجی بۆ هێناین!.

1988

# یەکەم منداڵ

بەشیری مەمکی شاخێکم
لەناو لانکەی پشکۆیەکدا،
وشەیەکم پەروەردە کرد
کە گەورە بوو
لە ئاهەنگی نەورۆزێکدا
لەگەڵ چەکێکی قژ سووردا
یەکیان ناسیی
تفەنگ خواستیو
خوێنیشم کردی بە شایی!.

# تەختەبەند

ئەو تریفەی مانگە شەوەی،

کە شیعرێکم دابووی لە قژی درێژت،

دەستم بردوو

بە هێواشی لێم کردەوە.

ئەو شەپۆلەی کە چیرۆکێکی زۆر کورتم

وەکوو پشتێن لە کەمەرتی ئاڵاندبوو

دەستم بردوو

بە هێواشی لێم کردەوە..

ئەو کراسی ئاودامانەی ڕۆمانێکم

کردیە بەرت

دەستم بردوو

هێدی.. هێدی

ئەویشم لەبەر داکەندی.

شا ژنی جوان!

بەتەنها هەر ئەو تەختەبەندەم هێشتەوە

**که شانۆیەکم کردبووی**

**بە چرپای خەوی هەردووکمان.**

ستۆکهۆڵم 1988/3/7

# زیندانی گەڕۆك

**لەم کۆچەدا**

**ئەمە هەموو نیشتمانە:**

**چوار دەنکە ترێی هەڵوەریو،**

**لەناو دڵماو**

**دڵیش زیندانی گەڕۆکەو**

**شار بەشاری ئەم جیهانەیش**

**وەردیانە!.**

ستۆکهۆڵم 1988/2/25

# تۆ

**كە لێرەوە**

**چاوی تەنیایم ئەبڕمە چاوی یادت**

**ئیستەم لەناو دوێنێی تۆدا**

**وەك خۆرنشینی پایزێ**

**وردە وردە نوقم ئەبێ.**

**هەموو جارێ بیرم ئەچێ**

**غوربەتی لەسەر ئاگرم**

**داگرم تاکو نەسووتێ!.**

**وەختێ لەلای تۆ دێمەوە**

**کالانەی چاو پڕ دووکەڵەو**

**دڵۆپ.. دڵۆپ**

**ئەوینێکی بە هاڵاوی، لێ ئەڕژێ!.**

ستۆکهۆڵم 1988/2/25

# سەروپێچ

من کلاَّوو سەروپێچێ
مشکیەكو جامانەیەك
فێریان کردم:
چۆن خۆم لەدەوری سەری ئەم
شاخو کێوانە بگێڕم.
فێریان کردم
یەکەم وانەی عەشقی لوتکە
لەلای سەری، خاوەنی ئەوان، بخوێنم!.
من کلاَّوو سەرو پێچێ
مشکیەكو جامانەیەك
فێریان کردم
وەختێ سەرم ئەخەنە ناو قەفەزەوە
من تفەنگی بالاَّبمو لەسەر پێ بم.
ئەزانن کام سەروپێچو کلاَّو ئەڵێم؟!
ئەو کلاَّوو سەروپێچەی

**ئەو جامانەو ئەو مشكییەی**

**كە شێخ لەناو قەفەزەوە**

**وەك تفێكی ئێجگار گەورە**

**كردیە سیماو**

**گرتیە تاجی ئینگلتەرە!**

ستۆكهۆڵم 1988/2/24

# کۆست

لەبەیانیی ئەو کۆستەدا

دەستو مەچەكو بازوومان

وەك خۆی مابوو

بەڵام سارد، سارد

بەڵام سڕ، سڕ

وەکوو پێمانەوە نەبێ وابوو.

لە بەیانیی ئەو کۆستەدا

قوڕگو مەڵاشوومان مابوو

بەڵام دەنگمان وەکوو گوللەی چەکەکانمان

ئەویش هاواری چرووكو

ژێی پسا بوو!.

دەسمان، دەنگمان، لە چی ئەچوو؟!

من خوێنی خۆم گرتبوومی

نەمزانی بڵێم وەکوو چی؟!

دایکم وتی:

ـ وەکوو لوولەی یەخسیرو زنجیرکراوی

تۆپەکانی وەستا ڕەجەب!

ستۆکهۆلم 1988/2/24

# دوو پەیکەر

لەبرۆنزی سەعاتەکانی ڕۆژگارو
لە ئاسنی شەوی درێژ!
مێژووی پەیکەرتاشی ئێمەیش
هەر لەسەر سەکۆی دوێنێ بوو
بۆ مۆزەخانەی سبەینێ
دوو پەیکەری بۆ داتاشین:
یەکەم پەیکەر: ئەحەی کوڕنو!
دووەم پەیکەر: مەلای خەتێ!
لەکۆڵێندا نەیشێواندن
کوڕنوو وەك خۆی
خەتێ وەك خۆی
باڵا باڵاو، چاو هەر چاوو
لوت هەر لوتو، برۆ.. برۆ!
تەنها ئاڵو گۆڕێ نەبێ
پێڵاوەکەی ئەمی کردە سەری ئەوو

**مێزەرەکەی**

**ئەویشی بۆ قاچی ئەمیان**

**کرد بە پێڵاو!**

ستۆکهۆڵم 1988/2/23

# ژیان

هەر کوتو مت
وەکوو سوڵتان
شێری باخچەی "بابی عالی"
ئەویش گەڕبوو
نەڕەی نووساو
گوێی تەپ کردوو
مێژوو خواردی!.
هەر کوتو مت
وەك "فرایزەر"ی هیندستان
پڵنگەکەی جەنەراڵی
دوورگەی ڕێوی
ئەویش گەڕ بوو
گەرووی نووساو
گوێی تەپ کردو
مێژوو خواردی!

لەجێی سوڵتانو جەنەراڵ

لەجێی ئەو شێرو پڵنگە

ئەوەی ژیا

ئەوەی ئەژی

گوێ درێژەکەی "نالی"یەو

ئەویتر بزنەکەی "غاندی"

ستۆکهۆڵم 1988/2/22

# جودایی

**ئەگەر لەناو شیعرەکانما**

**گوڵ دەراوێژنە دەرەوە**

**لەچوار وەرز، وەرزێکم ئەمرێ.**

**ئەگەر یار بێننە دەرەوە**

**دووانم ئەمرن .**

**ئەگەر نان بێننەدەرەوە**

**سیانم ئەمرن.**

**گەر ئازادیی بێننە دەرێ**

**ساڵم ئەمرێو خۆیشم ئەمرم.**

ستۆکهۆڵم 1988/2/20

# یادداشت

گوڵ یادداشتی خۆی نووسیەوە

نیوەی یادداشت

لەسەر نیگای جوانی ئاو بوو.

ئاو یادداشتی خۆی نووسیەوە

نیوەی یادداشت

لەسەر بەژنی شۆخو شەنگی دارستان بوو.

دارستانیش کە یادداشتی خۆی نووسیەوە

نیوەی یادداشت

لەسەر خاکی دەزگیران بوو.

کە خاکیشم یادداشتەکانی نووسیەوە

هەموو یادداشت

تێکڕای یادداشت

لەسەر دایکی میهرەبانی ئازادیی بوو!

ستۆکهۆڵم 1988/2/19

## تەماشاکردن

هەموو پایزێ ئەیبینم، ئەو ئەشکەوتە
چاوێکی ناوە بە کونی دەروازەی ئەو دەربەندەوە
چاو هەڵنابڕێ.
لەوێوە بە: دزییەوە
تەماشای لەشی نەرمۆڵەو سپیو سۆڵی
ئەو دار هەرمێیانە ئەکات
کە ڕووتو قووت ڕاوەستاونو
یەکە.. یەکە
خۆیان داوەتە بەر پرشەی تاڤگەکە!.

1989

# بەخیل

درەختێکی تریان وتی:
ـ ئەم داربییە چەند بەخیلە
ڕێی لێ گرتووین، ڕێگە نادا
ئەیەوێ هەر خۆی بە تەنها
دەم بخاتە دەمی کانیی
تاقە کانیی ئەم دۆڵەوە.
چەند بێ هەستە!
ئاخر خۆ ئێمەیش درەختین
تینوومانەو
لەکەیەوە ڕاوەستاوین!

1989

# وەسێت

لقی داریَ وەسێتی کرد هەر وەختێ مرد
بیکەن بە بێشکەی منداڵێ.
بێشکە وەسێتی کرد کە مرد
بیکەن بە پنەی بەردەمی
ڕیزە چادر و دەواریَ.
پنە وەسێتی کرد کە مرد
بیکەن بە کورسی بۆ چرای
ماڵە فەقیرو هەژاریَ.
کورسی وەسێتی کرد کە مرد
بیکەن بە سەری مەرکانەی
ئاوی کەرکوکی غەمباریَ.
"سەر"یش وەسێتی کرد کە مرد
بیکەن بە چوارچێوەی وێنەی
"بادینان"ی بە ئازاریَ.
ئەویش وەسێتی کرد کە مرد

بیکەن بە سنگی دیواری

جلی پێشمەرگەی نێو شارێ.

سنگیش وەسێتی کرد کە مرد

بیکەن بە شانەی دڵدارێ.

شانەیش وەسێتی کرد کە مرد

بیسوتێنن‌و لە دواییدا

خۆڵەمێشی بکەن بە سەر

گوڵکۆی قژی منداڵێکی هەڵەبجەدا!.

1989

# ناو

هەبوون.. نەبوون
دوو ئاسکی عاشق هەبوون.
شەوێك، شەوی مانگە شەوێ
لە مێرگی بەر تریفەدا پاڵ کەوتبوون
باسێ لێرەو باسێ لەوێ
کە هاتنە سەر خۆشەویستیی
وتیان: با هەر یەکەو "ناوی"
یارەکەی خۆی بۆ یادگار
لەسەر شتێ هەڵبکەنێ.
بابزانین ناوی کاممان
لەدوای خۆمان هەر ئەمێنێ و
وەك ئەستێرە ئەجریوێنێ؟!
یەکەمیان چووە لای کەوێ
کەویش لەسەر تاشەبەردێ
بە چەند مانگێ
ناوی یارەکەی بۆ هەڵکەند.

بۆ هەق دەسیش، کە لێبۆوە
ئاسکی دڵدار: پڕ بە کڵاوی بەڕوویەك
مسکی دایە!.
ڕۆژ هاتو چوو.
بەردی بەر بارانو بەفر
لەشی تێك چوو
شوێنی هەڵکۆڵێن ساف بۆوە
"ناو" چووەوە.
ئەویتریان
چووە لای حاجی لەق لەقێ
لەبەر دەمیا خۆی پاڵ خستو
لەچەند جێوە
لەسەر پێستی ئەم دڵدارە
بە دەنووکە درێژەکەی
ناوی یارە شیرینەکەی
بە خاڵ کوتی.
کە لێبۆوە، ئەمیشیان هەر لەجێی هەق دەس
پڕ بە گوپی خونچە گوڵێ، مسکی دایە.
ڕۆژ هاتو چوو
ئاسکی عاشق، ڕۆژێ کوژرا..
دوای مردنیش، کە گوروویان
پێستەکەیان بەقەد دیواردا هەڵواسی

**ناوی کوتراو، خاڵ خاڵی شین**

**هەر مابۆوەو هەر ئەژیاو ئەیجریوان!.**

1988

# وەکوو یەك

ئەم گۆمەیش حەپس کراوە! ئەی نازانن؟
ئەم شەپۆلە بەندکراوانەیش هەر وەکوو
کوڕەکانی ئێمەی ئەودیو دیوارەکانی زیندانن!
تۆزێکی تر، وەردیانی ئەم سەددەیەیش
کە دەرگاکانی کردەوە
تەماشاکەن! چۆن شەپۆلەکانی ئەمدیو
ڕائەکەنو
باوەش ئەکەن بە ملی ئاوی ئەودیودا
بیبینن چۆن ماسی ئەمدیو
دەم ئەبەنو
ماچی ماسیی چاوگریاوی ئەودیوئەکەن!
لێرەیش ئەمڕۆ "مواجەهە"ی شەپۆلە زیندانیەکانو
درەختی دوورو نزیکی کەسو کاری
پەشۆکاوو چاوەڕوانە.
هەر تەواو وەکوو ڕۆژانی "مواجەهە"ی

شەپۆلی یەك لە دوای یەكی

دڵی دایكو كوڕەكانمان.

وەكوو ماچی ئاوی تینووی

ئێمەو ڕۆخی گیانی سەوزی كوڕەكانمان!

1989

# لەوڵاتی مندا

له وڵاتی مندا

ڕۆژنامه به لاڵی لەدایك ئەبیٚ.

له وڵاتی مندا

ڕادیۆ به کەڕیی لەدایك ئەبیٚ.

له وڵاتی مندا

تەلەفزیۆن به کوێری لەدایك ئەبیٚ.

ئەوانەی له وڵاتی منیشدا بیانەویٚ

ئەوانه به ساغی لەدایك بن:

لاڵیان ئەکەنو ئەیانکوژن.

کەڕیان ئەکەنو ئەیانکوژن.

کوێریان ئەکەنو ئەیانکوژن.

له وڵاتی مندا!.

# سەرتاش

ئەو کەژانە دەمێکە قژ ئەهێڵنەوە
ئەم هاوینە هێندە درێژ بووبوونەوە
لەوەختی سەماکردنا، لە عەرد ئەخشان!
ئەوا ئیستەیش، لە پەنجەرەی ئەم ژوورەوە
چاوم لێیە:
پایز بە پێوە وەستاوەو
وەك سەرتاشێکی ڕەقەڵەی پەنجە درێژ
خێرا خێرا بە مقەستی تیژی "کانوون"
پرچی زەردی کەژان ئەبڕێ
ناوبەناویش "با"ی شاگرد دێو
بە خاولیەکەی.. لە پشتەوە
تووکەسەری پشت ملی کەژ ئەتەکێنێو
ئەیانخاتە ئەو چەمەوە!.

1989

# خاڵبەندی ئۆردوگاکان

ـ کە "دێڕەکانت" ڕیز ئەبن، لەچی ئەچن؟
ـ لە تەنافی هەڵخراوی ئۆردوگاکان.
ـ ئەی کە وەختێ "وشەکانت" پڕکەیت لەخەم، لەچی ئەچن؟
ـ لەتەنەکەی ئاوی سەرشانی کچانی ئۆردوگاکان.
ـ ئەی ئەو وەختەی "حەرفەکانت" چاویان تەڕە؟
ـ لەچاوی نانی گریاوی ئۆردوگاکان.
ـ ئەی کە وەختێ "وێرگوڵ" بەینی دوو وشەو
ڕستەیەکت خۆی لوول ئەدا، لەچی ئەچێ؟
ـ لە پشتی کۆماوەی پیری ئۆردوگاکان.
ـ ئەی "نوختەی" دوای ڕستەکانت لەچی ئەچن؟
ـ لەتۆپی پەڕۆی منداڵی ئۆردوگاکان.
ـ ئەی کە نیشانەی "سەرسوڕمان" ئەچەقێنن و
لەجێی خۆدا چاوەکانیان ئەبڵەق ئەبن، لەچی ئەچن؟
ـ لەستوونی بەردەم هەموو دەوارەکان.
ـ ئەی نیشانەی "پرسەکانت" کە دێڕ ئەکەن

بەشەقامی دڵەڕاوکێ، لەچی ئەچن؟

ـ لە سەروملی دایکانی ئۆردوگاکان.

ـ ئەی "کەوانەی" ئەم لاوئەولای مەبەستێکت لەچی ئەچن؟

ـ لەدوو ساجی ساردوسڕی بەرامبەر یەك هەڵپەسێردراو.

ئەی ئەم هەموو دووبارەکردنەوە بێ تامانەی

وشەی "ئۆردوگاکان"ی ئەم شیعرەت لەچی ئەچن؟

ـ هەر لە دووبارەبوونەوەی

تامی تاڵی گشت ژەمێکی ئۆردوگاکان!.

1989

# خواست

شفرەی سەختی دڕەندەیەکی کێوییان دائەتاشی

لێیان پرسیی:

تۆ حەز ئەکەی بتکەین بە چی؟

شفرە وتی: حەز ئەکەم ببم بە دەسکی

کێردو چەقۆ!.

شاخی جوانی ئاسکێکیان دا ئەتاشی

وتیان: ئەی تۆ؟

وتی: من حەز ئەکەم بمکەن

بە کلوێچکی چاوی جوانان!.

لقی دار گوێزێکی پیریان دائەتاشی

وتیان: ئەی تۆ؟

وتی: من حەز ئەکەم بمکەن

بە گۆچانی دەستی پیران.

گا بەردێکی کوردستانیان هەڵئەکۆڵی

لێیان پرسی:

ئەی باشە تۆ؟

تۆ حەز ئەکەی ببی بەچی؟

وتی: من ئەمەوێ بمکەن

بە پەیکەرێ بۆ ئازادیی.

1989

# دەنکە زیخێ

تاڵە قژی کچێکی جوان

لەسەر شانم بەجێ مابوو

لەدواییدا تاڵە قژم

کرد بە پەتی دیلانێ بۆ:

هەڵبەستێکی پێنج شەش سالم.

دەنکە زیخێکی کوردستان

لەکەیەوە؟ چۆن؟ نازانم!

پەڕیبووە لۆچی گیرفانی چاکەتێکم

ئەمڕۆ ڕێکەوت دۆزیمەوە

دەرم هێناو ماچم کردو

کردم بە بەردی کەعبەی گشت

شیعرەکانم!.

1989

# پەردە

**ئەو دارسێوو دار هەنارە**
**لەو گوێ چەمە، ئەمڕۆ ڕووت بوون**
**ڕووتو قووت بوون**
**کە باوەشیان کرد بەیەکدا.**
**کیژۆڵەسێو زوو هەستی کرد**
**لەوبەرەوە، دارەبەنێکی دەس تووکن**
**بە دووربینی ئەو ڕەوەزە**
**لەپەناوە**
**زوو زوو تەماشایان ئەکا.**
**بۆیە هەستاو بە ڕقەوە**
**پەردەی تەمی گوێ چەمەکەی دادایەوە!.**

1989

# ژیشك

شەڕبوو، ئەوەندەی نەمابوو

لەو چیایە

ئەو گورگە بۆرە بگیرێ

بەڵام ژیشك فریای کەوت‌و

هەزاران تیری پشتی خۆی

بەقەرز دایە!

1989

## پەڕینەوە

ـ ئەیانبینن؟

ئەو ڕووەکە خشۆکانەی

کە هەر سنگە خشکێیانەو پەل ئەکوتن؟!

ـ ئەوە قوربانیی ئەوینی سەردەمێکن

لە زینداندا بە دڕکەزی

کوێریان کردن!

ـ "لاولاو" یەکێکە لەوانە.

ئەی نابینن.. لەهیچ شوێنێ، ئەو ناتوانێ

خۆی بەتەنیا، هەڵگەڕێ و بپەڕێتەوە..

گەر پەنجەرەو دارودیوار دەستی نەگرن!

1989

# لەدوا ساتدا

دوورگە وەختی خۆی ئەو عەردە "لاوان"ە بوون
کە عاشقی چاوی شینی زەریا بووبوون
لەپشتەوە هەردوو دەستیان بەسترابۆوەو
ڕێیان نەبوو خۆیان لەو چاوە هەڵکێشن.
تا ئەو ڕۆژەی لە لەشی خۆیان یاخی بوون
تا ئەو کاتەی خۆیان لەدەست خاك ڕاپسکان.
نیمچە دوورگەیش هەروەها بوو
بەڵام کە ئەوان یاخی بوون، کە ڕایان کرد
هەڵنوتانو لەپەو ڕوو کەوتنە زەریاوەو
نەیان توانی هەموو جەستەی خۆ دەربازکەن
لە دوا ساتدا
خاك فریاکەوت قاچی گرتن!.

1989

## مانەوە

چوومە لای زەریاو پێی وتم:
بە قولاپو بە تۆڕ بوایە
لەمێژەوە.. من ئەبوایە
نەك هەر ماسی گیانی شینم
گەرای عومریشم نەمایە!
چوومە لای بێشەو پێی وتم:
بە خەیاڵی تەور بوایە
من ئەبوایە
تاقە چڵێ لەم لەشەمدا
سەوز نەبوایە.
ئەی زەریاو بێشەی هاوڕێ!
هەتا ماسی گیانی شینی تۆ بمێنێ
تا چڵی سەوزی لەشی تۆیش باڵا بکا
ماسی چاوو
دارستانی ئەم گەلەی منیش ئەمێنێ!.

# شار

ئەمڕۆ تەنها هەر لەنێوان دووسەعاتا
لەناو سنگی شارەکەمدا
پەنجا ڕووباریان خنکاندم
قودس وای وت!.
ئەمڕۆ تەنها هەر لەماوەی یەك سەعاتدا
لەناو سەری شارەکەمدا
سەد ئەستێرەیان سەر بڕیم
مانگی شیعرێکی ئاسمانی سانتیاگۆیش وای پێ وتم!
ئەمڕۆ تەنها هەر لەماوەی نیو سەعاتا
لەسەر بەردی ڕەشی پشتم
مێشکی زۆر گوڵیان پژاندم
ئەسپێکی ڕەشی باشووری ئەفریقایش وای پێ وتم!.
براینە!
تەنها جیاوازی نێوانمان
ئەوەیە، من..
شارەکەیان وەها کوشتم،
دەقیقەیش هەستی پێ نەکرد!!

# باڵا

بۆ شەهیدێکو دووانو سیانو چوار
ئەوسا من هەردوو چاوانم
وەکوو "نالی"
ئەکردە دوو جۆگەو ڕووبار
من ئەوساکە
بۆ ماڵێکو بۆ گوندێکو بۆ باخچەیەکی جوانەمەرگ
ئەم تاقە دڵەم ئەکردە
پەڵە هەورێکی پایزە
ئەی ئیستاکە بۆ پێنج هەزار
چۆن بتوانم دوو چاو بکەم بە پێنج هەزار گۆمو زەریا
دوو دەست بکەم بە پێنج هەزار کۆڵەوژی ڕەش هەڵگەڕاو
دڵێ بکەم بە پێنج هەزار پەڵە هەور
قوڕگێ بکەم بە پێنج هەزار گەرووی تاساو
من ئەزانم ئا ئەم ژانە
وشەم ئەباتە گڵەوەو

هەرگیز پەنجە

لاواندنەوەی چەند درێژ بێ

ناگاتە باڵای هەڵەبجە!

# هەڵەبجە

چواردەی مانگ بوو
لەسەر گۆیژە، با قەڵەمەکەی فڕاندم
کە دۆزیمەوەو پێم نووسی
پۆل پۆل فڕین وشەکانم.
پانزەی مانگ بوو
"سیروان" قەڵەمەکەی بردم
وەختێ گرتمەوەو پێم نووسی
بوون بەماسی شیعرەکانم
شانزەی مانگ بوو!
ئاخ شانزەی مانگ!
کە شارەزوور قەڵەمەکەی لێ وەرگرتم
وەختێ دایمەوە بنووسم
وەك هەڵەبجە
وشك بووبوون پەنجەکانم!

# پەڕەشووت

منیش خەیاڵم فڕگەیە.

منیش شیعرم فڕۆکەیە.

منیش وشەی پەڕەشووتداری خۆم هەیە:

"ڕەنگە پەڕەشووتەکانیان،

هەندێ جار فرمێسکی خۆم بن.

ڕەنگە پەڕەشووتەکانیان، زۆر جاری تر

گوڵۆنکەکانی کۆڵوانەی دایکی تۆ بن.

ڕەنگە پێڵوی منداڵانی "هەڵەبجە"بن.

ڕەنگە مەمکی کچەکانی "وەسانان"بن.

ڕەنگە کڵاوو جامانەی شەهیدان بن".

هەموو جارێ ئەیانبەمە

ژوور وڵاتی هەوروباران

خۆیان هەڵئەدەنە خوارێو پەڕەشووتیان ئەکەنەوە

حەرف، حەرف ئەنیشنەوە.

هەموو جارێ وشەی پەڕەشووتداری من

عەردێکی نوێ

# چیرۆکی جزدانێ!

جزدانێکی ڕەشتاڵە وای گێڕایەوە:

هەبووم.. نەبووم

من وەختی خۆی

پێستی تەوێڵی شێرێ بووم.

ڕۆژێ فیشەکێ سمیمیو شێرم کوژرا!.

دوو دەست، چوار دەست

دە دەست هاتن

گورووویانم

خۆشیان کردم

ڕەنگیان کردم.

سەفتە.. سەفتە

لەگەڵ هەزار پێستەی تردا

وچان.. وچان

هەڵتەك.. هەڵتەك

سواری پاپۆڕو

واگۆن‌و

لۆریی بارهەڵگریان کردم.

هەتا لەناو گرمەگرمی کارگەیەکدا دایان گرتم

دواتر کردیانم بە جزدان.

دوور بردیانم

هەر دوای لەدایك بوون یەکسەر

فرۆشتیانم.

من بەر وڵاتی کورد کەوتم

لە شارێکدا

کە شاخ سەرو درەخت لەش‌و

چەم قاچی بوو

ڕەفەی دوکانێکی بچووك بوو بە ماڵم.

ڕۆژێ پیاوێکی گردەڵەی دەم‌و چاو کونج

بانگیان ئەکرد: "فایەق بێکەس"!.

لای دایە لام

منی کڕی‌و هەڵیگرتم

هەتا نزیکەی دەساڵێ من لە باخەڵیا ژیام‌و

من لەباخەڵیا ئەنووستم.

من جزدانێکی لاواز بووم

بێ غەبغەبە

بەتاڵ

بەتاڵ

هەر چوار ژوورەکەی گیرفانم.
ڕۆژێ نەمدی قەڵەوبمو ورگم هەبێ
ڕۆژێ نەمدی وەك جزدانەکەی دراوسێ
بەدەم مۆڵە دینارەوە پێبکەنم!
بەڵام دووجار
لەسەر پێستی ئەم تەمەنە
شێر پەنجەمۆری بۆ کردم
یەکەم شێرم یادی نەڕەو
زامی بێشەو
دووەمیشیان دوای خۆی تەنها
تەنها.. تەنها
شەش پەنجاییو
دوا هەڵبەستی بۆ ئازادیی
تیا جێهێشتم!.

1989

# بەراورد

سەعاتی دوانزەی نیوە شەو

تەواوو ڕێك

وەك كوردوخەم

دوومیلی جووت.

سەعاتی دوانزەی نیوەشەو

وەك خەیاڵم

سەرمێزێكی پاكو ڕووناك.

بیست جگەرەو

تەنها یەك كلیلی وشە.

دوای سەعات یەك

دوو میلی لەیەك دابڕڕاو

وەكو من و چاوی وڵات

دوای سەعات دوو

وەكوو ئاوارەو دەربەدەر

كاغەز، قەڵەم، شتومەكی

سەر مێزێکی پەرش‌و بڵاو.
دوای سەعات سێ
تەپڵەکێ فلتەرو سووتووی قەڵاچن‌و
ژوورێ دووکەڵ.
لەولایشەوە
شاعیرێکی خەو لێ کەوتوو
بەڵام شیعرێکی بە خەبەر!.

1989

# بۆن

لەناو باخی کریستاڵی کۆگای بۆندا

هەنگە زەردەی عاشق بووم و

سەد خولم خوارد.

نمە نمەی زەردو سووری

زۆر بارانی

هەوری عەترم

پرژانە سەر قۆڵی چاکەت.

قژی دەیان شووشەی کورت و کەڵەگەتم

گەیاندە لووت.

بەڵام هیچیان

بۆنی لەشی هاوینانتیان

لێوە نەهات!.

بەڵام هەر نەمدۆزیتەوە

ئەی خۆشترین بۆنی دنیا!

ئەی بۆنی گڵە سوورەکەی

دوای ئاوڕشێنی بەرماڵی

هاوینانی

ئەوسای گەڕەکی "حاجی حان"!.

1989

# ناوەڕۆك


| | |
|---|---|
| پێشەكی | 5 |
| ڕەنگاڵە | 19 |
| دەفتەری گەشت و خۆشەویستیی | 21 |
| گۆرانییەكی ڕەنگاو ڕەنگ | 23 |
| كاڵێ | 28 |
| شەقام | 30 |
| بروسكەیەك | 32 |
| لە یەكەم سەفەردا | 33 |
| پایزە نامەیەك | 44 |
| دوو دەنگ | 48 |
| پڵنگ و پەیكەر | 53 |
| ڕەشەبا | 59 |
| شاخ | 62 |
| گەشتێك | 69 |
| كفن دز – ئەكتەر | 73 |
| بەهارە شیعرێك | 77 |
| لەسۆفیادا | 82 |
| لە بۆدابست دا | 87 |
| دەفتەری گۆرانییە غەمگینەكان | 93 |
| كۆست و چرا | 95 |
| پۆلە ئاوازێكی كۆچ كردوو | 100 |
| فورات و چەند گۆرانییەكی غەمگین | 105 |
| هاودەم | 113 |
| چەپگەرد | 119 |
| دەفتەری سۆز و سووتانی گیان | 127 |
| دۆزەخ | 129 |
| قەقنەس | 132 |
| كلێپە | 138 |

گێژەنگ – سووتان ........ 141
سۆز ........ 144
داستانی هەڵۆی سوور ........ 151
داستانی هەڵۆی سوور ........ 153
کەشکۆڵی پێشمەرگە ........ 211
کلیل ........ 213
لەشەوێکدا ........ 218
ماڵئاوایی ........ 223
گۆرانییەکی داواکراو ........ 226
کام ڕێبوار ........ 230
لەبەر تەندورێکدا ........ 234
پەرەسێلکەیەک ........ 237
هەرەس ........ 239
سێوەکەی دڵ ........ 242
شیعری کاریکاتێر ........ 244
هێلانە ........ 246
گریان ........ 249
نیشانە ........ 250
دەرمان ........ 251
گەردەلوول ........ 252
لێبووک ........ 254
بووکە سەماکەرە ........ 255
پیاو ........ 256
شەماڵ ........ 280
میوان ........ 286
ڕووبار ........ 294
چەند چوارینەیەک ........ 296
شەهید ........ 298
چەند کورتە شیعرێ ........ 299
دووڕیان ........ 303
بانگ ........ 307
کوڕی بابە گوڕگوڕ ........ 316
مزگێنیی ........ 319
ڕوانین ........ 327
هەڵگوردی "پ. م" ........ 330
کەڵ ........ 336
گوڵ باران ........ 341

نەفرەت ........ 346

ئارام ........ 353

تاجی خوێناوی ........ 365

بەیان ........ 370

شایی شەهید ........ 399

قیبلەنما ........ 401

شایی شەهید ........ 407

تەقینەوە ........ 418

سەفەری ئەوین و شۆڕش ........ 434

سۆراخ ........ 441

ئاگر ........ 444

دەرگا داخراوەکان ........ 447

ڕاهاتن ........ 452

سڵاو گوڵە کێویلەکانی شۆڕش سڵاو! ........ 456

ئەسپێکی سوور ........ 466

تاڤگەی زیندانیی ........ 482

توانەوە ........ 488

سوتماك ........ 492

دیدەنی ........ 499

تەم توومان ........ 503

تەم توومان ........ 505

ژەهر ........ 530

ئاوێنە بچکۆلەکان ........ 547

خۆرنشین ........ 549

پاش وەخت ........ 550

ناسین ........ 551

خەنجەر ........ 552

مقەست ........ 553

دوا ووشە ........ 554

پەند ........ 556

27 جار ........ 557

مشار ........ 559

سەر ........ 560

تاریکی ........ 561

وێنەیەك ........ 562

هاوڕێ ........ 563

هەڵوێست ........ 565

شایەت ........ 567
مانگ و زەریا ........ 569
بەشکردن ........ 572
ئازادی ........ 573
خاك ........ 574
چریکە ........ 575
ئازار ........ 576
ناپاك ........ 577
قوربانیی ........ 578
ئاوێنە ........ 579
بڕیار ........ 580
ئەنجام ........ 581
ژیانم ........ 582
عاشق ........ 583
چەك ........ 585
پەستیی ........ 586
خۆشەویستی ........ 587
سەنگەر ........ 588
گفتوگۆ ........ 589
هێلانە ........ 591
ڕێگا ........ 592
شۆڕش ........ 593
شەونخوونی ........ 594
کوێر ........ 595
پێڵو ........ 596
میرات ........ 597
هیوا ........ 598
بەرزبوونەوە ........ 599
زەبر ........ 600
یاخی بوون ........ 601
بێشکە ........ 602
ساڵی تازە ........ 603
بەفر ........ 606
چاو ........ 607
قۆخ ........ 609
گۆرەوی ........ 610
پرسیارو وەرام ........ 612

مەودا ........................ 614
مردن ........................ 615
خۆزگە ........................ 616
ناونیشان ........................ 617
زێوە ........................ 618
جوانوو ........................ 620
ئابڵوقەدان ........................ 622
چادر ........................ 623
دەسەڵات ........................ 625
قۆپچە ........................ 626
خواست ........................ 627
پرسە ........................ 629
شەڕ ........................ 630
پاییز ........................ 631
نەهێنیی ........................ 632
لە ئەنگۆرەیەکدا ........................ 633
جریوە ........................ 634
لە تووڕەبوونێکدا ........................ 635
شەکردان ........................ 636
جوانترین گوڵ ........................ 638
سوار ........................ 640
جەژنێك ........................ 641
پێکەوە ........................ 642
تاقە شایەت ........................ 643
ئینجانە ........................ 644
کتێب ........................ 645
دەرسێك ........................ 647
مووتوربە ........................ 650
کۆتەڵ ........................ 651
کسپە ........................ 653
کۆتەرە ........................ 656
چلچرا ........................ 657
سارێژکردنەوە ........................ 658
دەنکە تۆو ........................ 660
ئاماژە ........................ 662
ورتەورتێ ........................ 664
ژماردن ........................ 666

پیانۆ ........ 667
کڕنوش ........ 668
میوانداریی ........ 669
چاوپێکەوتنێکی ئەدەبی ........ 671
نەنکم ........ 673
پاڵتۆ ........ 674
خەڵات ........ 675
گەڕانەوە ........ 676
کلێتە ........ 677
تەنها یەکێکمان ........ 678
ئەم شاخە ........ 680
لە بیرەوەرییەکانی "دارمێوێك"ەوە ........ 682
بوخچە ........ 685
خائین ........ 687
خەم ........ 688
یەکەم دەنگ و دوادەنگ ........ 689
دەریاچە ........ 692
لەپاسێکدا ........ 695
گەلی بازێ ........ 697
پرشنگەکان ........ 701
تونێل ........ 703
گۆڕران ........ 704
شوێنەون ........ 705
فڕین ........ 708
سۆما ........ 709
دوو پیاو ........ 711
جوانترین دیاری ........ 713
سیحرباز ........ 714
بیرچوون ........ 716
شۆڕبوونەوە ........ 718
یاد ........ 719
لێرە ........ 720
خۆشەویستیت ........ 721
بیرەوەری ........ 722
یەکەم منداڵ ........ 723
تەختە بەند ........ 724
زیندانی گەڕۆك ........ 726

تۆ ........ 727
سەروپێچ ........ 728
کۆست ........ 730
دووپەیکەر ........ 732
ژیان ........ 734
جودایی ........ 736
یادداشت ........ 737
تەماشاکردن ........ 738
بەخیل ........ 739
وەسێت ........ 740
ناو ........ 742
وەکوو یەك ........ 745
لەولاتی مندا ........ 747
سەرتاش ........ 748
خالبەندی ئۆردوگاکان ........ 749
خواست ........ 751
دەنکە زیخێ ........ 753
پەردە ........ 754
ژیشك ........ 755
پەڕینەوە ........ 756
لەدوا ساتدا ........ 757
مانەوە ........ 758
شار ........ 759
بالا ........ 760
هەلەبجە ........ 762
پەڕەشووت ........ 763
چیرۆکی جزدانێ! ........ 765
بەراورد ........ 768
بۆن ........ 770